# بنیاتی گێڕانەوە

چەند لێکۆڵینەوەیەکی ئەدەبییە لەبارەی
چیرۆک و رۆمان و رۆمانە شیعر

عەبدوڵڵا ڕەحمان





# بنیاتی گێڕانەوە

## چەند لێکۆڵینەوەیەکی ئەدەبییە لە بارەی

## چیرۆک و رۆمان و رۆمانە شیعر

# بنیاتی گێڕانەوە

## چەند لێکۆڵینەوەیەکی ئەدەبییە لە بارەی چیرۆك و رۆمان و رۆمانە شیعر

عەبدوڵڵا ڕەحمان



**خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە**

- **بنیاتی گێڕانەوە (چەند لێکۆڵینەوەیەکی ئەدەبییە لە بارەی چیرۆك و رۆمان و رۆمانە شیعر**
- **نووسینی: عەبدوڵڵا رەحمان**
- **نەخشەسازی ناوەوە:** گۆران جەمال رواندزی
- **بەرگ:** رێمان
- **نرخ:** ٤٠٠٠ دینار
- **چاپی یەکەم** ٢٠١٤
- **تیراژ:** ٥٠٠ دانە
- **چاپخانە:** موکریانی (هەولێر)
- **لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی(٩٩٠)ی ساڵی (٢٠١١) پێدراوە.**

**زنجیرەی کتێب (٨٥٧)**

**ماڵپەڕ:** www.mukiryani.com

**ئیمەیل:** info@mukiryani.com

## ناوەڕۆك

# سەرەتایەك لەبارەی
# چەمك و مێژووی ڕۆمان

ڕۆمان دیاردەیەکی زیندووی جیهانی ئەمڕۆیە و یەکێکە لەو ژانرانەی، کە توانیویەتی بەشدارییەکی کارا لە گەشەکردن و پێشخستنی ئەدەبدا بکات. هەروەها یەکێکە لەو هونەرە باڵایانەی تا ڕۆژگاری ئەمڕۆش نەك هەڕمێنی خۆی لەدەست نەداوە، بگرە بووەتە یەکێك لە سیما هەرە دیارەکانی میللەتان، چونکە پانتایی دەقی ڕۆمان لە دەربڕینی کێشە کۆمەڵایەتیی و سیاسی و ئابووری و دەروونییەکان بە جۆرێکە هیچ ژانرێکی دیکەی ئەدەبی وەکو شیعر و چیرۆك ناتوانن بەم شێوەیە ئەو کێشە و گرفتانە دەربڕن، کە بە درێژایی مێژوو کۆمەڵگە بەدەستیانەوە گرفتارە. ئەمەش بۆ ڕۆڵی ڕۆمان دەگەڕێتەوە، کە ڕاستەوخۆ بەشداری لە خستنەڕووی ئەو کێشانە دەکات، وەکو دەقێکیش سەرەتاکانی هۆشیاری و ئاگایی و کرانەوە بە ڕووی پێشکەوتن و پەرەسەندن واڵا دەکات (ئەمەش تەفزیلکردنی ڕۆمان نییە بەسەر ژانرەکانی دیکەی ئەدەبیدا، بەپێچەوانەوە، بگرە کارایی ئەو ژانرە بۆ خودی ڕۆمان و چۆنییەتی ئەو یاریکردنەی کارەکتەرەکانی ڕۆمان دەگەڕێتەوە، کە دەتوانێ پڕ بە پێستی دیاردە و کارەساتەکان دەربڕینیان لێ بکات و بەو ئاقارانەیشی دا ببات هەموو تاکێك دەتوانێ پانتایی شوێن پێی خۆی لەو هەنگاوانە دیار بکات کە دەتوانێ بەردێك بخاتە سەر تەلارێك، کە ڕۆمان وەکو ئەرك دەیخاتە ڕوو)[1]. لەبەر ئەمەشە لەبارەی ڕۆمان وتراوە (ڕۆمان تووڕەکەیەکی فووداره هەموو شتێك لەخۆ دەگرێت)[2]، چونکە ڕۆمان هەموو دیاردە و ڕووداوە جۆراجۆرەکان لەباوەشی خۆیدا کۆدەکاتەوە و لێیان دەدوێت.

١- شوکر سلێمان حەمەد، پاڵەوان لە ڕۆمانی ئێستەی کوردیدا، گۆڤاری کاروان، ژمارە (١٧٢) نیسانی ٢٠٠٣. ل ٢٢

٢- عەلی لفتە سەعید، بنەماکانی پێکهاتەی ڕۆمان لە نێوان تازەگەری و لاساییکردنەوەدا، و: محەمەد کەساس، گۆڤاری ڕامان، خولی دووەم، ساڵی دووەم، ژمارە (٩٩) ئابی ٢٠٠٥. ل ١٢٤

ڕۆمان کاتێك کە سەریهەڵدا، سەرەتایەکی نوێی گێڕانەوە و ڕزگاربوون بوو، لەو نەریتە کۆنباوەی گێڕانەوە، کە خۆیان لە قالبی داستان و حیکاتەکان دەدۆزییەوە، کە دەربڕی کێشە و ڕووداو و حەز و خولیای ئەوسای مرۆڤ نەبوون و سوواو بوون، بۆیە ڕۆمان لەگەڵ سەرهەڵدانیدا بروسکە ئاسا بڵاوبووە و خوێنەران پێشوازییان لێکرد، چونکە ڕۆمان وەکو دەقێکی کراوە هەمیشە ئامادەی فرەوانبوون و نوێبوونەوەی هەیە، لەو کاتەوە تا ئێستە ڕۆمان لە پێشکەوتن دایە و لەگەڵ هاتنەکایەی سەردەمی ئێستەی تەکنۆلۆژیاش بایەخی ڕۆژ لە دوای ڕۆژ پتر دەبێت و جیا لە هەموو ژانرەکانی دیکە، ڕەهەندەکانی ئەو پێشکەوتنەی وەرگرتووە.

ڕۆمان ئێستە هۆیەکانی گەیاندن و هونەری سینەما و شانۆ و مۆنتاژ و...هتد. هەمووی کردووەتە کەرەستەیەك لە کەرەستەکانی پێکهاتەی خۆی، ئەم سەردەمەش میللەتان لە ڕێگەی ڕۆمانەکانیان دەناسرێنەوە، واتە ڕۆمان بووەتە ناسنامە و دەربڕی باری ژیاری و شارستانی میللەتان. ئەگەر بە وردیش سەیری خەڵاتی نۆبڵ لە بواری ئەدەب بکەین، کە ساڵانە دەدرێتە نووسەر و شاعیران لە بەرانبەر کۆی بەرهەمە ئەدەبییەکانییەوە، ئەوا بەپێی ئەو لیستەی، کە لەبەردەستدایە لە نێوان ساڵی (١٩٠١-١٩٩٣)[1] لە کۆی دابەشکردنی (٨٧) خەڵات، (٤٢) خەڵات بە ڕۆماننووسان دراوە لە بەرانبەر (٢٤) خەڵات، کە بە شاعیران دراوە، ئەمەش نیشانەی بایەخ و گرینگی ڕۆمان لەو سەردەمەی ئێستەماندا نیشان دەدات.

---

١- باکنر ب. تراوپك، مێژووی ئەدەبیاتی جیهانی، و: حەمە کەریم عارف، چاپخانەی ڕۆژهەڵات — هەولێر، چاپی یەکەم، ٢٠٠٨، ل ٣٩١-٣٩٥ .

## پێناسەی ڕۆمان:

لە ڕاستیدا پێناسەکردنی ڕۆمان کارێکی یەکجار سەخت و دژوارە، چونکە جیاکردنەوەی سنووری ڕۆمان لەگەڵ ژانرەکانی دیکەی ئەدەب و هونەر بەشێوەیەك دژوارە، کە جیاکردنەوەی ڕۆمان و پێناسەکردنی بە چەند دێڕێك، کارێکی تا ڕادەیەك ئەستەم دەبێت، چونکە ڕۆمان وەکو دەقێکی کراوە و زیندوو هەناوی خۆی لەناو دنیاگەلێك ڕایەڵی مەعریفی و هزری و ئێستێتیکی دەدۆزێتەوە، هەردەم هونەر و ژانرەکانی دیکە لە دیدگەی ڕۆمانەوە زیاتر و ئازادانەتر خۆیان بە خوێنەر دەناسێنن و لەگەڵێدا هەڵدەکەن، بۆیە (سنوورێك نییە ڕۆمان دیاری بکات، یەکێکی وەك هـ. ج. ویلز ناوی نابوو "توورەکەیە و دەتوانی هەموو ئەو شتانەی تێ بئاخنیت، کە لات پەسندە") [1].

بۆیە بەستنەوەی ناوەرۆکی ڕۆمان بە هەموو و ئاستەکانی گێڕانەوە و تەکنیکەکانی کات، شوێن، ڕووداو، دایەلۆگ و مەنەلۆج و... هتد، بە تاکە پێناسەیەك، نەك هەر گونجاو نییە، بگرە جۆرە زوڵمێکە لە ڕۆمان دەکرێت، چونکە هەر یەکێك لەو ئاستە و تەکنیکانە، پێناسە و دیارکردن و سنووری خۆی لەناو پانتایی ڕۆماندا هەیە. لەبەرئەمەش (زۆرینەی ڕەخنەگر و تیۆریستەکانی ئەدەب، ئاماژەیان بەو ڕاستییە داوە، کە ڕۆمان لە ڕووی تیۆرییەوە، ژانرێکە بەئاسانی خۆی بەدەست چێوەی پێناسەیەکی دیارکراو نادات، هەڵبەتە ئەم خۆ بەدەستەوە نەدانە لە ڕووی پراکتیکەوە لە هەموو جۆری شێواز و فرەدەنگی بونیادی هونەری و بابەتیانەی دەقەکانەوە سەرچاوەی گرتووە) [2].

ئەو پێناسە هەڵنەگرییەی ڕۆمان پێوەندییەکی بەتینی بە مێژووی ڕۆمان خۆیەوە هەیە، کاتێك ڕۆمان لە سەدەی هەژدەدا بە شێوەیەکی هونەری جێگەی خۆی گرت، بە ویستێکی بەهێزەوە بەرەنگاری پێناسە کۆنباوەکانی شیعر و پەخشان و داستان بوویەوە و دژی ئەو پێناسە فەرمی و جێگیر و دەقگرتووانە بوونی خۆی ڕاگەیاند، بۆیە ڕەخنەگرانیش لەو کاتەدا جەختیان لەسەر نوێبوونی ڕۆمان دەکردەوە، مالکام برادبری دەڵێت:" ئەم شێوازە نوێیە بەربەرەکانی لەگەڵ دابونەریتە باوەکانی

---

١- ئەدوارد بلشن، دایانا داوبتهایر، ڕۆمان و پیشەی نووسینی ڕۆمان، و. بۆ عەرەبی، سامی محەمەد، و. بۆ کوردی: ئەژی گۆران، چاپخانەی المشرق ـ بغداد ١٩٨٢ . ل٩.

٢- چاوپێکەوتن لەگەڵ د. فوئاد ڕەشید، گۆڤاری ڕامان، ژ(١٢٥) خولی سێیەم، ساڵی دوازدە، تشرینی یەکەمی ٢٠٠٧. ل٣٢.

ئەدەبدا هەیە یان بەلایەنی کەمەوە دەیەوێت بەشێوەیەکی بونیادی ڕاستیان بکاتەوە، لەوانەشە هەر لەبەرئەوە بێت کە بڵێین زاراوەی ڕۆمان (Novel) بە واتای نویێ و تازە، زاراوەیەکی گونجاوە) [1].

لەبەرئەوەی زمانی ڕۆمان پەخشانە، ئەویش ئەو زمانەیە، کە ئێمە لە ژیانی ڕۆژانەی خۆماندا لە قسەکردن و گفتوگۆکردنەوە بەکاریدەهێنین، بۆیە سەختە ڕۆمان بەخێرایی لە پەڕتووکە پەخشان ئامێزەکان جودا بکرێتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا دەتوانین بڵێین ڕۆمان خۆی لەخۆیدا ژیانە، ژیان بەو واتایەی نا دەربڕی کەتوار یان فۆتۆکۆپیکردن بێت، بگرە بەو واتایەی کە ژیان چیێ دەکات و وردەکارییەکانی بۆ ئێمە ڕوون دەکاتەوە، کە ئەمەش هەمووی بەزمان ئەنجام دەدرێت. لەبەر ئەم هۆکارەش ( ئەو پێناسەیەی کە ئـ. م. فۆستێر لە پەڕتووکی " لایەنەکانی ڕۆمان" کە لە ساڵی ١٩٢٧ نووسراوە و لەیەکێ لە ڕەخنەگراانی فەرەنسی وەریگرتووە و بەناوبانگی کردووە و خستوویەتییە سەر زاران، ئەوەندە بزر و نادیارە کە ڕاستییەکەی نامومکینە، بەپێی پێناسەکەی ئەو "ڕۆمان چیرۆکێکی پەخشان ئامێزە بەدرێژیی و قەبارەیەکی دیاریکراوەوە")[2].

لەبەرئەوەش دەڵێین ڕاستییەکەی نادیار و بزرە، چونکە گەلێك نووسین هەن لەگەڵ ئەم پێناسەی فۆستێر یەکدەگرنەوە، کەچی بە ڕۆمانیش دانانرێن.

جا لەبەرئەوەی ڕۆمان لە گۆڕاندایە و پابەندی هیچ یاسایەکی جێگیر نییە، لە چوارچێوەی تاکە یەك قاڵبیش نەماوەتەوە، چونکە (ڕۆمان وەکو ژانرێکی ئەدەبی سیستەمێکی دروستکراو، هەمیشە کراوەیە بۆ شیکردنەوە، دەشێ بە دەریای بچوێنین، هەرچەندە قووڵتر ڕۆ بچینە خوارەوە، ئەوەندە زیاتر مرواریمان چنگ دەکەوێت و عاجبەتییەکانی دەبینین) [3].

بۆیە ئەگەر گەشتێك بەنێو پێناسەکانی ڕۆماندا بکەین، دەبینین هەر یەکە و لە گۆشەنیگایەکەوە مەبەستێك لەمەبەستەکانی، یاخود ئامانجێك لە ئامانجەکانی، یان ڕایەڵێك لە ڕایەڵەکانی ڕۆمانیان خستۆتە بەر نووکی نەشتەرەوە و شیتەڵیان کردووە و لایەن و پێکهاتەکانی ئەو هونەرە نوێباوەی سەردەمیان ڕوونکردووتەوە، واتە ڕووناکییان خستووەتە سەر بەشێك لە بەشە پێکهێنەرەکانی.

---

١- م.هـ. ئیبزام و ئەوانی تر،ڕۆمان چییە، و: جەواد مستەفا، دەزگەی تۆژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی، هەولێر ٢٠٠٨، ل٨٩.

٢- هەمان سەرچاوەی، ل٩٨.

٣- عەبدوڵا سەڕاج، بەرەو ئاستانەی ڕۆمان و گۆشەنیگاکان، لە بڵاوکراوەکانی دەزگەی چاپ و بەخشی سەردەم،٢٠٠٧، ل٩

نەعوم چۆمسكی دەڵێت"بە هۆی خوێندنـەوەی ڕۆمانـەوە فێـردەبین و ئەوەنـدە زانیاریمـان دەسـت دەكەوێ لەبارەی كەسایەتییەوە، چۆن بیردەكەنەوە و.. هەستیان دەبزوێ و هەڵسـوكەوت دەكـەن، لـەوە زۆرتر كە دەروونزانی سروشتی فێرمان دەكات) [1].

هەروەها فەرهەنگی ئۆكسـفۆرد بەمشـێوەیە ڕۆمـان پێناسـە دەكـات (گێڕانەوەیـەكی پەخشـانی خەیاڵئامێزە، یان چیرۆكێكە، درێژییـەكی دیـاریكراوی هەیـە، لەوێـدا كەسـایەتییەكان و كردەوەكـان بەرجەستە دەكرێن، كەوا دەربڕی ژیانی ڕاستەقینەی پێشینە، یان ئێستەیە لە تانوپۆیەكی نیمچە چـڕدا دادەڕێژێ) [2]. لەم پێناسەیەدا ئاماژە بۆ ڕەگەزە پێكهێنەرەكانی ڕۆمان، كەسایەتیی و كـردار و ڕووداو و شوێن كراوە.

هەروەها جۆن هۆڵبرن باس لە ڕۆڵی خەیاڵ لە بواری ڕۆماننووسیدا دەكات و دەڵێت: (دەبـێ ڕۆمـان لە جیهانەكەمان ڕزگارمان بكات و بەرەو جیهانێك ڕێگەی كۆچكردنمان بۆ خۆش بكات)[3].

لاینل ترلنگ لەو باوەڕدایە ڕۆمان (جیاوازی نێوان دیاردە و ڕاستی چارەسەر دەكات) [4].

ئارنۆڵد كیبتل وا پێناسەی دەكات (ڕۆمان چەند چـیرۆكێكی پەخشـانداری ڕیالیزمییـە و خـاوەن درێژییەكی دیاریكراوە، لە ڕووداوێك گەورەترە، هەروەها لە چیرۆكێكیش گـەورەترە) [5]، دیـارە لێـرەدا زیاتر پێداگیری لەبارەی سروشتی ڕۆمان كراوەتەوە.

جۆزیف كۆنراد دەڵێت: (ڕۆمان دەبێ پەیتا پەیتا تێبكۆشێت بۆ ئەوەی بگاتـە ئاسـتی پەیكـەر و ڕەنگ و سیحری مۆسیقا) [6]. لێرەشدا جۆرە پێوەندییەك لە ناوان ڕۆمان و جۆرەكـانی دیكـەی هونـەر باسكراوە.

لـەبارەی ئـەركی ڕۆمانـەوە (بیلینسـكی) دەڵێت:(شـێوە و بـارودۆخی ڕۆمـان گونجـاوترە بـۆ پێشكەشكردنی شاعیرانەی مرۆڤ) [1].

---

١- هەمان سەرچاوە، ل١٠

٢- هەمان سەرچاوە، ل١٠

٣- د. عادل گەرمیانی، چەند جیاوازییەكی نێوان ڕۆمان و چەشنەكانی دیكەی ئەدەب، گۆڤاری نەوشەفەق، ژ(٦٢) تشرینی دووەمی٢٠٠٨، ل١٢

٤- هەمان سەرچاوە، ل١٢

٥- هەمان سەرچاوە، ل١٢

٦- عەبدوڵا سەڕاج، بەرەو ئاستانەی ڕۆمان و گۆشەنیگاكان، ل٥٢

د. مكارم ئەلعمەری لەو باوەڕەدایە (ڕۆمان بەرهەمێکە ژیانی کەسێك، یان چەند کەسێك، بە شێوەیەکی بەرفرەوان و لە چەند ڕوویەکەوە دەگێڕێتەوە، پەرەسەندنی ژیانی ئەو کەسە یان کەسەکان لە بواری کارلێکردن و کارتێکردن لەگەڵ بازنەی ئالۆزی ژیاندا ڕوون دەکاتەوە) [2].

هاوتوورن لە پێشەکی چیرۆکەکەی (خانوویەك بە حەوت جەمەلۆن) لە ساڵی (١٨٥١ )دا دەڵێت: "چاوەڕوانی ئێمە لەو قاڵبە بەناوی ڕۆمان ئەوەیە، کە وردەکاری بەسەرهاتەکان شیبکاتەوە، واتە تەنیا خۆی بە ڕووداوی مومکینەوە گرێ نەدات، بگرە ئاسایی هەوڵ بدات زنجیرەیەك لەو ئەزموونانە وێنا بکات کە لەوانەیە ڕووبدەن یان بەئاسانی بەسەر تاکەکان دێن) [3]. لێرەدا تۆوخمی بەرجەستەبوونی ڕیالیزم بەشێکی گرینگی پێناسەکە پێکدەهێنێت.

بەم شێوەیە لە هەموو ئەو پێناسانەی، کە خستمانە ڕوو پەنجە بۆ گەلێك لایەنی ڕۆمان وەکو ژانرێکی خاوەن پانتایی فرەوان بردراوە و لە گەلێك ڕوانگە و ڕەهەندەوە لێی کۆڵراوەتەوە، دیارە ئەمەش یەکێکە لە خەسڵەتە هەرە زیندەگی و سەرەکییەکانی نەمری ڕۆمان لەناو چەقی ژیاندا، ئەو ژیانەی تا بەرەو پێش بچێت پێویستی گیانی بە ڕۆمان و ڕۆماننووس دەبێت، چونکە وەکو نوێنەرێکی ڕاستگۆی ژیان خۆی پیشان دەدات و تا ژیان بەردەوام بێت ڕۆمانیش بەردەوام دەبێت، لەبەرئەوەشە ه. لۆرانس پایە و شکۆی ڕۆماننووس هاوتەریبی پیرۆزی پاپا و قەدیسەکان دادەنێ [4]. بۆیە ڕۆمان ژانرێکی دژەکاری و گۆڕانکاریی بێ سنوور و سەردەمە و هەڵگری چەندین پێناسەی جۆراجۆرە، (عەبدوڵا سەڕاج)ی ڕۆماننووس دەڵێت: (بەگوێرەی ڕۆمانە باشەکان، دەتوانین پێناسەی ڕۆمان بکەین) [5].

---

١- د. عادل گەرمیانی، چەند جیاوازییەکی نێوان ڕۆمان و چەشنەکانی دیکەی ئەدەب،، ل١٢

٢- هەمان سەرچاوە، ل١٣

٣- هەمان سەرچاوە، ل١٣

٤- عەبدوڵا سەڕاج، بەرەو ئاستانەی ڕۆمان و گۆشەنیگاکان، ل٥٢

٥- هەمان سەرچاوە، ل٥٣

## کورتەیەك
## لە مێژووی سەرهەڵدانی ڕۆمان :

شتێکی سەیر نییە ئەگەر نـاوی حیکایـەت و داسـتان بەسـەر ڕۆمانـدا ببیـنین، چـونکە حیکایەت و داستان بنچینە و بناخەی هونەری ڕۆمانیان داڕژتووەتـەوە، بـە واتایـەکی دیکـە ڕەگی ڕۆمان لە حیکاتە سەرەتاییەکان و حیکاتە میللییەکان و داستانە کۆنەکاندا بە ئاشکرا دیارە، بۆیە زۆرێك لە مێژوونووسانی ئەدەب لەو بڕوایەدان، کە حیکایەتخوان و داسـتانبێژ لـە دوای مردنیان، میراتێکیان لە دوا بەجێما ئەویش ڕۆمان بوو.

هونـەری حیکـاتخوانی ماوەیـەکی زۆر لـە شـوێنی کـار لـە گونـد و دەربـاری کۆشـك و شارستانییەتەوە باڵی بەسەر جیهـانی دەروون و خـەیاڵی مرۆڤـدا گرتبـوو، بۆیـە هـەر چـەند بەقووڵایی مێژوودا ڕۆبچین ئەوا ڕەگەکانی ڕۆمان دەدۆزینەوە. لەم ڕوانگەیـەوە دەکرێـت بڵـێین حیکایەت برێتییە لە کۆمەڵە ڕووداوێك کە پێوەندییەکی توندوتۆڵیان پێکەوە هەیـە و لەسـەر بنەمای ئەقڵی لـۆژیکی بەرێوەدەچـن و سـەرەتا و ناوەڕاسـت و کۆتـایی هەیـە. حیکایـەت بەرهەمی سەردەمی کۆنی مرۆڤە و چەندین خەسڵەتی تایبـەت بـەخۆی هەیـە، کـە لەگـەڵ ژانرەکانی دیکەدا جیای دەکاتەوە، ئەوەی ڕۆمان وەکو ژانرێکی ئـەدەبی لـە حیکایـەت جـودا دەکاتەوە ئەوەیە، کە ئەوەی حیکاتخوان دەیگێڕێتەوە لە ئەزموون، جـا ئـەزموونی خـۆی یـان ئەزموونی ئاڵوگۆڕکراوی خـەڵکانی دیکـە وەرگـیراوە، ئـەو ئەزموونانـە دەکاتـە بەشـێك لـە ئەزموونی ئەو کەسانەی کە گوێی بۆ دەگرن[1]. هەروەها کەسایەتییەکانی نێو حیکاتەکەی لـە خوداوەند و ئاژەڵی خەیاڵی هەڵدەبژێرێ. لە سەردەمانی کۆندا ڕەنگە گێڕانەوەی ئەو حیکاتانـە جیا لەوەی بونیادی ڕۆشنبیری ئەو سەردەمەی پێکهێنا بێت، بەڵام زیاتر بۆ کات بردنە سـەر و چێژ وەرگرتن لە بەسەرهاتەکان بووە. بە پێچەوانەوە ڕۆمان ڕووداوێك یان کەسایەتییەکی لەناو ژیاندا وەردەگرێت پانتایی دەقەکەی بۆ تەرخان دەکـات و تێیـدا تـەنیا مەبەسـتی گێڕانـەوەی

---

١-* ڤالتێر بنیامین، حیکاتخوان تێڕامانێکی بەرهەمەکانی نیکۆلای لێسکۆف، و: مەنسور تەیفووری، نڤیسار، کۆمەڵێك بابەتی تیۆری، دەزگەی ئاراس،٢٠٠٤، ل١٦

نییە، بگرە مەبەست و ئامانجگەلێکی ئاکار و کۆمەڵایەتیی بەها و نەریتە، کە تێیدا هۆشیارییەکی تاکی و گشتیی چیێ دەکات و کار بۆ گۆڕانیان دەکات، ئەمەش خاڵی جیاکەرەویە لەگەڵ حیکایەتەکان. ئەمە سەرەڕای ئەوەی، کە ئەو خەیاڵەی لە ڕۆماندا بەکارهاتووە مەرج بووە جێگەی قەناعەت پێهێنانی خوێنەر بێت، هەروەسا کەسایەتییەکانی ناو ڕۆمانیش کەسایەتیی ئاسایی ناو کۆمەڵگەن و هیچ جۆرە کەسایەتییەکی دیکەی وەکو خوداوەند و ئاژەڵی خەیاڵی و دڕەندەی تێدا نییە. مەبەست لە ڕۆمان تەنیا گێڕانەوەی نییە هەروەکو حیکایەت، بگرە مەبەست و ئامانج گەلێکی لایەنی ڕەوشتی و کۆمەڵایەتیی دەگرێتەبەر، کە تێدا هۆشیارییەکی تاکی و گشتیی چیێ دەکات و کار بۆ گۆڕانیان دەکات.

لە بەرانبەردا داستان برێتییە لە چیرۆکێکی شیعری خەیاڵئامێز، کە پاڵەوانەکان کار و کردەوەی لە توانا بەدەر ئەنجام دەدەن، کە تێڕاونینی چینی ئۆرۆستۆکراتییە، زمانی دەق لە داستاندا شیعرە و کارەکتەرەکانیشی نەگۆڕ و چەسپاون. بە پێچەوانەوە زمانی دەق لە ڕۆماندا پەخشانە و کارەکتەرەکانی لەناو پانتایی ڕۆماندا گۆڕانیان بەسەردا دێن.

سەبارەت بە پێوەندیی نێوان داستان و ڕۆمانەوە باختین وای دەبینێت، کە ڕۆمان لە کۆندا جۆرێکی ئەدەبی نەبووە، کە کەسایەتیی تایبەتی خۆی هەبێت وەکو داستان، چونکە داستان جۆرێکی ئەدەبی کۆن بووە و بابەتەکانی بۆ شانۆ و شیعری گۆرانی بردراون، ئەوا ئەو جۆرەیە، کە سەربەخۆ هەبووە وەکو تراژیدیا و کۆمیدیا و ئەلیجیات و هەموو جۆرەکانی دیکەی شیعر.

هەروەها خەسڵەتەکانی داستان هەروەکو خۆیان مانەوە و نەگۆڕان، بەڵام خەسڵەتی نەگۆڕ و جێگیر لە ڕۆماندا نییە، بە کورتیش داستان جیهانێکی دروستکراوە و ڕۆمان جیهانێکە بەردەوام چیێ دەکرێت، بۆیە داستان تەواوکراوە، بەڵام ڕۆمان پرۆژەیەکە پێش دەکەوێت، یاخود دەتوانیت بڵێیت پرۆژەیەکی کراوەیە. ئەوەی ڕاستیش بێت هەر پرۆژەیەك، کە پێش بکەوێت، پرۆژەیەکی کراوە دەبێت، بۆیە ڕۆمان قابیلی داخران نییە.

ڕۆمان ڕەگوڕیشەیەکی قووڵی لە نێو مێژوودا هەیە و دەکرێت بە ڕوونی سیماکانی لە قۆناخی ڕاوکردن بەدی بکەین، کاتێك کە ڕاوکەرەکان دەگەڕانەوە و شەو لە چواردەوری ئاگردان و کوانوو کۆدەبوونەوە، بەسەرهاتەکانیان لە گەشتی ڕاوەکەیان دەگێڕایەوە و ڕاوکەرەکە جڵەوی بۆ خەیاڵی شل دەکرد شتگەلێکی دەخولقاند بۆ ئەوەی ببێتە جێگەی سەرسوڕمانی

خوێنەرانی، ئەگەر گوێگرانیش حیکایەتەکەیان بزانیبایە، ئەوا گوێیان لێ نەدەگرت و دەیان کوشت.

لەوانەشە ڕۆمان لە کۆشك و تەلاری پاشاکانەوە سەریهەڵدا بێت، گێڕەرەوە مێژووی نەتەوەکەی و نەتەوەکانی دیکەی بۆ پاشا دەگێڕایەوە، بەڵام بە شێوازە تایبەتییەکەی خۆی، لێرەشەوە ڕۆمان و مێژوو پێوەستکران، ڕۆمان ئەگەر ژیانی تەناهی و ئاسایش باس بکات ئەوا شتێکی مێژوویی هەر تێدایە.

لە میتۆلۆژیای سۆمەری زۆر کۆندا، خوداوەند لیلیت دەبینین، کە هەموو شەوێك دەچێتە لای منداڵەکەی یاری لەگەڵ جلە ڕەشە درێژەکەیەوە دەکات، ئەویش چیرۆکێکی بۆ دەگێڕێتەوە تا دەنووێت. تا ئێستەش هەندێك لە دایکان هەمان ئەو گێڕانەوەیە ئەنجام دەدەن، ئەمەش بوونی زێدەڕۆییمان بۆ ڕاڤە دەکات کە دەگاتە سنووری خورافە.

لەوانەشە ڕۆمان لەگەڵ سەرهەڵدانی جەنگ سەریهەڵدا بێت. ئەرکی حیکاتخوان بە شێوەیەك بوو، کە جەنگەکە وا بگێڕێتەوە لەگەڵ ئامانجەکانی هۆزەکەی گونجاو بێت. سەرکەوتنی وا لێدەکرد شتێکی ناوازەیە هۆزەکانی دیکە ناتوانن بەدەستی بهێنن. هەروەها بیانووی بۆ دۆڕانەکان دەهێنایەوە دەیگەڕاندەوە بۆ تووڕەبوونی خوداوەندەکانەوە[1].

بێگومان حیکات و داستانە کۆنەکان، بە تایبەتیش حیکایەتە فۆلکلۆرییەکان و میللییەکان و داستانە یۆنانییەکان، کاریگەرییان لە چەسپاندنی بنچینە و بناخەی ڕۆماندا هەبوو، دیارە ئەو گۆڕانە لە حیکایەت و داستانەوە بۆ ڕۆمان، هەروا سانا نەبووە، بگرە پلە بە پلە ڕوانین و ئەقڵی مرۆڤ گۆڕانی بەسەردا هاتووە و فۆرمی نوێی بەخۆگرتووە (ئەقڵ وەکو بازدان، باز نادات، بگرە ئەمە پێویستی بە گردبوونەوەی زانیاریی هەیە، کە لەوانەیە نێزیکەی سێ هەزار ساڵ ڕوانگەی ئەقڵ بۆ جیهان پلە بە پلە گۆڕانی بەسەردا هات) [2] تا لە سەدەی هەژدەدا بە تەواوی فۆرمی کۆنی داستان و حیکایەت وازی لێ هێنرا و ژانرێکی نوێی بە ناوی ڕۆمان بە هۆی تێگەیشتنی تێڕوانینی نوێوە سەریهەڵدا، کە سەرەتا لە ئینگلتەرا لەسەر دەستی دیفۆ و ڕیچاردسن و فیلدنگەوە بوو، ئەمەش بەهۆی شۆڕشی پیشەسازی و چەندین گۆڕانکاریی دیکە هاتەکایەوە.

---

١- من تاريخ الرواية - حنا عبود - دراسة - من منشورات اتحاد الكتاب العرب دمشق — ٢٠٠٢ ص٦.

٢- هەمان سەرچاوە. ص٧

بێگومان چەندین هۆکار لـە سـەرهەڵدانی ڕۆمـان ڕۆڵیـان هـەبووە، لەوانـە سیسـتەمی پەروەردە لە ئەورووپا گۆڕانی بنەڕەتی بەخۆیەوە بینی و زانستی نوێ هاتـە خوێنـدن، کـە لـە دوای ڕێنیسانس و شۆڕشی پیشەسازی هاتەئاراوە، سەرەڕای ئەمەش بڵاوبوونەوەی ژمارەیەکی زۆری خوێندنگـەکان و بـەخۆڕاییکردنی خوێنـدن کاریگـەریی لەسـەر زیـادبوونی ژمـارەی خوێنـدەواران هـەبوو، کـە کۆمەڵگـەی لـە کۆمەڵگەیـەکی نەخوێنـدەوارەوە بـۆ خوێنـدەوار گواستەوە. بەمەش جەماوەرێکی نوێ خوێندەواریان چێکرد و نەوەیەك هاتەکایەوە، کە بایەخی بە خوێنـدن و خوێندنـەوە دەدا. بڵاوبوونـەوەی پرەنسـیپەکانی ئـازادی و ئـازادی تاکەکەسـی کاریگەریی لەسەر سەرهەڵدانی چیرۆکدا هەبوو. بەتایبەتیش هاتنەئارای مافەکانی ئافرەت، کە وای کرد ئافرەتیش خاوەنی کەسایەتیی خۆی بێت و سەربەخۆ بێت.

هەروەها ئەو سەرکەوتنە خێراییەی، کە پەڕتووکخانە گشتییەکان لە دوای ساڵی (١٧٤٢) بەدەستیان هێنا، ئەمەش وایکرد لە لەندەن لە ساڵی (١٧٤٠) کردنـەوەی یەکـەم کێتبخانـەی گشتیی ببێتە هۆکارێك بۆ بڵاوبوونەوەی پەڕتووکخانە[1]، کە ئەمـەش بـە دەوری خـۆی بـووە هۆکاری زۆربوونی خوێنـەری پـەڕتووك، چـونکە ئـەو کـات بـەهۆی گرانـی نرخـی پـەڕتووك خوێندنەوە لاواز بوو.

خاڵێکی دیکەش، کە بووە هۆکارێك بۆ گەشـەپێدانی پرۆسـەی خوێندنـەوە، پەیـدابوونی چاپخانە بوو لە لەندەن، زۆربوونی چـاپخانەکان وای لـە جۆنسـنی هزرڤـان، کـرد کـە زاراوەی (نەتەوەیەك خوێنەر) بەکاربهێنێت.

هەروەها چینی بورژوا زۆر بەخێرایی لە بەریتانیا گەشەی کردو دەستی بەسـەر بازرگـانی ئەو وڵاتەدا گرت، ئەمەش بووە هۆکارێك بۆ زۆربـوونی داهـات و سـامانیان کـە جـەماوەری خوێنەری هێندەی دیکە زیادکرد.

بەمجۆرە لەگەڵ بڵاوبوونەوەی خوێندەواری (ئەو خوێنەرانەی کە خوێندنەوەیان کردبـووە بـە پیشە و خاوەن ڕووناکبیرییەکی کلاسیکی بەرز بوون بایەخیان کـەمی کـرد و ئـەو خوێنەرانـە زیادبوون، کە ئارەزوویان خوێندنـەوەی بابـەتی سـادە و گـەپی ئـەدەبی بـوو) [2]. هـەروەها

---

١- ئیان وات، سەرهەڵدانی ڕۆمانی ئینگلیزی، و: بۆ عەرەبی: د. یۆنیل یوسف عەزیز، و. رەئووف بێگەرد، چاپخانەی عەلا، بەغدا ل٤٠

٢- هەمان سەرچاوە، ل٤٨

بڵاوبوونەوەی ڕۆژنامە بووە هۆکارێك بۆ پێشخستنی پەخشان، کە کاریگەرییەکی بێ وێنە و خێرایی هەبوو لەسەر بەرەو پێشبردنی ڕۆمان لەم ڕۆژنامە و گۆڤارانە زانیاریی کردەوەیی لەبارەی ژیانی ڕۆژانە و لایەنی ڕەوشت و چێژ بە زمانێکی سادە و ساکاری بێ گرێوگۆڵ بڵاودەکرانەوە، کە دوایی ئەم خەسڵەتە لە ڕۆژنامەوە بۆ ڕۆمان گوێزرایەوە. هەروەها وتارە بەناوبانگەکان ڕۆڵێکی گرینگیان لە ناساندنی ڕۆماندا گێڕا.

سەرەڕای ئەمانەش پەیدابوونی کۆشکەکانی پەڕتووکفرۆشتن بە نرخێکی زۆر کەم، بازرگانی پەڕتووکی پەیدا کرد و نووسەرگەلێك بۆ بەدەستهێنانی دەسکەوتی مادی بە خێرایی و زۆر لەخۆکردنەوە دەیاننووسی و بە پەڕتووك بڵاویان دەکردەوە. ئەمەش پێویستی بەوە هەبوو لە کۆتوبەندی سەردەمانی ڕابردوو ڕزگاریان بێت، ریچاردسن کە بە باوکی ڕۆمانی ئینگلیزی دادەنرێت (لەسەر داوای دوو پەڕتووکفرۆش دەستی کرد بە نووسینی ڕێبەرێك بۆ نامەنووسین، ئەمەش بووە یەکەمین هۆی نووسینی ڕۆمانی پامیلا، بۆیە پامیلا ڕێکەوت دروستیکرد و نووسەرەکەی لە سەرکەوتنە ناوازەکەی سەری سوڕما، کە ئەم بەرهەمەی بەدەستیهێنا) [1].

بەم پێیە لە سەدەی هەژدەدا هەموو ئەو هۆکارانە، بوونە سەرەتای سەرهەڵدانی ژانرێکی دیکەی ئەدەبی، کە زیاتر لە تانوپۆی سەردەمەکەی نێزیك بوو، خەڵکی کە بێزار ببوون لە داستان و حیکایەت، ئەو دوو ژانرەیان هێنایە نێو پانتاییەك کە بە ڕۆمان ناسرا.

ئەوەی زیاتر ڕێگەی بڵاوبوونەوەی ڕۆمانی خۆشکرد، سەرهەڵدانی ڕێبازی ڕۆمانسیزم و ڕیالیزم بوو، ڕۆمانس بەو زمانە دەگوترا، کە لە زمانی لاتینی جودابوو، واتە ڕۆمانس بە واتای نوێباو و تازە دێت، دواتر لەگەڵ گەشەکردنی بزووتنەوەی نوێگەرییەکان لە فەرەنسا و ئەڵمانیا لە وشەی ڕۆمان، ڕۆمانتیکییەت داڕێژرا. ڕیالیزمیش واتە سادە و ساکارییەکەی بەو واتایەیە، کە وردەکارییەکانی ژیان بە وردی و تەواوی بخرێنە ڕوو. لە خستنە ڕووی وردەکارییەکانی ژیانیش ڕۆمان زیاتر لە هەر فۆڕمێکی دیکە دەتوانێت ڕووداوەکان یەك لە دوای یەك بخاتەڕوو [2].

بەمشێوەیە ڕۆمان لەگەڵ سەرهەڵدانیدا جۆرە تێڕاونینێکی نوێی بۆ ژیان هێنایە کایەوە و دوو شتی بنچینەیی بچووك، کە ئامراز و خوێنەر بوون هێنایە ئاراوە، ئامراز ئەو پەڕتووکە

---

١- هەمان سەرچاوە، ل٥٦

٢- م.هـ. ئیبزام و ئەوانی تر، ڕۆمان چییە، و: جەواد مستەفا، ل١٠٦.

بچـووك و هەرزانانــە بــوون، کــە ئاســتی خوێنــدەوارییان بــەرزکردەوە، خوێنــەریش توێــژی پێشکەوتووخواز و زەحمەتکێشی کۆمەڵگە بوون، بۆیە ڕۆمان بە قسەی یەکێك لە ڕەخنــەگران جۆرێك بوو لە گرۆتینی شارنشینەکان. ڕۆمان لە هــەموو کاتــەکانی شــەڕ و ئاشــتیدا خــودان هەڵوێستی خۆی بووە و لەگەڵ بارودۆخەکەدا کاژ و بــەرگی نــوێی پۆشــیووە، بــەمجۆرە لــەپاش هەردوو جەنگی جیهانیش ڕۆمان لە بەرانبەر خوێنەرەکانیدا کاردانەوەی بەرانبەر وێرانییەکانی ئەو دوو جەنگە نیشانداوە.

بەم شێوەیە ڕۆمان لەچاو شیعر، هونەرێکی نوێیە (تەمەنی لە چوار سەدە تێناپەڕێ، بەڵام بەشێوەیەکی سەرسووڕهێنەر گەشەی کرد و شێوە و جۆرەکانی لق و پۆپی لێ بــووەوە و وەکــو ئامرازێکی سەرسووڕهێنەری تەعبیرکردن بەهەموو جیهاندا بڵاوبوویەوە) [1].

لێرەدا ئەوەی پێویستە ئاماژەی پێ بدەین ئەوەیە، کە لە ئەوروپادا ڕۆمان لە پێش چیرۆك دەرکەوتووە، ڕۆمانی هونەری لە چیرۆکی هونەری کۆنترە، وەکو باسمان کرد ڕۆمان لــە ســەدەی هەژدەدا سەریهەڵداوە، کەچی چیرۆك سەرهەڵدانەکەی بۆ سەدەی (١٩) دەگەڕێتەوە (د. عــەلی جەواد تاهیر) دەڵێت: (چیرۆکی هونەری لە کۆتایی سەدەی نۆزدەدا لەســەر دەســتی گــی. دی. مۆپاسان هاتە کایەوە، هەرچەندە پێشتر چیخۆف هەوڵێکی باشــی بــۆ لــەدایکبوونی چــیرۆکی کورت دابوو) [2].

---

١- چاوپێکەوتن لەگەڵ د. عەبدوڵا ئیبراهیم، گۆڤاری واتە، ژمارە ٣،ساڵی یەکەم، حوزەیرانی ٢٠٠٨، ل٨٩

٢- د. عادل گەرمیانی، چەند جیاوازییەکی نێوان ڕۆمان و چەشنەکانی دیکەی ئەدەب، ل٩.

## لەبارەی ڕۆمانی کوردییەوە:

دیارە لە ڕۆژهەڵات بەشێوەیەکی گشتیی شیعر وەکو ژانری دایك ماوەیەکی زۆر باڵادەست بووە، بێگومان ئەمەش هۆکارگەلێکی زۆری هەیە، وەلێ میللەتانی ڕۆژهەڵات درەنگ لە قۆناخی ژانرێکی وەك شیعرەوە بەرەو قۆناخی پەخشان پەڕیوونەتەوە، لەمەشدا باری ئابووری ڕۆڵی هەرە مەزنی خۆی گێڕاوە (ئەگەر ئەو ڕایەی، کە هەندێك لێکۆڵەر و پسپۆرانی ڕۆژئاوا دەیلێن وەربگرین، کە دەڵێن ڕۆمان لە دایکبووی کۆمەڵگە پیشەسازییەکانە و شیعریش لە دایکبووی کۆمەڵگە کشتوکاڵییەکانە، ئەوا ئەو ڕایە بەسەر ئەدەبی کوردیشدا پێڕەو دەکرێ، چونکە کۆمەڵگەی ئێمە کۆمەڵگەیەکی کشتوکاڵی بووە و دەقی شیعری بەرهەمهێناوە) [1]، دیارە کۆمەڵگەی کشتوکاڵیش مەودای کارکردنی فرەوانە و کاتی حەسانەوە و بێکاری کەمترە، بۆیە مرۆڤی کورد پتر پرژاوەتە سەر شیعر، لەبەر ئەوەی بە هۆی ڕیتم و ئاواز و کێش و سەرواوە ڕەوانتر و زوو وەریگرتووە و کاریگەریی لەسەر هەست و سۆزی کردووە، بۆیە شیعر لە ئەدەبی کوردیدا هەموو کاروبارێکی نێو کۆمەڵگەکەی بینیووە (ئەگەر بتەوێ ئاگات لە مێژووی کورد بێت، پێش ئەوەی مێژوومان بنووسرێتەوە، دەبێ بچیتە سەر شیعر، تۆ بە ڕێگەی شیعرەکانەوە لە سەردەمەکەی دەگەیت، ڕوو لە بوارە ئابوورییەکان، کۆمەڵایەتییەکان دەکەیت) [2].

ئەوەی ڕوون و ئاشکرایە کاتێك بارودۆخی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتیی ڕۆژهەڵات لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەمەوە بە هۆی هۆکارگەلێکەوە گۆڕانکاریی بەسەردا هات، میللەتانی ڕۆژهەڵات کەوتنە ژێر کاریگەریی ئەورووپاوە و لێیەوە ڕەوت و هزرە فەلسەفییەکانیان پێگەیشت، ئەمە سەرەڕای پێشکەوتنی تەکنۆلۆژیا و بڵاوبوونەوەی چاپ و چاپخانە و ڕۆژنامەگەری، میللەتانی ڕۆژهەڵات ئاشنای هونەری چیرۆك و ڕۆمان بوون، واتە پێکەوە ئاشنای دوو جۆر ژانری ئەدەبی بوون، چونکە (لە ئەدەبی ئەورووپاییدا، ڕۆمان لە پێش چیرۆك سەریهەڵداوە) [3]، ئەمەش پێوەندیی بە گۆڕانی کۆمەڵایەتیی و ئابووری و ئاڵۆزبوونی ژیانەوە

١- سابیر ڕەشید، ڕۆمانی کوردی، خوێندنەوە و پرسیار، بەشی یەکەم، دەزگەی ئاراس ٢٠٠٦، ل٧.

٢- شێرزاد هەینی، ٩٥٥ دەقیقە لەگەڵ شێرکۆ بێکەس، چاپخانەی تیشك، ٢٠٠٨، ل٢٦.

٣- د. عادل گەرمیانی، سەرەتاکانی ڕۆمانی کوردی، گۆڤاری کاروان، ژ(٢٢٠) ٢٠٠٧، ل٦٢.

هەیە، کە کاریگەریی کردە سەر چەشەی خەڵك و ئیدی ئەو خەڵکە بێزاربوون لە خوێندنـەوەی ئەو ڕۆمانە درێژانە، بە تایبەتیش دوای شۆڕشی پیشەسازی، کە تـەنیا کـاتی ئـەوەی هـەبوو چیرۆکێکی کورت بخوێننەوە، وەلێ میللەتانی ڕۆژهەڵات پێچەوانەی ئەورووپا سەرەتا چیرۆکیان نووسی، پاشان ڕۆمان، بۆیە عارەب و تورك و فارس سەرەتا بە چیرۆك دەستیان پێکرد، دواتـر دەستیان بە نووسینی ڕۆمان کرد، بە هەمان شێوەش لە ئەدەبی کوردی چـیرۆك پـێش ڕۆمـان کەوتووە، ئەم درەنگ سەرهەڵدانەی ڕۆمانیش بۆ گەلێك هۆکار دەگەڕێتەوە، لەوانە:

ــ داگیرکردنی کوردستان و نەبوونی قەوارەیەکی سەربەخۆی کورد، هەروەها دژایەتیکردنی کورد و دابڕاندنی لە کولتوورە نەتەوەییەکەی.

ــ قەدەخەکردنی زمانی کوردی (لە سـێ پارچـەی کوردسـتان) کـە یەکێکـە لـە ڕەگـەزە بنەڕەتییەکانی ئەدەبی نەتەوەیی.

ـ نەخوێندەواری و نەبوونی قوتابخانە، واتە سیستەمێکی پەروەردەیی کوردی بوونی نەبووە، دواتریش کاتێك قوتابخانەکان کراونەتەوە لەبەر چەندین هۆکار زۆرینەی دەرەبەگەکان بۆ نموونـە نەیانهێشتووە خەڵك ڕوو لە قوتابخانەکان بکەن، بەمەش نەریتی خوێندنەوە لـەناو کـوردا چـێ نەبووە.

ــ دواکەوتنی باری کۆمەڵایەتیی و نەبوونی هۆشیاریی لای تاك، ئەمەش پتر بەندبووە بـە بارودۆخە سیاسی و ئابوورییەکە.

ــ ڕۆژنامە ڕۆڵێکی باڵای لـە سـەرهەڵدانی پەخشـان و لەناویشـدا ڕۆمـان بینیـووە، زۆر درەنگ لەناو کوردا بڵاوبووەتەوە، کورد لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەدا توانیویـەتی ڕۆژنامـە دەربکات، لێرەوەش پەخشانی کوردی هەنگاوی بەرەو پێشەوە ناوە.

ــ نەبوونی چاپخانە و چاپکردنی پەڕتووك و نامیلکە.

ــ سەختی باری ئابووری کەوای کردووە تاکی کورد هەردەم لە خەمی ناندا بێت و کـەمتر لا لە ئەدەب و هونەر بکاتەوە.

ــ بە بەراورد لەگەڵ قۆناخەکانی گەشەسەندنی ئەورووپادا، لەناو کـورد چـینی بـۆرژوازی دەرنەکەوتووە، هەروەها نەچووەتە نێو قۆناخی پیشەسازییەوەش، کە یەکێکە لە هۆکـارە هـەر کاریگەرییەکانی سەرهەڵدانی ڕۆمان.

ـ ژیان سەرەڕای سەختییەکەی لە رووی ئابووری و سیاسییەوە، کەچی سادە و ساکار بووە، پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکان ئاڵۆز و شێواو نەبوونە، بەو واتایەی کە گۆڕانی کۆمەڵایەتیی درەنگ لەناو کۆمەڵگەی کوردی هاتووەتە ئاراوە، تا بە هۆیەوە ئەدەبی کوردیش بیر لە گۆڕینی فۆڕمەکەی بکاتەوە.

ـ شەڕوشۆڕ و هەڵگیرسانی شۆڕشە یەك لەدوای یەکەکانی کورد، کە هەمیشە تاکی کوردی ئاوارە و دەربەدەر کردووە و ناوچە و زێدی لێ وێرانکردووە، واتە سەقامگیری و ئاسایش نەبووە تا کەشێکی سروشتی گۆڕانکاریی بێتەبوون.

ـ ڕۆمان وەکو هونەرێکی ئەدەبی پێویستی بە کارامەیی و لێهاتوویی تایبەت هەیە و پێویستی بە کاتێکی زۆر دەبێ، بۆیە درەنگتر لە شیعر بڵاوبووەتەوە، چونکە ( لە ڕۆماننووسیندا پلان هەیە، بەڵام لە شیعردا کە چوویتە ناوییەوە، پلانێك نییە، دیار نییە چۆن دەڕوا و چۆن ناڕوا) [1].

ـ دواکەوتوویی هزری تاکی کورد، کە هەڵبەتە ڕەنگدانەوەی هزری داگیرکارانیشی لەسەر بووە، بۆ نموونە گاڵتەکردن بەوەی کە زمانی کوردی شایەنی زمانی نووسین نییە. ئەمەش شاعیرانی ئەوکاتی ناچارکردووە هەر بە شیعر وەڵامیان بدەنەوە، بۆ نموونە ئەحمەدی خانی بەمەبەستی سەلماندنی ئەوەی کە کوردیش داستان و حیکاتی هەبووە، بیری لە نووسینی شاکارەکەی مەم و زین کردووەتەوە.

ـ شار بە واتا کولتووری و شارستانی و پیشەسازی و ئابوورییەکەی بە هۆی هۆکارگەلێکی ڕامیاری و ئابووری بەو شێوازەی لە ئەورووپادا هەبووە، لەلای کورد بوونی نەبووە.

ئەمانە و گەلێك هۆکاری دیکەی ئابووری و ڕامیاری و کۆمەڵایەتیی کاریگەرییان لەسەر سست و خاوی سەرهەڵدانی ڕۆمانی کوردییدا هەبووە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر چاوێك بە باوردۆخی سەرهەڵدانی ڕۆمان لەلای میللەتانی دەوروبەردا بخشێنین، دەبینین ئەوانیش هاوزەمان لەگەڵ کوردا لەبەر هەمان هۆکاری سەرەوە درەنگ لەلایان ڕۆمان دیارکەوتووە، کەواتە مەسەلەکە پێوەستە بە پێگەیشتنی باردۆخی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی ڕۆژهەڵاتەوە، بۆ نموونە چیرۆك و ڕۆمان لای عارەبەکان لە سەرەتای سەدەی بیستەمەوە سەریهەڵداوە، بە تایبەتیش لە نێوان ساڵانی (١٩٠٨-١٩٣٩)، کە ئەوکاتیش لەگەڵ

---

١- شێرزاد هەینی، ٩٥٥ دەقیقە لەگەڵ شێرکۆ بێکەس، ل١٧١.

سەرەتاییبوونی ڕۆمانی عارەبیدا دوو ئاراستەی هەبووە، ئاراستەیەك بەلای ڕۆمانە دڵدارییەکان و سەرکێشییەکان دەڕۆیشت و ئاراستەیەکیش پێوەست بە ئەزموونی هەر یەك لە (جوبران خەلیل جوبران) و (مەنفلوتی) بوو، کە زیاتر پشتیان بە ئەدەبی میللی دەبەست[1].
هەروەها لە عێراق یەکەمین چیرۆکی عارەبی لە شاری موسڵ لە ساڵی(١٩٢٢) لەلایەن چیرۆکنووس (مەحمود ئەحمەد ئەلسەید) نووسراوە [2] (واتە سێ ساڵ پێش چیرۆکی (لە خەوما)ی (جەمیل سائیب)، کە لە ساڵی (١٩٢٥) نووسیویەتی و بە یەکەمین چیرۆکی هونەری کوردی دادەنرێت، لێرەشدا ئەوەی دیارە، کە موسڵ لە سنووری کوردستانە و نازانرێت کە ئایا (جەمیل سائیب) وەکو ڕۆشنبیرێکی ئەو سەردەمە ئاگەداری ئەو چیرۆکە بووە یان نا؟).
هەروەها یەکەمین ڕۆمانی هونەری سووریایی لەلایەن (شەکیب ئەلجابری) لە ساڵی (١٩٣٧) بەناوی (نەهم) نووسراوە[3]، ڕۆمانی میسریش لە سەرەتای سەدەی بیستەم لە ئەنجامی پێگەیشتنی چینی بورژوازی میسری سەریهەڵداوە، لە ئەردەنیش بەهۆی بزووتنەوەی ئەزموونکاری لە ساڵانی شەست و حەفتاکاندا ڕۆمانی هونەری نووسراوە. بە تایبەتیش لە ساڵی (١٩٦٨) لە ئەنجامی ئەو تێکچڕاژانەی، کە لە جەستەی ڕۆمانی عارەبی ڕوویدا بە هۆی شکستی عارەبانەوە، نووسران[4].

کەواتە سەرهەڵدانی ڕۆمانی کوردیش هاوکاتە لەگەڵ سەرهەڵدانی ڕۆمان لەلایەن نەتەوە دراوسێیەکانییەوە، کە ئەمەش دەربڕی ئەوەیە، کە ڕۆمان وەکو ژانرێکی نوێ لەو سەردەمانەدا تازە بڵاودەبوویەوە، ئەمە لەلایەك، لەلایەکی دیکەشەوە کورد بۆ نوێکردنەوەی شیعری کەوتە ژێر کاریگەریی تورکەکان و لەو ڕێگەیەوە دەستی گەیشتە بەرهەمە نوێیەکانی ڕۆژئاوا، بەڵام لە چیرۆك و ڕۆماندا کەوتە ژێر کاریگەریی عارەبەکانەوە و لەوێوە هونەری چیرۆك و ڕۆمانی ڕۆژئاوایی پێگەیشتووە، ئینجا وەکو دیاریشە یەکەمین ڕۆژنامەی کوردی (کوردستان) کە لە قاهیرە لە ساڵی(١٨٩٨) دەرچووە، سەرەتایەکیش بووە بۆ دەستپێکردنی پەخشانی کوردی، لە

---

١- فیصل خرتش، لمادا لم یتگور فن القصه فی العراق، ( لە ئینتەرنێتەوە).
٢- القصه والروایه و المسرح، جریده الاستقامه، العدد (٨٠٥) البلاپاو ٤\١١\٢٠٠٨.
٣- احمد زیاد محبك، متعه الروایه، دار المعرفه- بیروت، الگبعه الاولی، ٢٠٠٥،( لەئینتەرنێتەوە).
٤- فخری صالح، ڕوایتنان الان، ( لەئینتەرنێتەوە).

هەمانکاتیشدا لە ژمار (٣)ی ئەو ڕۆژنامەیەدا شاعیری کورد (حاجی قادری کۆیی) بۆ یەکەمینجار زاراوەی ڕۆمانی بەکارهێناوە:

زەمانە ڕەسمی جارانی نەماوە
چراغی نازم و مونشی کوژاوە
لە دەوری ئێمە ڕۆمان و جریدە
ئەگەرچی مەقسەدە، زانینی باوە[1]

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە لە دوای بەکارهێنانی زاراوەی ڕۆمان لە ساڵی (١٨٩٨) تا ساڵی (١٩٢٥)، کە یەکەمین چیرۆکی کوردی نووسراوە، ئەگەر بە ڕۆمانی لە قەڵەم بدەین، ئەوا یەکەمین ڕۆمانی هونەری کوردی نووسراوە کە (بە ڕای بەشێك لێتوژان "لە خەوما"ی (جەمیل سائیب) یەکەمین ڕۆمانی هونەری کوردییە) کە (٣٧) ساڵ نێوانیانە، دیارە لێرەشدا چەندین هۆکار هەیە، کە لە پاش زاراوەی ڕۆمان، پاش سێ دەیە و نیو ئینجا یەکەمین ڕۆمانی هونەری کوردی نووسراوە، لەوانەش:

ـــ خوێندەواری لە کوردستان بەو شێوەیە نەبووە، تا خوێندنەوەی ڕۆژنامە وەکو نەریتێکی لێ بێت و باو بێت.

ـــ ڕۆژنامەکە لە قاهیرە لە دەرەوەی کوردستان دەرکراوە و بەو تیراژە زۆرش نەبووە.

ـــ (حاجی قادری کۆیی) یەکێك بووە لە منەوەرەکانی سەردەمی خۆی و بە هۆی سەردانیکردنی تورکیا کە ئەوکات سەنتەری ڕۆشنبیری بووە، ئاگەداری و ئاشنایەتی لەگەڵ پێشکەوتنەکانی هونەر و ئەدەبدا بووە، بێگومان دەبێت ڕۆمانی خوێندبێتەوە و شتێکی لەبارەیەوە زانیبێت، بۆیە لە شیعرەکەیدا ناوی هێناوە، بەڵام لە ژیاننامەی شاعیردا باسی ژانرەکانی وەکو چیرۆك و ڕۆمان نەکراوە، ئەوەش باس نەکراوە، کە ئایا چ ڕۆمانێکی خوێندووەتەوە، لێرەشدا دەبێت باس لەوە بکەین، کە ژیاننامەی ئەو شاعیرانە زۆرینەیان دواتر کۆکراونەتەوە و باس کراون، واتە خۆیان ژیاننامەیان نەنووسیوەتەوە، ئەدەبی ژیاننامەش ئێستە وەکو ژانرێکی ئەدەبی بەرز لە قەڵەم دەدرێت، بەڵام ئەمەش درەنگ هاتووەتە نێو

---

١- دیوانی حاجی قادری کۆیی، لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەی : سەردار حەمید میران، کەریم مستەفا شارەزا، سنە، شارەکتێبی میدیا، ٢٠٠٧ . ل٩٩

ئەدەبی کوردییەوە، ئەگینا ئەگەر شاعیرانی ئەو کات (نالی) یاخود (پیرەمێرد) یان (حاجی قادری کۆیی)، ژیاننامەی خۆیان و گەشتەکانی خۆیانیان بنووسیبا، بێگومان زیاتر ئاگەداری باری ڕۆشنبیری ئەوکات دەبووین و بە هۆیەوە گەلێك لایەنی تاریکی ئەدەبی کوردی ڕۆشن دەبوووە.

هەڵبەتە هەروەکو چۆن هۆکارێکی زۆر هەبوون لە درەنگ سەرهەڵدانی ڕۆمانی کوردی، بە هەمان شێوەش هۆکارگەلێك هەن، کە کاریان لە دەرکەوتنی ڕۆمانی کوردیدا کردووە، لەوانەش بلاوبوونەوە و گەشەسەندنی بیری نەتەوەیی، بەرزبوونەوەی ڕێژەی خوێندەواری و زیادبوونی ژمارەی دانیشتوان و دروستبوونی شار و زیادبوونی ڕێژەی شارنشینەکان و زۆربوونی ژمارەی ڕۆژنامە و گۆڤارەکان، هەروەها زۆربوونی ژمارەی چاپخانە و قوتابخانە و پەڕتووکخانە و گەشەسەندنی هزری ڕۆشنبیری، ئەمە سەرەڕای ئالۆزبوونی پێوەندییە کۆمەڵایەتیی و ئابووریی و کاریگەرییەکانی دەرەوەش لە ئایدیۆلۆژیا و بیر و باوەڕەکانی بزووتنەوە ڕزگاریخوازەکان و سەرکەوتنیان لە هەندێك شوێندا، هەموو ئەمانە وەکو پێگەیەکی مادی بۆ هونەری نووسینی ڕۆمان لە کوردستان کاریگەرییەکی بێ وێنەیان هەبووە.

دەستنیشانکردنی سەرەتاکانی ڕۆمانی کوردی کارێکی پڕ زەحمەتە، لەبەرئەوەی تا ئێستە ڕەخنەگران و لێتوێژان لەسەر دیاریکردن و دەستنیشانکردنی یەکەمین ڕۆمانی کوردی ڕێکنەکەوتوون، جیا لەوەش بە هۆی بەیەکەوە سەرهەڵدانی چیرۆك و ڕۆمان، دەستنیشانکردنەکە زۆرتر ئاڵۆز بووە، ئەگەر چیرۆکی (لە خەوما)ی جەمیل سائیب بە یەکەمین چیرۆکی هونەری کوردی دابنرێت، ئەوا لەهەمان کاتدا بەلای هەندێکەوە بە یەکەمین ڕۆمانی هونەری کوردیش دانراوە. لەبەر ئەم هۆکارەشە ئەگەر قۆناخبەندی بۆ ڕۆمانی کوردی بکەین، سەرەڕای ئەوەی کە پچڕان لە نێوان قۆناخەکاندا هەیە، یەکڕاش لەسەر چەسپاندنی ئەو قۆناخانەدا نییە، بۆ نموونە (سابیر ڕەشید) بەم شێوەیە قۆناخبەندی مێژووی ڕۆمانی هونەری کوردی دەکات[1]:

١ـ قۆناخی لەدایکبوون و هەوڵە بەراییەکان (١٩٢٧-١٩٧٠).
٢ـ قۆناخی دامەزراندن و گەشەکردن (١٩٨٥-١٩٩٠).
٣ـ قۆناخی پێشکەوتن و نوێبوونەوە (١٩٩١- تا ئێستەکە).

١- سابیر ڕەشید، ڕۆمانی کوردی، خوێندنەوە و پرسیار، ل٨

بەڵام د. عادل گەرمیانی بەمشێوەیە دابەشی دەکات[1]:

١ـ قۆناخی ڕۆمانی کوردی بە شێوەی دەستنووس.

٢ـ قۆناخی ڕۆمانی کوردی بەشێوەی پەڕتووکی چاپکراو.

٣ـ قۆناخی ڕۆمانی کوردی بەشێوەی ئەڵقە ئەڵقەی بڵاوکراو لە ڕۆژنامە کوردییەکاندا.

هەڵبەتە لە هەوڵە بەراییەکاندا ئەو ڕۆمانانەی، کە نووسراون لە کات و ساتی خۆیاندا بڵاونەکراونەتەوە، بگرە دوای چەند دەیەیەك بڵاوکراونەتەوە، کە ئەمەش کارەکەی ئاڵۆزتر کردووە، چونکە ئەگەر لەکات و ساتی خۆیاندا بڵاوکرابانەوە، دۆخەکە بەشێوەیەکی دیکە دەبوو. بۆیە لێتۆژان لە دەستنیشانکردنی یەکەمین ڕۆمانی هونەری کوردیدا ڕایان جیاوازە: (د. عەبدوڵڵا دەباغ) و (د. عادل گەرمیانی) لە خەومای جەمیل سائیب بە یەکەمین ڕۆمانی هونەری کوردی دادەنێن[2]،(سابیر ڕەشید) (مەسەلەی ویژدان)ی ئەحمەد موختار جاف بە یەکەمین ڕۆمانی کوردی لە قەڵەم دەدات[3]. (حەمە سەعید حەسەن ڕای وایە، کە مەسەلەی ویژدان، نەك هەر ڕۆمان نییە، بگرە چیرۆکیش نییە و پێی وایە، کە زۆر بە سادە و ساکاری نووسراوەتەوە و وای پێ باشبووە نووسەر بە ڕاپۆرتێك مەسەلەکەی باسکردبا باشتر دەبوو، چاپکردنیشی بە غەدرێك لە ئەحمەد موختار جاف دەزانێت، بەو پێیەی کە خۆی تا لە ژیاندا مابووە بڵاوی نەکردووەتەوە، چونکە ڕای لێ نەبووە[4])، کە بێگومان ئەم ڕایە بە چاویلکەی ئەو سەردەمەیە و بە هیچ کلۆجێك ناگونجێت بە پێوانەی ئەمڕۆ سەیری بەرهەمی ڕابردوو بکرێت، لە هەمان کاتیشدا (حەمە سەعید حەسەن) چەند هەڵەیەکی لەم حوکمەدانەی هەیە، لەوانە ئەگەر ئەو چیرۆکە بە ڕاپۆرت لە قەڵەم بدات، ئەوا پێویستە هەموو چیرۆکەکانی دیکەی ئەو قۆناخەش بە ڕاپۆرتنووسین لە قەڵەم بدرێن، چونکە هەموویان لە رووی ڕوخسار و ناوەرۆکەوە لە یەکدییەوە نێزیکن. هەروەها دەبێ ئەو پرسیارەش ئاراستەی نووسەر بکرێت، کە چۆن زانیویەتی (ئەحمەد موختار جاف) ڕای لە چیرۆکەکەی خۆی نەبووە!!! تەنیا لەبەرئەوەی تا لە ژیان بووە چاپی نەکردووە، لەوانەیە شاعیر بواری چاپکردنی نەبوو بێت، یان هەر کێشەیەکی

---

١- د.عادل گەرمیانی، سەرەتاکانی ڕۆمانی کوردی، ل٦٢

٢- سابیر ڕەشید، چیرۆکی کوردی، ڕەخنە و لێکۆڵینەوە، چاپخانەی ڕۆشنبیری، ٢٠٠٧. ل١١

٣- سابیر ڕەشید، ڕۆمانی کوردی، خوێندنەوەو پرسیار، ل٧

٤- حەمە سەعید حەسەن، بەفر وگڕکان، دەزگەی ئاراس، هەولێر ٢٠٠٨، ل٧٢

دیکەی هەبوو  بێت، ناکرێت بەو شێوە حوکمە ڕەهایە چیرۆکێك لە خانــەی چـیرۆك بهێنرێتــە دەرەوە.  هەر لەم ڕوانگەیەوە (د. موحسـین ئەحمــەد عومــەر) و هەنـدێك لــە لێکۆڵــەرەکانی دیکەش ( شڤانیێ کورد)ی عەرەبی شەمۆ بە یەکەمین ڕۆمــانی هونــەری کــوردی دادەنــێن[1]، لێتۆژی دیکەش (ژانی گەلی)ی ئیبراهیم ئەحمەد و دەستەیەکی دیکەش (پێشمەرگەی) ڕەحیمی قازی بە یەکەمین ڕۆمانی هونەری کوردی لە قەڵەم دەدەن.

ئەوەی ڕوون و ئاشکرایە کوردەکانی سۆڤییەتی جـاران پێشــی کــوردی عێـراق ڕۆمانیــان نووسیوە وەکو عەرەبی شەمۆ و عەلی عەبدولڕەحمان مەمیدۆڤ...هتد، لەگەڵ ئەوەشدا دەکرێت بڵێین (لە ماوەی نێوان ساڵانی (١٩٢٥-١٩٨٣) چوار ڕۆمان هەبوونە کە ئەمانەن:

١ـ مەسەلەی ویژادن، ئەحمەد موختار جاف.

٢ـ پێشمەرگە، ڕەحیمی قازی.

٣ـ ئاشتی کوردستان، محەمەد ساڵح سەعید.

٤ـ ژانی گەل، ئیبراهیم ئەحمەد[2].

ئەگەر (لە خەوما)ی (جەمیل سائب)یشی بۆ زیاد بکەین، ئەوا ئەوکات  ئەو پێنج ڕۆمانە بە سەرەتای سەرهەڵدانی ڕۆمانی هونەری کوردی لە قەڵەم دەدرێن. بۆیە ئێمە ڕامان وایە، کە ئەم پێنج ڕۆمانە پێکەوە بە سەرەتای ڕۆمانی کوردی لە قەڵەم بدرێن، واتە تەنیا بەرهەمێك بە سەرەتای ڕۆمانی کوردی دانەنرێت، بگرە هەر پێنج بەرهەم بە سەرەتا و دەســتپێك دابنــرێن و زاراوەی ( چەمکیێ لە ڕۆمانە سەرەتاییەکان) لە جیاتی دەستەواژەی یەکەمین ڕۆمانی کــوردی بەکاربهێنرێت، چونکە لەلایەکەوە هێشتە چیرۆکبوون و ڕۆمانبوونی ئەم بەرهەمانــە یــەکلایی نەبووەتەوە، لە هەمانکاتیشدا لــە رووی هونــەری چـیرۆك و ڕۆمانــەوە، لــە رووی ڕوخســار و ناوەرۆکەوە بە سادەیی نووسراون، لە هەمووشی گرینگتر ئەوەیە، کە نووسەرەکانیان بە نیــازی چیرۆك و ڕۆمان نووسین بڵاویان نەکردووەتەوە، بۆ نموونە (ژانی گەل) لەلایەن خودی نووســەرەوە بە داستان هاتووەتە ناسین. واتە ئەگەر ئێمە ئەو بەرهەمانە بە تێکڕایی بە دەستپێکی ڕۆمانی کوردی لە قەڵەم بدەین، ئەوا هەم خۆمان لەو سەرەتا تەمومژ و ئاڵۆزەی ڕۆمانی کوردی دەرباز

---

١- د.موحسین ئەحمەد عومەر، شڤانیێ کورد وەك یەکەم ڕۆمانی کورد، گۆڤاری نووسەری نویێ، ژ(٣٣) تەموزی ٢٠٠٦، ل٢٥

٢- سابیر ڕەشید، ڕۆمانی کوردی، خوێندنەوەو پرسیار،، ل٨

دەکەین، هەمیش مافی نووسەرەکانیش ناخورێت، چونکە کەسیان لە پێش ئەوی دیکەدا بە پێوەری ئێستەمان لە خەیاڵی نووسینی ڕۆمانێك نەبووە. هەر چەندیشە (محەمەد عەلی کوردی) بەرهەمێکی بە ناوی (نازدار یا کچی کورد لە لادێ ) لە ساڵی (١٩٣٦) بڵاوکردووەتەوە، کە بۆ یەکەمینجار زاراوەی (ڕۆمان)ی لەسەر نووسراوە، بەڵام بە ناتەواوی و بە سێ ئەڵقە لە گۆڤاری ڕووناکی لە ژمارەکانی (٧، ٩، ١١)ی (١٩٣٦)دا بڵاوکراوەتەوە و ئەڵقەکانی دیکەی دیار نییە ((دەشێت بڵێین ئێستەشی لەگەڵدا بێت هیچ سۆراغ و بەشەکانی تری بەچنگ نەکەوتووە، بۆیە دەتوانین بیخەینە خانەی فەوتان و لەناوچوونەوە))[1].

سەبارەت بە قۆناخی دامەزراندن و گەشەکردنی ڕۆمانی کوردی تا ڕادەیەك هەموو ڕەخنەگران و لێکۆڵەران لەسەر ئەوە ڕێککەوتوون، کە دەیەی هەشتاکان قۆناخی زێڕینی ڕۆمانی هونەری کوردییە، کە تێیدا ڕۆمانگەلێکی زۆر چاپ و بڵاوکرانەوە، بەڵام ئەوکاتیش ڕۆمانی کوردی لەسەر دوو ئاراستەدا خۆی دەنواند:

١ـ ئاراستەی شار: کە ڕۆمانەکان زیاتر بە هێما و ڕەمز دەنووسران و چاوەدێری و سانسۆریان لەسەر بووە، بەهۆی بارودۆخی ڕامیارییەوە.

٢ـ ئاراستەی شاخ: کە نووسەرەکانیان زیاتر دەستکراوە و ئازادتر بوونە و هیچ چاوەدێری و سانسۆرێکیان لەسەر نەبووە.

ئەو دوو ئاراستەیە لە دوای ڕاپەرینی ساڵی ١٩٩١ بوونەوە بەیەك.

بێگومان هەمان ئەو هۆکارانەی، کە ڕۆڵیان لە درەنگ سەرهەڵدانی ڕۆمانی کوردی هەبووە، بە هەمان شێوەش بوونەتە هۆکارێك بۆ درەنگ سەرهەڵدانی ڕەخنەی ڕۆمانی کوردی، دیارە تا ڕۆمان نەنووسرێت و بڵاونەکرێتەوە، ڕەخنەش لەوب وارەدا سەرهەڵنادات، بۆیە زۆرێك لە ڕۆمانەکانی بەراییدا لەبەرئەوەی لەکات و ساتی خۆیان بڵاونەکراونەتەوە، نەبوونەتە بەرهەمهێنانی ڕەخنەی تایبەت بەخۆیان. کەچی کاتێك لە ساڵانی حەفتاکانەوە ئەو ڕۆمانانە بڵاودەکرێنەوە، بزووتنەوەی ڕەخنەی ڕۆمانی کوردیش دەستپێدەکات، بەڵام دیسانەوە چۆن جیاوازی لە بیر و ڕایەکاندا هەبوو سەبارەت بە سەرهەڵدانی ڕۆمانی هونەری کوردی، بەهەمان شێوەش لەبارەی دەستپێکردنی ڕەخنەی ڕۆمانی کوردی جیاوازی لە بیر و ڕایەکاندا هەیە، (د.

---

١- کارزان موحسین قادر، سیما تازەکانی ڕۆمانی کوردی، نامەی ماستەر، کۆلێژی زمان، زانکۆی سەلاحەدین ٢٠٠٩، ل١٠.

فوئاد ڕەشید) سەرەتای ڕەخنەی ڕۆمانی کوردی بۆ ساڵی (١٩٧٣) دەگەڕێنێتەوە و دەڵێت: (لە ساڵی ١٩٧٣دا لەژێر کاریگەریی بڵاوبوونەوەی ڕۆمانی"ژانی گەل"دا یەکەمین سەرەداوی ڕەخنەی ڕۆمانی کوردی بەدیارکەوت، هەرچەندە کەم و سنووردار بوو، لەپێش هەموویانەوە محەمەد ئەمین ئەحمەد بەدیار دەکەوێت، کە زنجیرە وتارێکی بەناونیشانی "غیاب الروایە فی الادب الکردی" لە ڕۆژنامەی "التاخی" بڵاوکردەوە) [1].

لە لایەن خۆیەوە (د. نەجم ئەڵوەنی) ساڵی (١٩٨٧) بە سەرەتای دەستپێکردنی ڕەخنەی ڕۆمانی کوردی دادەنێت و دەڵێت: "ساڵی ١٩٨٧، بە خاڵی دەستپێکردنی ڕەوتی ڕەخنەی ڕۆمانی کوردی لە هەرێمی کوردستانی عێراق دادەنرێ و لەو ساڵەدا چەندین وتاری ڕەخنەیی دەربارەی ڕۆمان لە گۆڤارە کوردییەکاندا بڵاوکراوەتەوە) [2]. (د. نەجم ئەڵوەنی) لێکۆڵینەوەیەکی ڕەخنەیی (سابیر ڕەشید)، کە لەو ماوەیەدا لەبارەی ڕۆمانی (شار)ی حوسێن عارفی بڵاوکردووەتەوە بە( نۆبەرەی ڕەخنەی ڕۆمانی کوردی ) [3]دادەنێت.

هەڵبەتە بە هۆی تازەیی هونەری ڕۆمان و دیارنەبوونی سەرەتاکانییەوە لە ئەدەبی کوردیدا، هەمیشە ئەو پرسیارە کراوە: ئایا کورد ڕۆمانی هەیە؟، ئەم جۆرە تێڕوانین و پرسیارکردنە هەرچەندە کاریگەرییەکی گەورەیان لە پێشخستنی ڕەوتی ڕەخنەی ڕۆمانی کوردیدا هەبووە و لەگەڵ ئەوەشدا وای کردووە ڕەخنەگران زۆرتر نەپرژێنە سەر لێکدانەوە و لێکۆڵینەوەی لایەنە هونەرییەکانی ڕۆمانی کوردی، هەمیشە کاتەکانی خۆیان بۆ سۆراخکردنی ئەوە تەرخان بکەن، کە وەڵامی پرسیارێکی لەمجۆرە بدەنەوە (ئاخر ئێمە لە ساڵی "٢٠٠١-٢٠٠٢)ش هەر بەگومانەوە بپرسین: ئەرێ ڕۆمانمان هەیە، کەواتە هێشتا ماوەیەتی خاوەن شێوازی تایبەتی خۆمان بین) [4]. سەرەڕای ئەوەش، کە ماوەیەکی درێژ ئەو پرسیارە کراوە، لەگەڵ ئەوەشدا لە رووی تایبەتمەندییەوە لە رەخنەی ڕۆمانی کوردیدا (دوو ماوەی جیاواز بەدی

---

١- فوئاد ڕەشید، ڕەخنەی (رەخنەی ڕۆمانی کوردی ١٩٧٣-١٩٩٩)، چاپخانەی ڕوون ـ سلێمانی، ٢٠٠٥ ، ل٨٦

٢- نەجم ئەڵوەنی، بینای کات لە سێ نموونەی ڕۆمانی کوردیدا، دەزگەی چاپ و پەخشی سەردەم — سلێمانی ٢٠٠٤،ل١٢

٣- هەمان سەرچاوە، ل١٣

٤- چاوپێکەوتن لەگەڵ د. فوئاد ڕەشید، ل٣٧

دەکرێ، ماوەی پێش ڕاپەڕینی بەهاری (١٩٩١) "بە تایبەتی کۆتـایی هەشـتاکان" و مـاوەی ڕاپەڕین "کۆتایی نەوەدەکان")[١]. بێگومان ڕەخنەی ڕۆمانی کوردی سەرەتا لەسـەر ڕووپـەڕی ڕۆژنامە و گۆڤارەکاندا دەستی پێکرد، بە واتایـەکی دیکـە ڕۆژنامـە و گۆڤارەکـان بـوارێکی کاریگەربوون لە سەرهەڵدانی ڕەخنەی ڕۆمانی کوردیـدا و لـەو ماوەیـەدا هـیچ چـاپکراوێکی تایبەت بە ڕەخنەی ڕۆمانی کوردیی نەبووە.

هەڵبەتە ڕەخنەی ڕۆمانی کوردیش بە هۆی ئاراستەبوونی خودی ڕۆمـانی کـوردی بەسـەر ئاراستەی شاخ و ئاراستەی شاردا، ئەویش لە ساڵانی هەشتاکاندا لەناو ئـەو دوو ئاراسـتەیەدا درێژەی بە کاروانی خۆی داوە و لەشاخدا جگە لە دەرکردنی دوو نامیلکەی تایبەت بە ڕەخنەی ڕۆمانەوە، لە گۆڤارەکانی ئەوکات وەکو (بانگ، گزنگ، نووسەری کوردستان...هتد) چـەندین وتار و بابەت و لێکۆڵینەوەی ڕەخنەیی بڵاوکراونەتەوە.

هەروەکو چۆن شەڕی ساڵی (١٩٦٧)ی عارەبان هێڵێکـی جوداکـەرەوە بـوو، لـە مێـژووی ڕۆمانی عارەبیدا [٢]. ڕاپـەڕینی سـاڵی (١٩٩١)یـش کاریگـەریی لەسـەر ڕۆمـانی کـوردی و ڕەخنەی ڕۆمانی کوردیدا هەبووە و بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ کاریگـەریی لەسـەر تەکنیك و شێوازەکانی گێڕانەوەدا کـردووە، بـەڵام سـەرەڕای ئـەوەش مـاوەی نێـوان سـاڵانی (١٩٩١-١٩٩٦) بە ماوەیەکی کزولاواز بۆ ڕۆمانی کوردی و ڕەخنەی ڕۆمانی کوردی لە قەڵەم دەدرێت، ئەمەش لەبەر گەلێك هۆکاری ڕامیاری و ئابوورییـەوە، بـەڵام (لـەکۆتایی سـاڵانی نەوەدەکانەوە، سەرەداوی چەند ئاراستەیەکی ڕەخنەیی نوێ لە چـەند بەرهـەمێکی ڕەخنەییـدا بەدی دەکرێت، کە تا ڕادەیەك هەوڵیانداوە سوود لە چـەمك و زاراوەکـانی ڕێبـازی ڕەخنـەیی بونیاتگەری و دەروونشیکاری و شێوازگەری وەربگرن) [٣].

---

١- فوئاد ڕەشید، ڕەخنەی (ڕەخنەی ڕۆمانی کوردی ١٩٧٣-١٩٩٩)، ل٩٨

٢- د. شكري عزيز الماضي، انماط رواية العربية الحديثة، مطابع دار السياسة،، كويت، ٢٠٠٨ ، ل١٦

٣- فوئاد ڕەشید، ڕەخنەی (ڕەخنەی ڕۆمانی کوردی ١٩٧٣-١٩٩٩)، ل١٧٢

# سەرچاوەکان

## ٭ پەڕتووك بەزمانی كوردی:


١ـ سابیر ڕەشید، ڕۆمانی كوردی، خوێندنەوە و پرسیار، دەزگەی ئاراس ـ هەولێر .٢٠٠٧

٢ـ فوئاد ڕەشید، ڕەخنەی(ڕەخنەی ڕۆمانی كوردی ١٩٧٣-١٩٩٩)، چاپخانەی ڕوون ــ سلێمانی،٢٠٠٧ .

٣ـ م.ه. ئیبزام و ئەوانی تر، ڕۆمان چییە، و: جەواد مستەفا، دەزگەی تۆژینەوە و بلاّوكردنەوەی موكریانی، چاپی یەكەم .٢٠٠٨

٤ـ نەجم خالید ئەڵوەنی، بینای كات لە سێ نموونەی ڕۆمانی كوردیدا، دەزگەی چاپ و پەخشی سەردەم، .٢٠٠٤

٥ـ عەبدوڵلا سەڕاج، بەرەو ئاستانەی ڕۆمان و گۆشەنیگاكان، دەزگەی چاپ و پەخشی سەردەم،٢٠٠٧.

٦ـ ئیان وات، سەرهەڵدانی ڕۆمانی ئینگلیزی، و: بۆ عارەبی: د. یۆنیل یوسف عەزیز، و.رەئووف بێگەرد، چاپخانەی ( عەلا) بەغدا.

٧ـ ئەدوارد بلّشن، دایانا داوبتهایر، ڕۆمان و پیشەی نووسینی ڕۆمان، و. بۆ عارەبی، سامی محەممەد، و. بۆ كوردی: ئەژی گۆران، چاپخانەی ئەلمەشریق ـ بەغداد ١٩٨٢.

٨ـ نقیسیار، كۆمەڵێك بابەتی تیۆری، كۆمەڵێك وەرگێڕ، دەزگەی ئاراس — هەولێر .٢٠٠٤

٩ـ حەمەسەعید حەسەن، بەفر و گڕكان، دەزگەی ئاراس — هەولێر، ٢٠٠٨

١٠ـ سابیر ڕەشید، چیرۆكی كوردی، چاپخانەی ڕۆشنبیری، .٢٠٠٥

١١ـ شێرزاد هەینی، ٩٥٥ دەقیقە لەگەڵ شێركۆ بێكەس، چاپخانەی تیشك، .٢٠٠٨

١٢ـ باكنر ب. تراویك، مێژووی ئەدەبیاتی جیهان، و: حەمە كەریم عارف، چاپخانەی ڕۆژهەلاّت- هەولێر، چاپی یەكەم،.٢٠٠٨

١٣ـ دیوانی حاجی قادری كۆیی، لێكۆڵینەوە و لێكدانەوەی: سەردار حەمید میران، كەریم مستەفا شارەزا، سنە، شارەپەڕتووكی میدیا، ٢٠٠٧.

### ⋆ پەڕتووك بەزمانی عەرەبی:

١٤ـ د. شكري عزيز الماضي، انماط الرواية العربية الحديثة، مطابع دار السياسة، كويت، ٢٠٠٨.

١٥ـ حنا عبود، في تاريخ الرواية، - دراسة - من منشورات اتحاد الكتاب العرب دمشق — ٢٠٠٢.

### ⋆ نامەی ئەكادیمی:

١٦ـ كارزان موحسین قادر، سیما تازەكانی ڕۆمانی كوردی، نامەی ماستەر، كۆلیژی زمان، زانكۆی سەلاّحەدین ٢٠٠٩، ل١٠.

### • گۆڤار و ڕۆژنامە:

•

١٧ـ گۆڤاری ڕامان ژ(١٢٥) خولی سێیەم/ ساڵی دوازدە / تشرینی یەكەمی ٢٠٠٧.

١٨ـ گۆڤاری ڕامان ژ(٩٩)،خولی دووەم /ساڵی دەیەم/ ئابی ٢٠٠٥.

١٩ـ گۆڤاری كاروان، ژ(٢٢٠) ٢٠٠٧.

٢٠ـ گۆڤاری كاروان، ژ(١٧٢) نیسانی ٢٠٠٣.

٢١ـ گۆڤاری نووسەری نوێ، ژمارە(٣٣) تەمموزی ٢٠٠٦.

٢٢ـ گۆڤاری واتە، ژمارە (٣) ساڵی یەكەم، حوزەیرانی ٢٠٠٨.

٢٣ـ گۆڤاری نەوشەفەق، ژمارە (٦٢)ی تشرینی دووەمی ٢٠٠٨.

٢٤ـ ڕۆژنامەی ( اڵستقامە)، ژ(٨٠٥)، سێشەممە٤|١١|٢٠٠٨.

### ⋆ ئینتەرنێت

٢٥ـ احمد زياد محبك، متعە الروايە، دار المعرفە، بيروت، الگبعە الاولى ـ ٢٠٠٥.

٢٦ـ فيصل خرتش، لمادا لم يتگور فن القصە فى العراق،

٢٧ـ احمد زياد محبك، متعە الروايە، دار المعرفە- بيروت، الگبعە الاولى، ٢٠٠٥.

٢٨ـ فخرى صالح، ڕوايتنان الان.

## تەکنیك لە ڕۆمانی
## دوا نامەی دێوەرەیەکی (سەلاح عومەر)دا

دوا نامەی دێوەرەیەك، ڕۆمانێکی ڕۆماننووس (سەلاح عومەر)ـە، لە دووتـۆیی (٩٦) لاپەڕە بە قەبارەی مامناوەنـدی وەکـو بلاوکراوەکـانی مانگنامـەی بـەدرخان ژمـارە(٥) لـە سلێمانی لە ساڵی (٢٠٠٥) چاپ و بلاوکراوەتەوە، دواتر لەگەڵ ڕۆمانـەکانی دیکەیـدا وەکـو کۆبەرهەمێك لە بەرگێکدا بەناونیشانی (جەنگ) لـە بلاوکراوەکـانی دەزگـەی ئـاراس ژمـارە (٧٤٢) لە هەولێر لـە سـاڵی (٢٠٠٨) چـاپ و بلاوکراوەتـەوە و ڕۆمانەکـە وەکـو چـوارەمین بەرهەمی هاتووە و لاپەڕە (٢٩٣-٤٠٣)ی بۆ تەرخان کراوە. لەم لێکۆڵینەوەیەدا هەوڵمانـداوە تیشك بخەینە سەر تەکنیکەکانی گێڕانـەوەی ئـەم ڕۆمانـە، هـەروەها بـاس لـە بـەکارهێنانی ئەفسانە و فۆلکلۆر و و سروشت وەکو چەند ڕەگەزێکی ئەم ڕۆمانە دەکەین.

### دەروازە:

ڕۆمانەکە لە (١١) چاپتەر پێکدێت، کە هەر چاپتەرێك ژمارەیـەکی دیـاریکراوی خـۆی لەسەر و لە ( ١ـ ١١) بەشەکان لە یەکدی جوداکراونەتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا لە چاپتەرەکانی ( ٨، ٤) دا بەهۆی دانانی سێ ئەستێرەی بەدوای یەك ( * * *) چەند بەشێکی دیکە لـەناو ئەو چاپتەرانەدا جوداکراونەتەوە.

ڕووداو و چیرۆکی ڕۆمانەکە بریتییە لە کۆچکردنی گەنجێك بـۆ هەنـدەران، دواتـر مـردن و شوێنبەزربوونی لەناو بـەفردا، واتـە تـەوزیفکردنی کارەسـاتێکی سـەردەمیانەی کۆمـەڵگـەی کوردییە لەناو ڕۆماندا. کۆچکردن بەرەو ئەورووپا لە دوای ڕاپەڕینەوە بووەتە خولیـا و ئـاواتی زۆرینەی هەرە زۆری چینەکانی کۆمەڵگەی کوردی، وشەی (خـاریج) ئـەو وشـە سـیحراویی و

قەشەنگ و ڕازاوەیەیە، کە لەگەڵ داهاتن و دروستبوونی لە دوای ڕاپەڕینەوە، جێـی پێـی بـە وشەگەلێکی زۆر لێژکرد و سەرنجی هەمووانی بۆ لای خۆی ڕاکێشا. مرۆڤی کورد بـۆ گەیشـتن بەو بەهەشتە سەرابییە، نەك هەر ماڵ و موڵکی بۆ کردە قوربانی، بگرە ئامادەی ئەوەشی تێدا بوو، کە سەرکێشی بە ژیان و ڕۆحی خۆشی بکات. جێی باسە تا ئەو ساتەش خولیای گەیشـتن بە ئەورووپا و جێهشتنی وڵات، تەواوی بیرکردنەوەی گەنجانی داگیرکردووە.

دیارە لە دوای ڕاپەڕینەوە تا ئێستە هەموومان گوێمان لە چـیرۆکێك یـاخود زیـاتری ئـەو کەسانە بووە، کە لەسەر سنوورەکان لەناو بەفردا ڕەقبوونەتـەوە، یـان لـەناو دەریـای ئیجـەدا بوونەتە خۆراکی ماسییەکان. ڕەنگە هەندێکمان بەشداریشمان لە پرسەکانیاندا کردبێت. وەلێ ئایا کێ دەزانێت هەریەك لەم کەسانە بە چ خولیا و ئارەزوویەك ڕوویان لە هەندەران کردووە؟ چ خەم و ئازارێکیان لەگەڵ خۆیاندا بردووەتە ژێر گڵ؟ دوا ساتەکانی ژیانیان چۆن بـووە و هـزر و بیرکردنەوەیان چی بووە؟ دەبێ بیریان لە چی کردبێتەوە و چۆن چۆنی ئەو گەشـتەیان کـردووە و چەند شار و وڵاتیان بڕیووە؟ لەناخی خۆیاندا چـۆن چرکەسـاتەکانی ژیانیـان بردووەتـە سـەر و لەگەڵ بارودۆخی گەشـتەکەیاندا چـۆنیان گوزەرانـدووە؟ کرۆکـی کـاری ڕۆمـانی (دوا نامـەی دێوەرەیـەك) باسـکردن و کەشـفکردنی ئـەو حـەز و خولیـا و ئارەزووانـەی کەسـەکانی ئـەو گەشـتانەیە و گێڕانـەوەی دواسـاتەکانی مردنـە لەسـەر سـنوورەکان و بەدیارخسـتنی نـاخی ئەوانەیە، کە وڵات و نیشتمان جێ دەهێڵن.

کۆچکردن لە ڕووی زمانەوانییەوە (بەواتای چوونە دەرەوە لە زەوییەکەوە بۆ زەوییـەکی تـر دێت) [1].

نەتەوە یەکگرتووەکانیش وەك دیاردەیەکی جیهـانی، کۆچـکردنی بەمشـێوەیە پێناسـەی کردووە "بزێتییە لە جموجۆڵی جوگرافی خەڵك یان تاکە کەس لە نێوان ناوچە و هەرێمەکانـدا، کە گۆڕانی جێگـەی نیشـتەجێبوون بگرێتـەوە، لەمیانـەی کـات و ماوەیـەکی دیـاریکراودا،

١- نەبەز عەزیز ئەحمەد، بژار زیاد ساڵح، هۆکارەکانی کۆچکردنی لاوان،، گۆڤاری ( پێشکەوتن) ژمارە (١٥٦)ی بەهاری ٢٠٠٩ . ل٤٤، ئەویش لە( موسلح عەبدولقادر و ئەوانی تر،کۆچکردن بۆ دەرەوەی وڵات، بۆ بەدەستهێنانی بڕوانامەی بەکالۆریۆس، بڵاونەکراوتەوە، پێشکەشکراوە بە زانکۆی سەڵآحەدین کۆلێژی ئەدەبیات، بەشی کۆمەڵناسی،١٩٩٨، ل١٩.

بەواتایەکی دیکە برێتییە لە کۆچکردن و بەجێهشتنی نیشتمانی دایك و ڕوونـان لـە جێگـە و هەرێمێکی دیکە بەمەبەستی مانەوە و درێژەدان بە ژیان لەو جێگەیەدا"[1].

فەرهەنگی زاراوەی کۆمەڵناسـی پێناسـەی کۆچـکردنی کـردووە "بـەوەی کـە کۆچـکردن ئاماژەیە بۆ کۆچی چەند تاکێك یاخود چەند کۆمەڵێك دەکـات کـە لـە نیشـتمانی بنـەڕەتی خۆیانەوە بـۆ کۆمەڵگەیـەکی دیکـە بەمەبەسـتی مانـەوەی بـەردەوام و ئـارامی و جـێگیری لەکۆمەڵگەی نوێ بەگوێرەی مەرجەکانی مانەوە لەم شوێنەدا"[2].

(د. شاکر مستەفا سەلیم) ڕەهەندێکی قووڵتری بە چەمکی کۆچـکردن داوە و وا پێناسـی کردووە کە "بزووتنەوەیەکی بەرفرەوانی کۆمەڵێك دانیشـتووانە لـە نـاو وڵاتێکـدا یـاخود بـۆ وڵاتێکی تر، هەندێ جار کۆچکردنەکە وەرزییە و بۆ پێداویستی خواردن، خواردنەوەیە، هەندێ جاریش هەمیشەییە بەهۆی ڕووداوە سروشتییەکان یان گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییـەکان یـاخود بەهۆی جەنگ یان بەمەبەستی بەدەستهێنانی ئاستێکی بەرزتری ژیان"[3].

" لە زانستی کۆمەڵایەتیدا کاتێك بە حاڵـەتێك دەگوترێـت دیـاردە ئەگـەر ئـەو حاڵەتـە هەمیشە ئامادەیی هەبێت لە نێو کۆمەڵگەدا و بەردەوام ڕووبدات"[4]، سەرەڕای ئـەوەش کـە کۆچکردن دیاردەیەکی ئاساییە" بەڵام کاتێك لە هەرێم و ناوچەیەك ڕێژەی کۆچکەران بەردەوام ڕووی لە زیادبوون کرد، ئەوا لەو کاتەدا دیاردەکە نا ئاسایی دەبێت، چونکە کاتێك بـە لێشـاو خەڵکی وڵاتی خۆی بەجێهێشت و بەردەوام کێرڤی کۆچکەران لە هەڵکشاندابوو، بـارودۆخێکی

---

١- ڕاستگۆ محەمەد، کۆچ : کاردانەوە لەبەرانبەر کێشە و گرفتە هەمەجۆرەکانی دنیای گەنجان و لاوان، گۆڤاری ( کۆچ) ژمارە (٩)ی ٢٠٠٨ . ل٣٨٤.

٢- نەبەز عەزیز ئەحمەد، بژار زیاد ساڵح، هۆکارەکانی کۆچکردنی لاوان،، گۆڤاری ( پێشکەوتن) ژمارە (١٥٦)ی بەهاری ٢٠٠٩ . ل٤٤، ئەویش لە( د. سەمیرە، فەرهەنگی زاراوەی کۆمەڵناسی، و: خەسرەو میراودەلی، چاپخانەی چوارچرا، سلێمانی ٢٠٠٧، ل١١٤.

٣- نەبەز عەزیز ئەحمەد، بژار زیاد ساڵح، هۆکارەکانی کۆچکردنی لاوان،، گۆڤاری ( پێشکەوتن) ژمارە (١٥٦)ی بەهاری ٢٠٠٩ . ل٤٤، ئەویش لە( د. شاکر مصطفی سلیم، قاموس الانثروثولوزیا، جامعە کویت، ١٩٨٢، ل١٣١.

٤- هەمان سەرچاوەی پێشوو . ل٣٨٤

لەمجۆرە خاڵی نابێت لەلایەنی نێگەتیف و خراپ کە دواجار کۆمەڵگە و وڵات و خودی کۆچکەر باجەکەی دەدەن"[1].

بێگومان کۆچکردن ئەگەر لە ئەنجامی شەڕوشۆر، یان بەزۆرەملێ بێت، یان لە ئەنجامی ئەو فشار و پاڵەپەستۆیە ئابووری و کۆمەڵایەتییانە دابێت، کە کـار لـە خـودی کەسـەکە دەکـەن بڕیاری کۆچ بدات، ئەوا لەهەمان کاتیشدا ڕووبەڕووی چەمکێکی دیکە دەبێتەوە کـە ئـەویش مەرگە، چونکە پرۆسەی کۆچکردن خۆی لەخۆیدا پرۆسەیەکی کۆتا نادیارو لێڵە و هەر شتێکی نادیار و لێڵیش شیمانەی لەناوچوونی لێدەکرێت. بۆیە مەرگ بـە ڕوویـەکی دیکـەی کـۆچ لـە قەڵەم دەدرێت و وەکو هێڵێکی تەریب لەگەڵ کۆچدا هەنگاو دەنێت. بەهەردوو چەمکیشەوە بێ واتایی مرۆڤ و بێ ئومێدبوون لە ژیـانێکی تـژی لەشەڕوشـۆر و نەهامـەتی و سـتەمدیدەیی و بەشمەینەتی ئەو مرۆڤ و کۆمەڵگەیە دیار دەخەن.

پێش ئەوەی باسی چەمکی کۆچ و مردن لەناو ڕۆمانەکەدا بکەین، وا چـاکە چـیرۆکی نێـو ڕۆمانەکە بزانین، چیرۆکەکە باس لە کەسێکی ئاسایی نێو کۆمەڵگە دەکات کـە فەرمانبـەرە و خێزاندارە و کورو کچێکی هەیە و وەکو هەموو تاکەکانی ئەم کۆمەڵگەیەی ئێمە، لەم ژیانـەی خۆی بێزار دەبێت و بڕیاری چوونە دەرەوە دەدات، جاری یەکەم لەڕێگەدا نـەخۆش دەکـەوێت و هاوڕێیەکی لەگەڵدا دەبێـت کـەزۆر ئاگـەداری دەبێـت و ڕزگـاری دەکـات، بـەڵام دەرناچـن و دەگەڕێنەوە. لە جاری دووەمدا بە نهێنـی بڕیـاری دەرچـوون دەدات، بەتایبـەتیش تـا بـاوکی کەنەخۆشە و لەسەر جێگە کەوتووە پێی نەزانێت نەوەك کار لە تەندروستی و دەروونی بکـات، تەنیا برایەکی و کوڕێکی پووری لێ ئاگەدار دەکاتەوە. بۆیە خانووەکەی دەفرۆشێت و هەرچـی پارە و پولیشی هەیە دەداتـە ئـەو قاچاخچـییەی کـە لەلایـەن هاوڕێیەکییـەوە ناسـیویەتی و بەیەکەوە لەگەڵ چەند هاوڕێیەك لە شەوێکی بەفراوی سارد دا بەڕێ دەکەون و لەسـەر سـنوور لەناو ئەو چیایانەی تژی لەبەفر قاچاخچییەکە خۆی لێیان بزر دەکـات و ئـەوانیش لـەناو ئـەو چیایانەدا ڕێگە ون دەکەن و هەر لەوێش ماڵئاوایی لە ژیان دەکەن.

دیارە کۆچکردن بەم بەفر و سایەقە و زریانـە و پشـتکردن لەشـارو وڵات، دەبـێ چـەندین فاکتەری کاریگەرو بەهێز هەبن تا وا لەمرۆڤ بکات ئەو سەرکێشییە بکات و خۆی لـەو شـەوە تاریکە و بەفرە ئەستوورە بدات. ڕۆمـاننووس لـەزاری نـەوزادەوە چـەندین هۆکارمـان بـۆ

---

١- هەمان سەرچاوەی پێشوو . ل٣٨٥

دەستنیشان دەکات کە وای کردووە شاڵاوی کۆچکردن تا ئێستەش بەردەوام بێت و بگرە کەسانی واش هەبن چەندین جار لەم ڕێگەیان بدەن و سنووورداش بکرێنەوە، کەچی هەر واز لە کۆچکردن نەهێنن. ئەوەتا نەوزاد دەڵێت:

**"بڕیاری ئەم سەفەرەیشم بڕیاری ئێستە نەبووە، بگرە ماوەیەکی دوور و درێژ بوو پلانم بۆ دادەڕشت و بیرم لێی دەکردەوە و تاوتوێم دەکرد، کەچی هەر جارەی شتێك دەبووە بەربەست و ڕێی پێ دەگرتم.."** ل ٣

ڕۆماننووس هۆکارەکانی ئەم کۆچکردنە گشتگیرییە بۆ ئەو شەڕ و کاولکاری و ماڵوێرانییە دەگەڕێنێتەوە کەنەك هەر بووەتە هۆی داروخانی مادی، بگرە داروخانی هزری و کولتووریشی بەدوای خۆیدا هێناوە:

**" ئەمە چ وەحشیەتێکە تێی کەوتووم؟ چ خەراباتێکە، داروبەرد بەسەریەکدا بڕووخێت و هێلانە و چۆلەکە و پەپوولە و گوڵ، حەرف و پەڕتووك و پیت و دێر و وشە لێك دابڕێن و هێزی نەبێت بیانگەیەنێتەوە یەك..."** ل ٥

هەروەها جیاوازی چینایەتی و بەخێرایی دەوڵەمەندبوونی چینێك و هەژاربوونی زۆربەی خەڵکی، بەشێوەیەك کە لە شێواز و سیمای گەڕەکەکانیانەوە ئەو جیاوازییە بەدی دەکرا:

**" ئینجا بام دایەوە ڕۆژئاوای ماڵە خواپێداوەکان" "بێ ئاگایانە ئەوێم هەڵبژارد و خۆم بە کۆڵانەکەدا کرد، ئەوێی هێمن و ئارام و ڕازاوە، ئەوێی پاك و تەمیز و بێ ژاوەژاوە، بێ شەڕو پیسی، ئەوێی ڕووناك و پڕ گڵۆپ.."**ل١٥

هۆکارێکی دیکەی ئەو کۆچکردنە نەبوونی جێگەی حەسانەوە و پشوودان و یاری و باخچەی دەلڕفێن و شەقامی جوانە لەناو شارەکاندا:

**"جا لە شارەکەمان جێ هەبوو..؟ لەناو شەقام و کۆڵانەکانیدا چی هەیە.."** ل١٥

فاکتەرێکی دیکەی کۆچکردن پێوەندیی بە ڕۆژهەڵاتی دواکەوتوو و ڕۆژئاوای پێشکەوتوو هەیە لە هەموو بوارەکانی هزری و ڕۆشنبیری و ئابووری و کۆمەڵایەتیی و خزمەتگوزاری.. هتد، کە ئەمەش بووەتە خەونی مرۆڤەکانی ڕۆژهەڵاتی و بەحەسرەتەوەن ساتێك بەم پێشکەوتنەی ڕۆشنبیریی و جوانییەکانی ڕۆژئاوا بگەن:

**" دەمویست تا نەمردووم هەندێك پیاسە بە ناو شەقامە ڕازاوە و کەنار دەریاکان بکەم و بەناو بازاڕەکانیدا بسووڕێمەوە.. سەر بە کۆشك و تەلارەکانیدا بکەم و لەشوێنێك ڕابکشێم، ئارام ئارام بخەوم، خەونی خۆش خۆشی تێدا ببینم... "** ل ٣

**" ئەو دیو جیهان، جیهانی خۆشگوزەرانی و بەزم و شایی، جیهانی خەیاڵ و مۆسیقا و گۆرانی، جیهانی ئافرەت و فریشتە و کەنیشکی جوان جوان.."** ل٨١

لەگەڵ ئەوەشدا ڕۆماننووس هەڵوێستی خۆی لە بەرانبەر ئەو دیاردەیە دەردەبڕێت و ئەو دیاردەی کۆچکردنە بە نەخۆشی سەردەم ناوزەد دەکات و پێی وایە کە بەهۆیەوە گشت جوانییەکانی وڵات فەرامۆشکراوە و خۆشی نابەخشن:

**" جاران ئەو کاتەی هێشتا ئەو نەخۆشییە درمە نەهاتبووە وێزەمان و مەستی نەکردبووین، بەبینینی چلوورەی گوێسەبانەکانی بەرماڵان شاگەشکە دەبووم... "** ل١٢

ڕۆماننووس له ( دوانامەی دێوەرەیەك)دا هێڵی گێڕانەوەکەی لەسەر باسکردنی ناخی کۆچکەرەکەوە داڕشتووە و لەوێوە ڕوئیا و بۆچوونی خۆیمان بۆ ئاشکرا دەکات، واتە بە گرێدانی هەردوو چەمکی کۆچ و مەرگ، باس لە حاڵەتێکی دەروونی و کۆمەڵایەتیی مرۆڤی کوردمان بۆ دەکات لەوێوە نەهامەتییەکانی ئەو مرۆڤەمان بۆ وێنا دەکات بەوەی کە ناخی هەموو تاکەکان ژیانێکی دیکەیان هەیە و زۆر جیاوازە لەگەڵ ژیانی دەرەوەی جەستە فیزیکییەکەی، چونکە مێژووی هەر تاکێکی ئێمە (ئەو مێژووە شاراوەیەیە کە لە ناخی خۆماندا هەڵی دەگرین) [1].

**پێکهاتە و ڕەگەزەکانی ڕۆمانەکە:**

ڕۆمان بەشێوەیەکی گشتیی لەچەند ڕەگەزێکی سەرەکیی پێکهاتووە لەوانە (ڕووداو، کەسایەتیی، کات، شوێن.. تاد) لێرەدا هەوڵ دەدەین لەناو ڕۆمانەکەدا یەکە یەکە تیشك بخەینە سەر ئەو ڕەگەزانە:

**ڕووداو:**

ژیان بریتییە لە زنجیرە ڕووداوێك و هەر تاکێکمان لەو کاتەی کە لەدایك دەبین تا کاتی مردنمان لەناو ڕووداوگەلێك دەژین کە تژییە لە خۆشی و ناخۆشی، بەواتایەکی دیکە ڕووداو خاڵی سەرەکیی پێکهێنەری ژیانە و بەبێ ئەو ڕووداوانە ژیان واتایەکی لەخۆ ناگرێت.

---

١- چاوپێکەوتن لەگەڵ جەبار جەمال غەریب، گۆڤاری ڕامان ژمارە ١٤١، خولی سێیەم، ساڵی سێزدە، شوباتی ٢٠٠٩ . ل ٧٤

(د. شوکریە ڕسووڵ) لەبارەی ڕووداوەوە دەڵێت: (برێتییە لەو زنجیرە گۆڕانەی بەسەر ڕەوشتی کەسەکاندا دێت لەپێوەندی و کارلێك کردنیان لەگەڵ ئەو شوێنەی تێیدا دێن وەدەچن)[1].

ڕۆماننووس (حوسێن عارف) چیرۆکی بە ژمارەی ڕووداوەکان پێناسە دەکات: (چیرۆك برێتییە لەو زنجیرە ڕووداو و کارەساتانە(بەدیوی ناوەوەو دەرەوەدا) کەبەسەر کەسەکانی چیرۆك دێن تێدەپەڕن) [2].

کەواتە ڕووداو ڕەگەزێکی گرینگی ڕۆمانە و بەبێ بوونی، ڕۆمان واتایەکی ئەوتۆی نامێنێ، چونکە ( ئەگەر لەدەقی ڕۆمانێکدا ڕووداوێك یان چەند ڕووداوێك هەبوو، ئەو پێویست بەوە دەکات کە کەسایەتیی هەبێ بۆ جێبەجێکردنی و ڕۆڵ گێڕانیان لە وازیکردنی ئەنجامدانی ڕووداوەکان. کە ڕووداو و کەسایەتیت هەبوو، ئەوە پێویست دەکات شوێنیشت هەبێ و کارەکەی لەسەر ئەنجام بدەی، کە ئەو سێ ڕەگەزەشت هەبوو، ئەوا بەشێوەیەکی پێویست کات خۆی ڕەپێش دەکات) [3]. واتە ڕووداو گشت ڕەگەزەکانی دیکەی ڕۆمان لەخۆ دەگرێت و هەموو ئەو ڕەگەزانە خۆیان لە نێو چەقی ڕووداوەکە دەبیننەوە.

کۆچکردن و بەجێهێشتنی وڵات، چ بە زۆرەملێ بێت و چ لە ئەنجامی فشارو فاکتەری کۆمەڵایەتیی و ڕامیاری و ئابووری بێت، ڕووداوگەلێکن لە کەتواردا ڕوویانداوە و قوربانی و کارەساتی لێکەوتووەتەوە، ساتەوەختی ئەو کارەساتانە بەچەندین ڕەهەندو ڕاڤەوە بەبچڕبچڕی لەمێشکی ئێمەدا تۆمارکراوە. وەلێ (بەشێك لەو ڕەهەند و لایەنانە دیار و بەرهەستن و بەشێکی زۆرتریان نادیار و نابەرهەستن،بێگومان هیچ چیرۆك و ڕۆمانێك و بەرهەمێکی تری ئەدەبی و هونەری ناتوانێت ڕووداوێکی کەتواری، بەتایبەتی کارەساتێکی تراژیدی، وەك چۆن ڕوویداوە، بیگێڕێتەوە یان بنووسرێتەوە، ئەوەی کە دەگێڕدرێتەوە یان لە بەرهەمێکی ئەدەبی وەك چیرۆك و ڕۆمان دەنووسرێتەوە خودی ڕووداوەکە نییە، بگرە تەسەوری نووسەرە لە

---

١- د. شوکریە ڕسووڵ، ئەدەبی کوردی و هونەرەکانی ئەدەب، **مطابع التعليم العالي، اربيل، ١٩٨٩**، ل١٥١ .

٢- حوسێن عارف، چیرۆکی هونەری کوردی، **دار الحرية للطباعة، بغداد، ١٩٧٧**، ل١١١ .

٣- حوسێن سابیر عەلی، بینای ڕووداو لە ڕۆمانی مۆسیفای مەرگی ناوەختەدا، گۆڤاری ڕامان، خولی سێیەم، ساڵی دوازدە ژمارە ١٢٥ تشرینی یەکەمی ٢٠٠٧ . ل ٦٢

ڕووداوەکە)[1]. واتە ڕۆماننووس چیرۆکە کەتوارییەکە تێکەڵی خەون و ئارەزووی و خەیاڵی خۆی دەکات و (ئەو ڕووداوانە بەو شێوەیە دەردەبڕێ کە لەگەڵ ئاوات و ئارەزووی خۆی بگونجێ، چونکە هەر چیرۆکنووس و نووسەرێك شێوازی نووسین و ستایلی تایبەتی خۆی هەیە لە هی کەسانی تر)[2].

دیارە جوانییە ئەفسوناوییەکەی ڕۆژئاوا، ڕەوتی ڕووداوی کۆچکردنی بەپەلەتر و خێراتر دەکات، ئەوەش هۆکارێکە بۆ بڕیاردانی ناڕاست و نادروست کە دەبێتە هۆکاری نانەوەی کارەسات و قوربانی کەوتنەوە، هەر بۆیە لە سەرەتای ڕۆمانەکەوە تا کۆتایی مەرگ ئامادەییەکی زیندووی هەیە و لەگەڵ کۆچکردنەکە ئاوێتە بووە و یەك ئەوی دیکە تەواو دەکات و هەر دێرێکی بۆنی مەرگی لێ دێت و لەپەنای هەر وشەو پیتێکدا مەرگێکی وەنەشەیی خۆی حەشارداوە، لەگەڵ ئەوەشدا ڕۆماننووس ئەو مەرگ و کۆچەی لەگەمەیەکی زیهنیدا پێچاوەتەوە، ڕاستە خوێنەر لەسەرەتاوە هەست بە مەرگی نەوزاد دەکات، وەلێ دارشتن و چینینەوەی ئەو مەرگە نازانێت. ڕۆماننووس بەچەندین ئاماژەو نیشانەی جیاوازەوە ئەو مەرگە دەهۆنێتەوە و چەندین ئەگەر و دەروازە لەبەردەم مێشکی خوێنەر والا دەکات:

**"ئەوانەی سەفەر دەکەن پارەی پێشین نادەن، بەلام من پێش وەختە پارەکەم بۆ بژاردووە و لەم کارەشدا لەگەڵ خەڵکدا جیاوازیم بووە.."** ل ٤

چیرۆکبێژ سەرنجی خوێنەر بۆ ئەوە ڕادەکێشێت کەلەبەر ئەو جیاوازییە ڕەنگە قاچاخچییەکە مامەڵەیەکی تایبەتی لەگەڵ نەوزاد بکات، تەلسیمەکە بەهۆی هاوڕێیەکانی نەوزاد ئالۆزتر دەبێت بەوەی کە ئەو هاوڕێیانەی کە لەگەڵی کۆچ دەکەن بەنەناسراوی پیشان دەدرێن بۆ ئەوەی تەنیا تیشك لەسەر نەوزاد بێت و هەموو هۆش و بیری خوێنەر لەگەڵ ئەودا ڕووداوەکان تەی بکات:

**" نەدەمناسن و نەدەیانناسم.."** ل٥

تا کۆتایش تەنیا یەك لەو هاوڕێیانەمان پێ دەناسێنێ، ئەویش کە لەکۆتایی چاپتەری (٨) واتە لەناوەڕاستی ڕووداوەکەیە:

---

١- تەوەری چیرۆکی کوردی، گێڕانەوەی کارەساتەکان، گۆڤاری ئایندە، ژمارە ٧٤ ئەیلوولی ٢٠٠٧ . ل ٧٨.

٢- محەمەد ئەحمەد حەسەن، بینای ڕووداو لە چیرۆکدا، گۆڤاری ڕامان، خولی سێیەم، ساڵی یازدە، ژمارە ١١٠ کانوونی یەکەمی ٢٠٠٦ . ل ١١١

**" خۆم ناوم شەمسەدینە بەشەمسەدین چاوشین ناسراوم.."** ل ٦٥

لەگەڵ ئەوەشدا مەرگ سەنتەری بوونی ڕووداوەکە پێکدەهێنێت و ڕۆماننووس هەر لەیەکەم پیتەوە تا دوا پیت بەیانی مەرگمان بۆ دەکات و بەسەدان جار، جاڕی مەرگ ڕادەگەیەنێت:

**"هاکا کەوتم و شکام، وردو خاش بووم و دوا هەناسەم دوور لە ئازیزان دا.."** ل ١٨

**"خوا دەزانێت ئێمەش چیمان بەسەر دێت و کام دڕندە و ملۆزم، کام تارمایی مردوو دەبێتە ڕۆحمان و کەی و چۆن دوا هەناسە دەدین.."** ل٢١

**"ئەو باڵندانەی دەمێك لێمان نێزیك دەکەونەوە و دەمێك دوور دەڕۆن، یەکەمین هاوڕێ و دوا هاوڕێمانن و هاوڕێمان بوون.. "** ل٥٠

ڕۆماننووس ئەو مەرگەی ئاوێتەی چەندین پرسیاری گوواتاوی دەکات و وەکو گەمەیەك لەگەڵ خوێنەر بەکاری دەهێنێت و وەکو ئەوەی کە ئایا دەبێ لەم سەفەرە بەچی بگەن و جارێکی دیکە بە شارو ماڵ و گەڕەکەکەیان شاد ببنەوە؟ یاخود دەبێت چ کارەساتێك چاوەڕوانیان بکات؟، وەڵامی ئەم پرسیارانە خوێنەر دەخاتە نێو مەراقەوە و هەوڵ دەدات هەرچی زووە ئاشنای دواساتەکانی ڕووداوەکە بێت.

چاپتەرە کۆتاییەکانی ڕۆمانەکە ( ٩-١٠-١١) جوانترین حاڵەتی دەروونی و وێنەی ناخی مرۆڤمان پیشان دەدەن. لەو سێ چاپتەرەدا کە بەڕای من بەهێزترین بەشی ڕۆمانەکەن و ڕووداوەکانیان دەگەنە لوتکە و لەوێوە ئیدی گرێیەکان بەرەو کرانەوە دەچن. سەرەتاش نەوزاد دان بەهەڵەکەی خۆیدا دادەنێت:

**" پیاو ئەگەر شارەزا نەبێت هەڵەی گەورە دەکات و ئەنجامەکەش خۆی هەڵیدەگرێتەوە، دەبەنگ نەبوومایە بۆ خۆم دەدایە دەست ئەو قۆڵبڕە.."** ل٦٩

دواتر پەنجەی پەشیمانی دەگەزێت:

**" خەتای خۆمان بوو، ویست و ئیرادەی خۆمان تەسلیم بە قاچاخچییەکی بێ بەزەیی و دڵ ڕەق کرد، فەرهودی کردین و منەتی نەزانین، تازە پەشیمانی دادمان نادات.."** ل٨١

دواتر بەهۆی ونبوونیان لەناو بەفردا و نەخۆشکەوتنی نەوزادەوە ڕووبەڕووی مەرگ دەبنەوە، ئەو مەرگەی تەنیا بە خەونێك وەکو دێوەرەیەك بەجیهانەکەی خاریجی دەگەیەنێت، ئەو مەرگەی ڕۆماننووس لەسەرەتاوە هزرمان بۆ لای ڕادەکێشێت، تەنانەت لە ڕووداوی ئەو چیرۆکانەی کە وەکو بەشێك لە تەکنیکی چیرۆك لەناو چیرۆکدا و بەهۆی فلاش باکەوە

دەگێڕدرێنــەوە هــەمووی مەرگــە، وەکــو کــوژران و بزربــوونی تــەرمی خــاڵی نــەوزاد کــە لەساڵی(١٩٦٣) لە قوتابخانەی کشتوکاڵی بەکرەجۆدا کوژرا، هەروەها چیرۆکی دوا ساتەکانی مەرگی داپیرە و باپیرەی، هەروەها چیرۆکەکانی خۆی کــە هــەموو پێــنج شــەممەیەك ســەردانی گۆڕستانەکانیانی کردووە.

بێگومان هەر ڕووداوێك مەبەست ( تیم)ی خۆی هەیــە، ڕۆمــاننووس لێــرەدا مەبەســت و واتایەکەی ڕووداوی کۆچکردن و مەرگە، مەرگ وەکو پرسێکی مەزنی مرۆڤایەتی، کە مرۆڤ لە دێرزەمانەوە هەوڵی بێسوودی ڕزگاربوونی لەدەست دەدات، وەلێ لــەپاڵ دیارخســتنی کێشــەی مەرگ، ڕووداوەکە قسەکردنێکە لەبارەی ئەو فاکتەرانــەی دەبنــە ئەنجامــدانی ڕووداوگــەلێکی وەکو کۆچکردن و جێهێشتنی وڵات و دیارخستنی هەستی ڕۆژانەی ئەو کەسانەیە کە کۆچکردن وەکو بیرۆکەیەك لە مێشکیان خول دەخواتەوە.

ئەگەر لە ناونیشانی ڕۆمانەکەش وردبینەوە دەبینین ئەو دوو وشەیەی کە (سەلاّح عومەر) بۆ ناولێنانی ڕۆمانەکەی هەڵیبژاردوون گوزارشتکردنە لە ڕووداو و کەسایەتی، چونکە ناونیشان گوزارشتکردنە لەکات و شوێن و ڕووداو، ناونیشانی ئەو ڕۆمانە ئاماژەیە بۆ چــەمکی کــۆچ و مەرگــەوە. (دوانامــە) مــردن دەگەیــەنێت کــە برێتییــە لــە دوا ڕووداو و (دێــوەرە)ش وەکــو چەمکێکی فولکلۆری کوردی تەوزیف کراوە و ئاماژەیە بۆ کۆچکردنی کەسێك لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە، بەواتایەکی دیکە دوانامــە مەرگــەو دێــوەرەش کۆچــکردنەکەیە و دیــارە لەناونیشانەکەشدا ڕووداوی مەرگ پێش ڕووداوی کۆچکردن خراوە:




بەکارهێنانی نامە کە لە ناونیشانەکەیەوە هاتووە، لەکۆتایی ڕۆمانەکــەدا دەردەکــەوێت و بەسەر گۆڕی کۆچکەرەکانەوە بووە:

**" كاغەزێك بەسەر سەنگەرەكەوە بوو، با دەیهێنا و دەیبرد، كاغەزەكە نەختێك تەڕبوو، بەڵام پیت و وشەكانی دەخوێندرانەوە و وەك ئاوازێكی غەمگین هەر چوار كەناریان دەهەژاندەوە و دەنگێكیش دەهات.." ل ٩٥**

ئەودەنگە، هەر دەنگی گێڕەرەوە خۆیەتی لەسەر زاری كەسایەتیی نەوزادەویە كە هەژموون و ئاوات و ئارەزوو و ناكامەكانی ناخی خۆی بەیان دەكات، لێرەدا ڕۆماننووس بەشێوەیەكی تەقلیدی هونەری نامەی بەكارنەهێناوە، بگرە بەكارهێنانی نامەكەی وەكو تەكنیكێك بۆ پەیامگەیاندن برێتییە لەو نامەیەی كە كەسایەتییەكە نەیتوانیوە بینووسێت و بیخاتە سەر كاغەزێك و پوولی لێبدات و بەكەسێكدا ڕەوانی بكات[1]، ئەمەش كەشێكی سیحری و فانتازی بە ڕۆمانەكە داوە.

## گێڕەوە و دایەلۆگ و مەنەلۆگ:

ئەو سێ یەكە پانتاییەكی فرەوان لە تەكنیكی گێڕانەوە داگیر دەكەن، بەهرە و شێوازی نووسەر دیاری دەكەن لە چنینی ڕووداوەكان و گێڕانەوەیاندا، ئەگەر سنووری ئەو سێ یەكەیە لەو ڕۆمانەدا دیاری بكەین، ئەوا دەبینین زیاتر پانتایی دەقەكە بەسەر یەكەی گێڕەوە دابڕاوە، ئەمەش زیاتر لەبەرئەوەیە كە سروشتی ڕووداوەكە و تێكەڵبوونی بەخەیاڵ و فانتازیا و ئەفسانە وای خواستووە.

یەكەی گێڕانەوە بەئاسانی لەو ڕۆمانەدا دەناسرێتەوە و هیچ ئاماژەو نیشانەیەك بۆ جیاكردنەوە و تۆماركردنی ئەو یەكە دانەنراوە و ئاساییانە دەست پێ دەكات و تا كۆتایی ڕۆمانەكە بەردەوام دەبێت:

" ئاسمان تەماوی، دیوارەكان، پەنجەرەكان، دەرگاكانن، لەناو تەم و سپێتی بەفردا ڕەنگ سپی و سڕ سەریان نابووە كۆشی ئاسمان، جگە لەكون و قوژبنە تاریكەكان نەبێت، دەنا شوێنێك نەبوو سپی نەكردبێت.. "ل ٥

لەبارەی دایەلۆگەوە، بەهۆی بەكارهێنانی ( هێڵ یان داش یان خەت)، وەك (ـ) بە ئاسانی پەرەگرافی دایەلۆگ دەناسرێتەوە، ئەمەش لەزۆربەی پەرەگرافەكانی دایەلۆگەكە بەكارهێنراوە. لە دایەلۆگێكی نێوان نەوزاد و براكەیدا هاتووە:

---

١- هەمان سەرچاوەی ل٧٨

" – بڕیارم داوە ئەم شەو بڕۆم، هاتووم دوا خواحافیزبوونتان لێ بخوازم.
ئەی بابە و منداڵەکانی..

کە ڕۆیشتم تۆ پێیان بڵێ، ئێستە بزانن وەك جاران دنیا بەسەر خۆیاندا دەهێننە خوارەوە.... " ل ٤٤-٤٥

لە چەند پەرەگرافێکدا بەنیشانەی (:) یان وشەی ( گوتم، گوتی) لەگەڵ نیشانەی کەوانە ( )، دایەلۆگەکان ڕۆنراون. لە دایەلۆگێکی نێوان نەوزاد و یەکێك لە هاوڕێیە کۆچکەرەکانیدا هاتووە:

" چەند جارێك داوام لێ کرد و لێی پارامەوە:

خۆی بەمنەوە هیلاك نەکات و بۆ خۆی بڕوات، بگرە لەم دەردو مەینەتییە ڕزگاری دەبێت، بەڵام ئەو لێم تووڕە بوو، نەیهێشت پتر بڵێم و گوتی: ئەدی هاوڕێ بۆ چی هاوڕێیە.." ل ٦٣

مەنەلۆگیش ( ئەوکاتە لە دایك دەبێت کە دایەلۆگ نەتوانێت گوزارشت لە زمان و باری دەروونی ناخە پەنگ خواردووەکەی کارکتەر و نووسەرەکە بکات) [١]. پەرەگرافەکانی مەنەلۆگ بە بەرکاهێنانی دەستەواژەی ( ئەوکاتە، بیرم دێت، کێ دەڵێت... تاد) هەروەها لەشێوەی پرسیار کردن لەخود و وەڵامدانەوەیان لەو ڕۆمانەدا دەناسرێنەوە، واتە هیچ نیشانەیەك لەشێوەی کەوانە یاخود هەر جۆرە هێمایەکی دیکە بۆ مەنەلۆگ بەکارنەهاتووە، نەوزاد لەبەر خۆیەوە دەڵێت:

" **کێ دەڵێت جارێکی دی گوێمان لە دەنگی باوك و منداڵ و ژنەکانمان دەبێتەوە..**" ل ٦٤

" **ئەو کات مرۆڤێکی دیکە بووم، بیرکردنەوەم جیاواز و خەیاڵم وەك ئێستە نەبوو، وام دەزانی شتێك لە دنیادا نییە شکست بە مرۆڤ بهێنێت..** " ل ٦٢

ئەم ڕۆمانە لە (٢٨٥٤) دێر پێکهاتووە، (٢١٧٨) دێڕی تایبەتن بە گێڕەوە، (٣٨٣) دێری تایبەتن بە دایەلۆگ، (٢٩٣) دێڕی تایبەتن بە مەنەلۆگ. ڕێژەی سەدییەکەشی بەمشێوەیەیە: (٧٦.٣٪) ڕێژەی گێڕەوە، ( ١٣.٤٪) ڕێژەی دایەلۆگە و ( ١٠.٣٪) ڕێژەی مەنەلۆگە. ئەم ڕێژانە لە چاپتەرەکاندا بەمشێوەیە:

---

١- پەروین عەبدوڵڵا، ڕەگەزەکانی دراما لە شیعری لیریکی کوردیدا، دەزگای چاپ و بەخشی سەردەم – سلێمانی ل٨١

| چاپتەر | گێڕەوە | مەنەلۆگ | دایەلۆگ | کۆ |
|---|---|---|---|---|
| ١ | ١٧٠ | ٥ | ٧٢ | |
| ٢ | ٢٢٦ | ٦ | ٢٤ | |
| ٣ | ٢٥٤ | سفر | ٦ | |
| ٤ | ٣٣٠ | ١٢ | ٥ | |
| ٥ | ١٧٨ | ١٨ | ٤ | |
| ٦ | ١١٥ | ١٥ | ١٣ | |
| ٧ | ١٦٩ | ٣١ | ١٩ | |
| ٨ | ١٠٥ | ٣١ | ٧٤ | |
| ٩ | ١٤٧ | ١٨٩ | ٩ | |
| ١٠ | ٢١٩ | ٤٠ | سفر | |
| ١١ | ٢٦٥ | ٣٦ | ٦٧ | |
| کۆی گشتیی | ٢١٧٨ | ٣٨٣ | ٢٩٣ | ٢٨٥٤ |
| ڕێژەی سەدی | ٧٦.٣٪ | ١٣.٤٪ | ١٠.٣٪ | ١٠٠٪ |

**کەسایەتیی:**

کەسایەتیی ڕۆڵێکی گرینگ لە تانوپۆی ڕۆماندا دەگێڕێت و کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر خوێنەر هەیە، چونکە ئەو کەسایەتییەی کە ڕۆماننووس دروستی دەکات، کەسایەتییەکی کەتواری نییە، ئەو کەسایەتییەی کە ڕۆماننووس لەناو ڕووداوەکاندا دەیسوڕێنێت، تەنیا بوونێکی فیزیکی لە نێو دەقی ڕۆمانەکەیدا هەیە، وەلێ هاوشێوەی ئەو لە کەتواردا هەیە و ڕۆماننووس بیرۆکەی ئەو کەسایەتییەی لەو هاوشێوەیەی کە لەکەتواردا هەیە بۆ دێت، بۆیە نیشاندانی ئەو کەسایەتییانە و هەڵسوکەوتیان پێویستی بەوە هەیە کە هەڵسوکەوتەکانیان مەنتقی بێت و خوێنەر قەناعەتیان پێ بکات.

کەسایەتیی سەرەکیی ئەم ڕۆمانە ( نەوزاد)ە کە هەم ڕۆڵی سەرەکیی لە گێڕانەوەی ڕۆمانەکەدا دەگێڕێت و هەمیش ئەرکی گێڕەوەش دەبینێت. نەوزاد خاوەنی ماڵ و منداڵەو فەرمانبەرە، واتە ڕۆماننووس کەسێکی ئاسایی نێو کۆمەڵگەیەکەی، کە خاوەن ڕۆشنبیرییەکی دیاریکراوە وەرگرتووەو کردوویەتییە کەسایەتیی سەرەکیی ڕۆمانەکەی. ئەگەر ئاوڕێکیش لەو کاتانە بدەینەوە کە ڕەوتی کۆچکردن لەوپەڕی فرەوانی و توندی خۆیدا بووە، کە مەبەستمان ساڵانی نەوەدەکانە کە بەهۆی ئابلوقەی ئابووری و بێکاری و شەڕو نەهامەتییەکانە، ئەوا دەبینین چینی فەرمانبەران و مامۆستایان لەو ساتەوختانەدا چینێك بوونە لە رووی ئابوورییەوە لەوپەڕی گوزەران خراپیدا بوونەو تەنانەت بەحوکمی ئەوەی کە ئەم دوو چینە، چینێکی ڕۆشنبیری نێو کۆمەڵگەیانن و زووتر هەست بە تەنگوچەڵەمەکان دەکەن، تەواوی فشار و پاڵەپەستۆ ئابووری و کۆمەڵایەتییەکان ڕەنگدانەوەیەکی توندیان لەسەر هەبووە. لێرەشدا ڕۆماننووس لە ڕێگەی پیشاندانی کەسایەتیی نەوزادەوە، ئێش و ئازاری ئەم دووچینەی بۆ کێشاوین.

کەسایەتیی لەگەڵ ڕووداودا کار لەیەکتر دەکەن و یەکتریش تەواو دەکەن، بۆیە جاری وا هەیە ڕووداو کار لەسەر کەسایەتییەکان دەکات و ڕێڕەوی ژیانیان دەگۆڕێت، و جاری واش هەیە کە کەسایەتییەکان کاریگەریی و قورسایی خۆیان لەسەر ڕووداوەکاندا دادەنێن و ڕێچکەی ڕووداوەکان بەرەو ئەو شوێنە دەبن کە خۆیان مەبەستیانە. لەم ڕۆمانەدا ڕووداو کاریگەرییەکی بەهێزی لەسەر کەسایەتییەکان هەیە و تەنانەت ڕووداوێکی هاوشێوەی کۆچکردن کاریگەریی لەسەر ژیانی کەسایەتییەکە هەیە و دەیخاتە بەردەم دوو ڕێگەی مان و نەمانەوە، کەسایەتییەکان بەهۆی فشاری ئابووری و کۆمەڵایەتیی و کولتوورییەوە کاتێك بڕیاری کۆچکردن دەدەن، ئیدی تەسلیمی ڕەوتی ڕووداوەکان دەبن و ڕووداو کاریگەریی لەسەر چارەنووسیان دەدانێت، بەواتایەکی دیکە کەسایەتییەکە بەرگەی هێزو زەبری ڕووداوەکان ناگرێت. واتە لێرەدا کەسایەتییەکە، کەسایەتییەکی گەشەسەندووە، کەسایەتیی گەشەسەندوو لە ڕۆماندا (هیچ جیاوازی نییە لەگەڵ کەسایەتیی کەتواری لە کاریگەربوون بە ئەزموونەکان و لە تێپەڕبوون بە ڕووداوەکانی ڕۆماندا، بە نەرێنی یاخۆ ئەرێنی بێت لە گەشەکردنەکەی، کە بەرەو باڵابوون یان بەرەو نەمان بڕوات، ئەو کەسایەتییەی کە لە کۆتایی ڕۆماندا دەیبینین هەمان ئەو کەسایەتییە نییە کە لە سەرەتادا بینیومانە، ئەو گۆڕانکارییەی کە ڕوویداوە

دەرئەنجامی ئەو ئەزموونەیـە کـە بەسـەریدا هـاتووە بـەباش و خراپییـەوە )[1] واتـە ڕەوتـی ڕووداوەکە گۆڕان بەسەر هزر و بیرکردنەوەی نەوزاددا داهێنێت و ڕووداو و چارەنووسی داورۆژی بۆ دیاری دەکات، بەواتایەکی دیکە کەسایەتیی لەو ڕۆمانەدا کەسایەتییەکی چەسپاو نییە کە هیچ کاریگەریی نەبێت بە ئەزموون و ڕووداوەکانەوە، بگرە کەسایەتیی نـەوزاد زیـاتر لەگـەڵ ڕووداوەکان پێدەگات و گەشە دەکات.

کەسـایەتیی سـەرەکیی نێـو ڕۆمانەکـە، کەسـایەتییەکی ئـەرێنی، چـونکە لـەژێر بارودۆخێکەوە بریاری کۆچکردن دەدات کە لە توانای خۆی گـەورەترە و هـەروەها زیـانی ئـەو بڕیارەش بە پلەی یەکەم بۆخۆیەتی، واتـە زیـانی بـۆ کـەس نییـە، لەبەرانبـەردا کەسـایەتیی قاچاخچـی کەسـایەتییەکی نـەرێنی و یـاری بـە چارەنووسـی ژیـانی خـەڵکی دەکـات و بـە خوێنساردییەوە مرۆڤەکان ڕەوانەی ڕێگەی هات و نەهات دەکات و تەنیا بـیر لـە بەرژەوەنـدی خۆی دەکاتەوە.

کەسایەتیی لاوەکی لەم ڕۆمانەدا ڕۆڵێکی گرینگیان هەیـە و (زۆر جـار وەك کەسـایەتیی سەرەکیی بەشداری لە گێڕانەوەی ڕووداوەکان دەکات و شتە شاراوەکانی کەسایەتیی سـەرەکیی دەخاتەڕوو و هانی دەدات بۆ ئەوەی کارەکە بە چالاکی ئەنجام بدات، هەروەها ئەو بیروڕایانـەی کە لەدەروونی کەسایەتیی سەرەکییدا هەیە لەکاتی پێوەندیی کردنی ئەم کەسایەتییانە لەگـەڵ کەسـایەتیی دەروبەریـدا ئاشـکرا دەکـات)[2] کەسـایەتیی لاوەکـی لـەناو ئـەم ڕۆمانـەدا ئەمانەن(هاوڕێیە کۆچکەرەکانی، یوسف و ڕێبوار و ئالانی برای، باوکی، ئـازادی کوڕەپـووری، قاچاخچی). سەرەڕای ئەمانەش چەندین کەسایەتیی دیکەش هەن ڕۆڵی لابەلایان پێسپێردراوە، وەکو (ماڵی نەوزاد، داپیرەو باپیرەی، خەڵکی کۆڵان و کوڕە دراوسـێیەکانی، نـازەنینی کچـی پووری، پووری نەوزارد، فالچی، کامـەران و تـارای کچـی) کـە ئەمانـە بەگشـتیی ڕۆڵێکـی گرینگیـان هەیـە لەبەرەوپێشـبردنی ڕووداوەکانـدا. بۆیـە دەبیـنین لـەپاڵ کەسـی سـەرەکیی ڕۆمانەکە، چەندین کەس ڕووداوەکان دەگێڕنەوە، واتـە تـەواوی گێڕانەوەکـە بـەر یـەك کـەس ناکـەوێت، بگـرە کەسـایەتییەکانی دیکـەی وەکـو (براکـانی، کـوڕە پوورەکـەی، بـاوکی،

---

١- عبدالله خمار، تقنيات الدراسة في الرواية، الشخصية، اصدار خاص بالأنترنيت، الجزائر .٢٠٠٥.

٢- پ. ی. د. هیمداد حوسێن، دەروازەیەك بۆ ڕەخنەی ئەدەبی کوردی، دەزگای توێژینەوەو بلاوکردنەوەی موکریانی، چاپخانەی خانی ـ دهۆك، چاپی یەکەم ٢٠٠٧. ل١٤٩

هاوڕێکانی...) بەشداری لە گێڕانەوەی ڕووداوەکان دەکەن. واتە کەسەکانی ڕۆمانەکە ئەوەندە زۆر نین، وەلێ هەموویان کەم تا زۆر بەشداری لە گێڕانەوەی ڕووداوەکان دەکەن.

سەرەتای گێڕانەوەکە، ئەرکی کەسایەتیی سەرەکیی لە نووسەر بەرجەستە دەکات، کە بە ڕاناوی کەسی یەکەمی تاکە (من) دەست پێ دەکات و دواتر ئەرکی گێڕانەوەکە بە کەسایەتیی سەرەکیی دەبەخشرێت، ئەویش ئەو کاتەیە، کە نووسەر ناوی ئەو کەسایەتییەمان لە کۆتایی چاپتەری چوارەمدا بۆ ئاشکرا دەکات:

**"گریان لە گەروومدا قەتیس ما، فرمێسك لە چاومدا نەما و وشکیان کرد، کەچی نەوزاد نەگەڕایەوەو شوێن بزربوو"** ل٣٨

هەروەها کەسانی دیکەش بەهۆی ڕاناوی سێیەمی تاك ( ئەو) و ڕاناوی یەکەمی کۆ ( ئێمە) بەشداری لە گێڕانەوەکەدا دەکەن.

## شێوازی زمان:

شێوازی داڕشتنی زمان یەکێکە لە بنەماکانی ڕۆمانی سەرکەوتوو، چونکە (ئەو خوێنەرەی ڕۆمانێك دەخوێنێتەوە بێگومان کاتێکی زۆری دەوێ بۆ خوێندنەوەی، جا ئەگەر ئەو نووسەرە زمانەکەی پاراو و بێ گرێ و سادە و چڕ بێ ئەوا زیاتر وا لەخوێنەر دەکات خولیای خوێندنەوەی کارەکە بێ) [1].

زمان لەم ڕۆمانەدا، زمانێکی پڕ لە هێما و مەبەست و ئامانجە و زمانێك تژییە لە خەیاڵ و فەنتازیا و ئەفسانە، ئەو زمانەی لەم ڕۆمانەدا بەکارهاتووە زیاتر زمانێکی زانیاریی و وەسفە، لێ لە بەرگێکی سیحری وا داپۆشراوە، کە وەك موگناتیسێك خوێنەر بۆ کەشوهەوای نێو دەقەکە کێش دەکات و پێوەستی ڕووداوەکانی دەکات.

مۆسیقا و هارمۆنییەتی وشە و ڕستەکانی نێو ڕۆمانەکە بایەخێکی زۆری پێدراوە و هەوڵ دراوە چەشەیەکی مۆسیقایی بەبەر ڕۆنانی ڕستەکان و وشەکاندا بکرێت بەشێوەیەك کە هەر وشەو ڕستەیەك ڕیتمێکی مۆسیقی لەناخی خۆیدا حەشارداوە، کردەی مۆسیقی لە چیرۆکەکەدا زیاتر خۆی لە بەرزونزمی دەنگ دەبینێتەوە، بەتایبەتیش لەو کاتانەی کە زیاتر گێرەوە (پاڵەوان) خۆی قسە دەکات، واتە لەناو دایەلۆگ دەنگی مۆسیقا زیاتر مات و گپە، ئەو یەکە زیاتر بۆ بەخشینی زانیارییەکانە، بەڵام یەکەی گێرەوە و مەنەلۆگ کەزیاتر ناخی شڵەژاوی

---

١- سابیر ڕەشید، ڕۆمانی کوردی، خوێندنەوە و پرسیار، بەشی یەکەم، دەزگای ئاراس ـ هەولێر ل١١٤

پاڵـەوان بـەدیار دەخـات کـردەی مۆسـیقا دەنگێکـی بـەرزی وەرگرتـووە، بەتایبـەتیش لـە دووبارەکردنـەوەی چـەند وشـە و ڕسـتەیەك کـە هارمۆنییـەتێکی جـوانی لـەناو دەقەکـەدا دروستکردووە.

مۆسیقای نێو دەقەکە زیاتر خۆی لە سـەروا دەبینێتـەوە کـە هـەم بـۆ پێـدانی کەشـێکی شیعرییە و هەمیش بۆ ڕیتم و هارمۆنییەتی دەقەکە نووسەر بەکاریهێناوە، وەك:

"مێشکمان، دڵ و دەروونمان دەحەسایەوە، پەنجەو قاچەکانمان گورو تینی پـێ دەگەیشـت و جەستەمان دەبووژایەوە..." ل١٩

لێرەدا سەروایەکە لەناوان هەردوو وشەی (دەحەسایەوە، دەبووژایەوە)دایە کـە برێتییـە لـە سەروای(یەوە) و مۆسیقایەکی خرۆشێنەری بەو ڕستەیە بەخشیووە.

لە نموونەیەکی دیکەدا:

"شتێکی دیکە نییە بەسەر سـەرمانەوە، بەتەنیشـتمانەوە، بخولێنـەوە، دەورمـان بـدات، لوولمان بدات، بمان ترسێنێت، بمان بەزێنێت.. " ل٤٣

ئەو سەروایانەی لێرەدا بەکارهاتووە برێتییە لە (انەوە) لـە هـەردوو وشـەی (سـەرمانەوە، بەتەنیشتمانەوە) و هەروەها سەروای (ێنێت) لەهەردوو وشەی (بمان ترسێنێت، بمان بەزێنێت).

ڕۆماننووس زمانێکی بێ گرێ وگۆل و سادەو چـڕی بـەکارهێناوە، بـۆ ئەمـەش پـەنای بردووەتە بەر بەکارهێنانی ڕستەی کورت و چڕکراوە و هەوڵی داوە بەکەمترین وشـە، زۆرتـرین واتا و دەلالەت و ئاماژە بە خوێنەر بگەیەنێت، وەك:

"هەتاو هەڵنایەت، تـاریکیی چـاوەکانمان، بـەرپێمان، بـەفری دەوروبـەرمان بتوێنێتـەوە، تەنیایی خەریکە دەمانکوژێت، دەمانبرێت.."ل٥٧

"وەرە پێش، کوا مەچەکت، دەستت بێنە، نا برۆ دواوە.. برۆ وازم لـێ بهێنـە و لـێم دوور کەوە..." ل٧٥

هەروەها ڕۆماننووس زمانی داڕشتنی پەخشانی لەگەڵ زمـانی شـیعریدا ئاوێتـەو تێکـەڵ کردووە و سنوورەکانی نێوانیانی کاڵ کردووەتەوە، لە گەلێك شوێنی نێو دەقەکـەدا گێڕانـەوەی بەشیعر سپاردووە. وەکو لە چاپتەرەکانی (٧،٤،١١،١٠،٩)دا شیعر ڕووداوەکان و وەسفەکانی نێو گێڕانەوەی لە ئەستۆ گرتووە.

لە زمانی ڕۆمانەکەدا ڕۆماننووس کەمتر پەنای بۆ بەکارهێنانی وشـەی بێگانـە بـردووە، مەگەر چەند وشەیەکی کەم نەبێت کە ئەویش زیاتر بە فۆنەتیکی کوردی نووسراوەنەتەوە، وەکو ( سکوت، سوکنایی،حوزوور، ئامان، غەیب، خـەیار، حـیرس، فـەرحنایی، حـەرف.. هتـد).
هەروەها چەند هەڵەیەکی زمانەوانی تێدا بەرچاو دەکەوێت، کە ڕەنگە زیـاتر ئەمانـە هەڵـەی چاپ بن، هەر چەندیشە ئەم هەڵانە یەکجار کە من و کاریگەرییان لەسـەر ڕۆنـانی دەقەکـەدا نییە، وەکو:

" ڕەنگە ئەگەر لە بارودۆخێکی دیکە بووایە، یان کاتێکی دیکە و شوێنێکی دیکـە... " ل١٧

لێـرەدا ( دیکـە) بەشـێوەیە هەڵەیـەو ڕاسـتییەکەی ( دیکە)یـە، واتـە بەیـەك (ی) دەنووسرێتەوە، لەتەواوی ڕۆمانەکەدا دیکە بە دوو (ی) نووسراوەتەوە کە هەڵەیە.

" یان بتوانم چییتر هنگاو بنێم.." ل٨٦

(چییتر) بە دوو(ی) هەڵەیەو ڕاستییەکەی ( چیتر) ە بەیەك (ی) و (هنگـاو)یش هەڵەیـە و ڕاستییەکەی( هەنگاو)ە.

" بەیانی زوو ڕۆژی دوات لەماوەیەکی کەمدا.." ل٩٦

(ڕۆژی دوات) هەڵەیە و ڕاستییەکەی (ڕۆژی دواتر)ـە.

" پیت و دێڕو وشە لێك دابرێن و هێزی نەبێت بیانگەیەنێتەوەیەك... "ل٥

(هێزی) هەڵەیە و ڕاستییەکەی ( هێزێ)یە.

**کات:**

کاتی دیاریکراوی ڕۆمانەکە لەو شەوە دەستپێدەکات کە نەوزاد بڕیاری کۆچکردن دەدات و تا ئەو کاتەی کە لەناو بەفردا دەمرێت دەخایەنێت کە حەوت ڕۆژ و حەوت شەوی پێدەچێت:

" حەوت شەو و حەوت ڕۆژە لەهەوڵی خۆرزگارکردنین... " ل٤٧

" ئەمڕۆ بوو  بە حەوت شەو وحەوت ڕۆژ بەڕێوەین و دەڕۆین... " ل٦٥

ئەو کاتە، کـاتی ڕووداوی چـیرۆکەکەیە، دواتـریش بـارودۆخی چـەند مانگێـك دوای ئـەو کۆچکردنە دیاری دەکات:

" چەند مانگێك بەر لە ئەمڕۆ نەوزادی برام بەهەمان شێوە ماڵ و خانووی خـۆی فرۆشـت و... " ل٤٤

واتە کاتی ڕۆمانەکە دیاریکراوە، وەلێ لەناو ئەو کاتە دیاریکراوەشدا چەندین کاتی دیکـە دەستنیشان دەکرێن و سنووری کاتەکە فراونتر و مەودا درێژتر دەکەن، ئەو کاتـە دیـاریکراوەی نێو ڕۆمانەکە بەکاتی ناوەوەی ڕۆمان ناسراوە و کاتـە زیادەکـەش بـە کـاتی دەرەوەی ڕۆمـان ناونراوە[1]. ئەو کاتانەی کە ڕۆماننووس بەهۆی زیـادکردن و باسـکردن لێیانـەوە مەودایـەکی فرەوانی بە کاتی دیاریکراوەکە بەخشیووە، بەهۆی باسکردنی چیرۆکەکەکانی خاڵی و باپیرەی و داپیرەی و هەروەها گەڕانەوە بۆ یادەوەرییەکانی منداڵی و باسکردنی ژیانی مرۆڤی سەردەمانی کۆن و ژیانی هاوڕێیـەکانی، بـەهۆی بـەکارهێنانی تەکنیکـەکانی فـلاش بـاك و مەنـەلۆگ و هونەرەکانی شەپۆلی هۆشەوە.

کات لەم ڕۆمانەدا پارچە پارچەکراوە، واتە کاتەکە لە ئێستەدا ئاراستەی بەرەوە ڕابردوو و داهاتوو لە جووڵاندایە و چەسپاو و سەقامگیر نییە و (بەتێکەڵ بوونی لەگەڵ ئەفسانە و خەون و خەیاڵ لە ریـڕەوە باوەکـەی (ڕابـردوو ـ ئێسـتە ـ داهـاتوو) لادەدات و پـێش و پـاش یـان پێچەوانەی تێدەکەوێ) [2]، واتە کاتەکـە لـە ئێسـتەدایە و بـەهۆی گەڕانـەوە بـۆ ڕابـردوو و پێشخستنی بۆ داهاتوودا چەسپاوی تێدا دیارناکەوێت، بـۆ نموونـە لـە سـەرەتای ڕۆمانەکـەدا هاتووە:

"شەوێکی درەنگ و بەفراوی سارد بەڕێ کەوتم" " یەکەمجار چوومە ماڵی ئـازادی کـوڕی پوورم.." ل٣

واتە کاتی گێڕانەوەکە شەوە، بەڵام دواتر بەهۆی تەکنیکی گەڕانـەوە یـان دواخـراو کـاتی هاتنی بۆ ماڵی ئازادی کوڕی پووری دیاری دەکات:

" کاتێك ماڵی خۆمانم بەجێهێشت بەیانی بوو..."" لـەماڵی ئـازاد تـا ئێـوارە خـۆم بـە هەندێك شتەوە خەریك کرد.." ل٤.

واتە نەوزاد لە بەیانییەوە چۆتە ماڵی ئازادی کوڕی پووری و لەشەودا کە ئەو کاتە دەسـت بە گێڕانەوەی چیرۆکەکە دەکات هاتووەتە دەرەوە و دەستی بە کۆچەکەی کردووە.

لە چاپتەری ( ٥) دا چیرۆکبێژ لە گێڕانەوەی ڕەوتی سەفەرکردنەکەیدایە و دەڵێت:

---

١- سابیر ڕەشید، ڕۆمانی کوردی، خوێندنەوە و پرسیار، بەشی یەکەم، دەزگای ئاراس ـ هەولێر، ل٢٢٠.

٢- حوسێن سابیر عەلی، ڕەنگدانەوەی ڕیالیزمی سیحری لە ڕۆمانەکانی کاکە مەم بۆتانیدا، نامەی ماستەر ل١٤٩.

" ئەمە چەند شەو و ڕۆژێکە بەڕێوەین... " ل٤٠

دواتر لەسەرەتای چاپتەری (٦)دا بەبەکارهێنانی تەکنیکی پێشخراوی کات، کاتەکە بەرەوە داهاتوو پێشدەخرێت و باس لە چەند مانگێك دوای ئەو کۆچکردنەی نەوزاد دەکرێت:

"چەند مانگێك بەر لە ئەمڕۆ نەوزادی برام بەهەمان شێوە ماڵ و خانووی خۆی فرۆشت و... " ل٤٤

هەروەها بەهۆی بەکارهێنانی مۆنتاژی بکاتەوە لەسەر مەنەلۆگ، گێڕەوە ئاراستەی کاتەکانی ئاوێتەی یەکدیی کردووە، لە ئێستەوە بەرەو ڕابردووی بردووە:

" جاران ئەو کاتەی هێشتا ئەو نەخۆشییە درمە نەهاتبووە وێزەمان.. " ل١٢

لێرەدا نەوزاد بەهۆی مەنەلۆگەوە کاتەکەی دەباتەوە ڕابردوو و باس لە پێش هاتنی دیاردەی کۆچکردن دەکات، لەکاتێکدا کە خۆی لە کۆچکردندایە.

بێگومان ئەو وەرزەی کە نەوزاد کۆچەکەی تێدا ئەنجام داوە زستان بووە، وەلێ لەناو ڕۆمانەکەدا ڕاستەوخۆ ناوی زستان نەهاتووە، بگرە بە هۆی سەرما و ڕەشەبا و بەفرو زریان و بارانەوە ئاماژەی بۆ کراوە.

بەگشتیی لە ڕۆمانەکەدا ئەو کاتانە دەستنیشان کراون (شەو، بیست و چوار سەعات، بەیانی، دوو ڕۆژ پاشتر، تا ئێوارە، (١)ی دوای نیوەشەو، دووساڵ پترە، ڕۆژ تا ئێوارە، وەختی خۆی، لە ئێوارە تا بەرەبەیانی دووەم ڕۆژ، شەوی یەکەم، سێ مانگ، پێنج شەممە، هەینی، دەقیقەو سەعات، ساڵی ١٩٦٣، جاران، پاش چەند ساڵێك...هتد).

**شوێن:**

شوێن لەم ڕۆمانەدا بایەخێکی یەکجار گەورەی هەیە و خاوەن دەسەڵاتێکی فرەوانە لە چنینی ڕووداوەکاندا، چونکە کرۆکی چیرۆکەکە گواستنەوەی شوێنە، بێزاربوونە لە شوێنێك لەبەر هەر هۆیەك بێت و سەفەرکردنە بۆ شوێنێکی دیکە، واتە شوێن کاریگەرییەکی هزری و مادی بەسەر کەسایەتییەکانەوە هەیەو پانتایی و شانۆی سەرەکیی ڕووداوەکان پێکدەهێنێت. لەم ڕۆمانەدا چەندین شوێن بەدی دەکەین:

١ـ شوێنێکی کەتواری: ئەو شوێنەیە کە پاڵەوان لێی بێزارە و چەندین جار هەوڵی داوە لێی دەرباز بێت کە ئەویش شارو وڵاتەکەی خۆیەتی، واتە شوێنەکە ناهۆگرە و نەویستراوە.

٢ـ شوێنێکی خەیاڵی: ئەو شوێنەش دەرەوە (خاریجە) هەرچەندە ئەو دەرەوەیە شوێنێکی کەتوارییە و بوونێکی فیزیکی هەیە، بەڵام لەبەرئەوەی گەیشتن پێی سەرکێشییەکە بە ڕۆح، هەروەها پاڵەوانیش لەم ڕۆمانەدا نایگاتێ و لەدواجاردا تەنیا بەخەون وەك دێوەرەیەك پێی دەگات، واتە ئەو شوێنە خەیاڵییە و هۆگرە و ویستراوە.

٣ـ شوێنێکی بزر و نادیار: ئەو شوێنەیە کە ناو بەرزایی و چیاکانەوەیە و هەرچەندە بەشێوەیەکی گشتیی دیارە کە ناوچەکانی سەر سنوورە، بەڵام ناوچەکانی سەر سنوور زۆرن، بۆیە دیارینەکردنی بەواتای بزر و نادیار دێت، سەرەڕای ئەمەش ڕووداوی بەمەرگبوونیان لەوێ دەبێت، بۆیە ڕۆماننووس یش هەوڵی داوە ئەو شوێنە بە نادیاری بهێڵێتەوە:

" کێ دەزانێت ئێرە کۆێیە ؟یان کەوتووەتە کوێ؟ ئێرە لەسەر نەخشەی بووندا بوونی نییە، کەس نازانێت چەند لەشارو ئاوەدانی دوورە؟ ناوی چییە..."ل٤١. ئەوشوێنە، شوێنێکی ناهۆگرە و نەویستراوە.

لە ناوەڕاستی ڕووداوەکاندا، کاتێك نەوزاد و هاوڕێکانی لەناو چیاکاندا ڕووبەڕووی مەرگ دەبنەوە، ئەوکات پەشیمان دەبنەوە، بەمە شوێنیش لەرووی دەروونییەوە گۆڕانی بەسەردا دێت و ئەو شوێنەی کە شارو وڵاتەکەیانە و بە ئاواتبوون لێی دەرباز بن و لەلایان ناهۆگرو نەویسترابوو، بارەکە بەهۆی کاریگەریی ڕووداوەکانەوە لەلایان پێچەوانە دەبێتەوە و دەبێتە هۆگر و ویستراو، لەگەڵ ئەوەشدا هەندەران هەر لەباری هۆگری و ویستراوی دەمێنێتەوە، وەلێ نە بە هەندەران دەگەن و نەدەشتوانن بگەڕێنەوە شار و وڵاتەکەی خۆیان.

لەبەرئەوەی شوێن کاریگەرییەکی مەزنی لەسەر دەروونی کۆچکەرەکان، هەیە و هەروەها قورساییەکی تەواویشی لەسەر ڕووداو هەیە، دەبینین ڕۆماننووس مۆنتاژی شوێن دەکات و شوێنەکان لەناو یەکدا دەهێنێت و لە دیمەنێکەوە بۆ دیمەنێکی دیکەی شوێن گۆڕانکاریی دەکات، بۆ نموونە کاتێك نەوزاد ئەو شەوە ماڵی ئازادی کوڕی پووری جێدەهێڵێت و کوچە و کۆڵانەکانی شارەکەی تەی دەکات بۆ ئەوەی بگاتە ماڵی قاچاخچییەکە، بەهۆی بەکارهێنانی تەکنیکی فلاش باگەوە، شوێنەکە دەگوازرێتەوە:

"کە منداڵبووم بەدەیان جار دایکم دەیبردمە سەر گۆڕی خاڵۆی جوانەمەرگم، ئەو خاڵۆیەی بە نامورادی لەرووداوێکی دڵتەزێندا بەناحەق دوور لە زێدی باب وباپیرانی ساڵی ١٩٦٣ لە قوتابخانەی کشتوکاڵی بەکرەجۆ کوژرا.." ل٨

شوێن لێرە لەناو کوچەو کۆڵانەکانی شارەوە گواستراوەتەوە بۆ گۆڕستان و دواتر بۆ ناوچەی بەکرەجۆ و لەوێش بۆ قوتابخانەی کشتوکاڵی بەکرەجۆ.

یاخود بەهۆی بەکارهێنانی مۆنتاژی شوێن لەسەر مەنەلۆگ، شوێنەکان دەگوزارێتەوە، بۆ نموونە کاتێك نەوزاد لە ڕێگە و لەناو بەفردایە لەمەنەلۆگێکدا هاتووە:

"لەوێ هیچمان کەم نەبوو، خاوەن پیشە و موڵك و ماڵ بووین، خانوو وحەوشەو باخچەمان هەبوو..."ل٢١

لێرەدا شوێن لەناو چیاکانەوە گواستراوەتە بۆ شار و خانوو و حەوشە و باخچەکەیانەوە.

بەگشتیی لەڕۆمانەکەدا شوێنگەلێکی زۆر دیاریکراون، وەك( شار، ماڵی ئازادی کوڕی پووری، ماڵی خۆیان، خاریج، باخچەی ماڵەوەیان، ژووری نازەنین، کۆڵان و شەقامەکانی شاروگەڕەکەیان، ماڵی قاچاخچییەکە، باخچەی گشتیی، گۆڕەستان و نەخۆشخانە هۆڵ...هتد).

## ئەفسانە و فۆلکلۆر:

مەزراندنی بابەتەکانی ئەفسانە و پەند و بابەتە فولکلۆرییەکانی دیکە لە بۆتەی دەقی ڕۆماندا، ڕۆڵێکی گرینگ دەگێڕێت لە دەوڵەمەندکردنی ئەدەبی نەتەوایەتیدا، بەکارهێنانی ئەفسانە وەکو هێمایەك و وێنەیەك، کە تێکەڵ بە بونیادی دەقەکە کرابێت، بە یەکێك لە ڕەگەزە سەرەکییەکانی ڕۆمانی نوێ دادەنرێت، چونکە ئەفسانە (شوێنێکە ململانێیە دەروونییەکانی تێدا ڕوودەدەن) [1]، ئەمەش زیاتر ڕۆماننووس دەستکراوە دەکات لە دەربڕینی ناخی کەسایەتییەکانی، لەم ڕۆمانەدا ئاماژە بە چەند ئەفسانەیەك، یان هێمای ئەفسانەیەك دراوە، وەك:

" دەبوو بە ماری حەوت سەر و چەقۆ و خەنجەر.... " ل١٧

ئاماژەدان بە ماری حەوت سەر، کە لە زۆرێك لە ئەفسانەکاندا مار وەکو هێمایەك بەکارهاتووە و ئامادەیی هەیە.

" سەردەم سەردەمی پەیدابوونی خدری زیندە و سیمرخ و بەرانی سپی نییە.." ل٦٧

---

١- د. ڕانیا سەمارە، ئەفسانە و ئەدەب، و: حوسێن سابیر عەلی، چاپخانەی شەهاب ـ هەولێر ل٣٠

ئاماژەدان بە ئەفسانەکانی ( خدری زیندە) و ( سیمرخ) و ( بەرانی سپی) و جەختکردنەوە لەسەر ئەوەی کە ئیتر زەمانی ئەمانــە بــۆ ئەنجامــدانی کــار و کــردەوەی بــاش بەسەرچــووە و نایەتەوە.

"ئێمەش ئەحمەد نین حــەوت ســاڵ بــەدوای دێــوی ڕەش دا بچــینە چــیای قــاف و ئینجــا بەسەلامەتی بگەڕێینەوە..)ل٦٧

ئاماژەدان بە ئەفسانەی ئەحمەدی شێخ و دێوی ڕەش و ئاماژەدان بە توانای لەبن نەهاتووی ئەحمەددەوە.

داستان و حیکایەتە فولکلۆرییــەکانی کــوردیش بەهــەمان شــێوە وەکــو هێمایــەك لــەناو ڕۆمانەکەدا ئاماژەی بۆ کراوە، وەك:

"سیامەند، سیامەندی چاوگەش

سیامەند، سیامەندی بەژن زراف.."ل٨٣

باسکردنی داستانی خەجێ و سیامەند و هاوارکردنێکە بۆ سیامەند تا لــەو نەهامەتییــەی سەفەرەکە ڕزگاریان بکات.

هەروەها بەکارهێنانی ڕاستەوخۆی لاوك و حەیران، وەك:

" دەلۆی لۆ... دەلۆی لۆ

لە چیای سیپانێ

لەبنی پێمەوە تا تەوقی سەرم بەفرە و بەفرە و بەفر..." ل٨٤

" دەلۆی لۆ.... دەلۆی لۆ

لە خۆم غەریب و بێ کەسێ..." ل٨٧

تێکەڵکردنی دابونەریتی میللی و کۆن و ئاوێتەکردنی لەناو دەقەکەدا، وەکو زیــارەتکردنی گۆڕستان لە هەموو ڕۆژانی پێنجشــەمەو ئامــاژەدان بــەو چــیرۆکە ئەفســانەییەی کــە گوایــە مردووەکان لەو ڕۆژەدا زیندوو دەبنەوە و چاوەڕوانی کەسوکارەیان دەکەن:

"بە مەزەندی خۆی مردوو لە ڕۆژی دیاریکراودا زیندوو دەبێتەوە و بــەیانی زوو خــۆی بــۆ دیداری چاوەڕوانکراو ئامادە دەکات." ل ٨

هەروەها بەکارهێنانی ژمارە (٧) کە لە ئەفسانە و حیکایەت و داب و نەریتی میللەتانــدا خاوەن چەندین هێمای جۆراوجۆرە ژمارە(٧) تەنیا ژمارەیەکی بیرکاری و ژمێریاری نییە، بگرە

لە بیروباوەڕی میللەتاندا بە درێژایی مێژوو بارێکی وەرگرتــووە لــە چوارچــێوەی بەکارهێنانــە باوەکانی، بە تایبەتیش لە هەردوو بواری ماتماتیك و ژمێریاریدا چۆتە دەرەوە) [1]. وەك:

"ئەمرۆ بوو  بە حەوت شەو و حەوت ڕۆژ بەڕێوەین و دەڕۆین..."ل٦٥

نەوزاد لە کۆچکردنەکەیدا حەوت شەو وحەوت ڕۆژی پێچووە و تا لەدواییدا کۆچــی دوایــی کردووە.

بەکارهێنانی پەندی پێشینان  بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ، وەك:

"ئاو لە چۆڵەوانی ئاوەدانییە، ئەی نەیانگوتووە ئاو و ئاوەدانی.." ل٤٠

ئــەو پەنــدە ( ئــاو و ئــاوەدانی) ڕۆمــاننووس بــەبێ زیــادە خســتنە ســەرێك یــاخود دەستکاریکردنێك و کەمکردنەوەیەك وەکو خۆی بەکاریهێناوە.

وەرگرتنی بەشێك لەپەندو تێکهەڵکێشــکردنی لەگــەڵ ئــەو مەبەســتەی کــە ڕۆمــاننووس دەیەوێت دەریببڕێت، وەك:

"دنیا ڕۆژێك و دوو ڕۆژ نییە، ئەمە دنیایە و چاو بە چاو دەکەوێتەوە.."ل٤٠

ئەمەش ئەو پەندەیە، کە دەڵێت: (چاو بەچاو دەکەوێت، بەڵام چیا بە چیا ناکەوێت) لێرەدا ڕۆماننووس ئاماژەی بە ڕاکردنی قاچاخچییەکە داوە، کە ئــەوانی بەجێهێشــتووە و ســووننەتی ژیانیش وایە کە ڕۆژێك هەر دێت باجی ئەو زوڵمە بدات و ئەگەر کۆچکەرەکانیش نــەبن، ئــەوا کەسوکارەکانیان چاویان پێی بکەوێتەوە و تۆڵەیان بۆ بکەنەوە. واتە ڕۆماننووس تــەنیا بەشــی یەکەمی ئەو پەندەی بەکارهێناوە، بەڵام بەدووبارکردنەوەی هەمان مەبەستی پەندەکەوە.

## سروشت و وەسفکردنی سروشت:

سروشت هەموو ئەو دەوروبەرو ژینگەیەمان دەگرێتەوە کە تێیــدا دەژیــن و دەکەونــە بــەر هەستەکانمان و کاریگەریی لەسەر ناخ و دەروونمان جێ دەهێڵن. لەسەرەتای بوونەوە سروشــت و مرۆڤ هاوکێشەی یەکتر بوونەوە و سروشت وەکو شانۆیەك وابووە بۆ مرۆڤ کە هەوڵی داوە ئاوات و ئامانجەکانی خۆی تێیدا جێبەجێ بکات، بۆیە نووسەران لەناو بەرهەمەکانیانــدا بایــەخێکی تەواویان بە سروشت داوە، ئەمەش زیاتر وەکو چوارچێوەیەك بووە بۆ باسکردنی ڕووداوی چیرۆك

---

١- حوسێن سابیر عەلی، ڕەنگدانەوەی ڕیالیزمی سیحری لە ڕۆمانەکانی کاکە مەم بۆتانیدا، ل٧٥

و کەسایەتییەکانیان، بۆیە (لەزۆر حاڵەتدا دەبینین کە نووسەر وەسفکردنی سروشتی وەکو هۆکارێك بۆ گوزارشت کردنی لە حاڵەتی مرۆڤ بەکارهێناوە) [1].

سروشت بەگشتیی لە دوو بەشی سەرەکیی پێك دێت: اـ سروشتی بێ گیان. ٢ـ سروشتی زیندوو [2]. سروشت لەم ڕۆمانەدا پێگەیەکی بەهێزی هەیە و وەسفکردنی سروشت بەهەردوو جۆرەکەیەوە تێکەڵ بەخەیاڵ و فەنتازیا کراوە، چەندین دیمەنی جوان تژی لە ئێستەتیکای لێدروستکراوە و لەو ڕێگەیەوە ناخی کەسایەتییەکان تێکەڵ بە دەریا و بەفر و باڵندەو سیمرخ بووە و هەست و سۆزی ئەوانی بۆ دیارخستووین، چونکە وەسفکردنی سروشت( ڕاڤەکردنی هەستە مرۆڤایەتییەکانە، ڕاڤەکردنێك دەگاتە قووڵایی دەروونەوە) [3]و ئەو وەسفکردنە لە ڕۆمانی نوێدا (لەناخی کەسیەتییەکانەوە هەڵدەقووڵێ و گوزارشت لە شتەکانی دەرەوەی ئەوان دەکات بە قەد ئەوەی کە ئەو شتانە کار دەکەنە سەر دەروونی ئەوان و کاردانەوەی تێدا دروست دەکەن) [4]. بۆ ئەم مەبەستەش ڕۆماننووس دیاردە و گیاندارێکی زۆری لەگەڵ کەسیەتییەکاندا ئاوێتە کردووە و سیماو خەسڵەتەکانی سروشتی بەرەنگە هەمەجۆرەکانەوە ڕەنگدانەوەیان لەسەر ناخی کەسایەتییەکاندا بەجێ هێشتووە، سەرەڕای ئەمەش لە کەرەستەو ڕەنگ و دیاردەکانی سروشتەوە چەندین تابلۆ و بۆرترێتی جوانی لێ دروستکراوە و هەست دەکەی لە بەرانبەر تابلۆیەکانی نێو پیشانگەیەکی سروشتی دای.

"شەوێکی درەنگ و بەفراوی سارد بەڕێ کەوتم و پشتم لە هەموو شتێکی شارەکەم کرد..."ل٣

ئەمە یەکەم دێری ڕۆمانەکەیە، کە دیارە بە وشەی (شەو) دەست پێ دەکات، کە ڕەگەزێکە لە سروشت. شەو سەرەتای کاروانی ڕۆیشتنی نەوزادە بەرەو هەندەران. هەڵبژاردنی شەو

---

١- **عبداللة خمار، فن الكتابة تقنيات الوصف، اصدار خاص بالانترنت، الجزائر،٢٠٠٥.**

٢- د. فازیل مەجید مەحموود، سروشت لە شیعری گۆران، چاپ و بەخشی سەردەم ت ـ سلێمانی٢٠٠٧ ل ١٥

٣- د. **فاضل عبود التميمي، البناء السردى في الشعر** شێرکۆ بێکەس، چاپ و بەخشی سەردەم ـ سلێمانی٢٠٠٨ ل ١٢

٤- نەجم خالید ئەلوەنی، بینای کات لە سێ نموونەی ڕۆماننی کوردیدا، چاپ و بەخشی سەردەم ـ سلێمانی٢٠٠٤ ل ٣٠٣

چەندین واتا و دەلالەت لەخۆ دەگرێت، شەو تاریکییە و تـاریکیش جـۆرە تـرس و حاڵـەتێکی پەشۆکاوی بەخۆوە گرتووە. شەو واتای تاریکی و دواکەوتن و ناخۆشی دەگەیـەنێت، زەنگێکـە بۆ بەدواداهاتنی کارەسـات و ویشـوومەیەك. لـەرووی دەروونیشـەوە مـرۆڤ هەسـت و سـۆزی لەشەودا زۆر جیاوازەترە وەك ئەوەی لەرۆژدا هەیەتی و بەسروشتی خۆی مرۆڤ لەشـەودا زیـاتر ڕۆدەچێتە ناخی خۆی و زیاتر گوێ بۆ هەست و نەستەکانی ناوەوەی خۆی شل دەکـات و زیـاتر بەرەو بیرکردنەوەی قووڵ دەچێت. ئەم خاڵە دەستی ڕۆماننووس زیاتر کراوە دەکات بـۆ ئـەوەی بچێتە پەناگەو گۆشە دەروونییەکانی کەسـایەتییەکانی، دیـارە ئـەو شـەوەی نـەوزاد بڕیـاری کۆچکردنی داوە، شەوێکی ئاسایی نەبووە:

" شەوی ئاسایی شەوێکی تاریك و ڕەشە" "بەڵام ئەو شەوەی بەڕێوەیە ڕەشەباو کارەسـات بەداوی خۆیدا دەهێنێت" "شەوی ی سـپی نیشـانەی زۆرانبـازی و لاوازبـوون و ڕۆح کێشـانی بوونەوەری وەك ئێمەیە" ل٢٠.

لەشـەوەدا کـە نـەوزاد و هاوڕێکـانی وڵات جـێ دەهـێڵن سـەرەڕای ئـەوەی کشـومات و چۆڵوهۆڵە، بەفر و باران و ڕەشەبایە، ئەو بەفرو ساردییە تا دوا ساتەکانی مەرگیان چ لە شار و چ لەناو چیاکاندا بەردەوام دەبێت. ڕۆماننووس لە تەوزیفکردنی بەفر و باران و ئەو ساردییە بۆ نێو ڕۆمانەکـەی زیـاتر مەبەسـتی وێرانبـوون و هەڵوەشـاندنەوەی بـەها کۆمەڵایەتییـەکان و نائومێدی و تەنیایی و کەساسی ئەم وڵاتە دەگەیەنێت و هەر زوو بەهۆی ئەو ڕەشەبا و بەفرەوە کەسایەتییەکان دەخاتە نێو چاوەڕوانییەك بۆ هـاتنی کارەسـات و ناخۆشـی. هەرچـەندە بـەفر وباران لەدێر زەمانەوە واتای خێر و خۆشی و بەپیتییان گەیاندووە، وەلـێ ڕۆمـاننووس بـەفر و باران وەکو هێمای ستەمکردن و وێرانبـوون و زۆرداری بـەکارهێناوە و خۆشـی بـاس لـەمبارە دەکات و دەڵێت:

"ئاو لە هەر کوێ هەبێت ئاوەدانی لەوێیە، بەفریش بەهەمان شێوە،بەڵام لێرە بەفر بۆ ئێمە بووەتە سەرچاوەی ترس و گومان و..." ل٤٠.

"هەندێك جار سروشتیش دەبێتە دوژمنی مرۆڤ، بەفر و زریان و تاریکی، هەوراز و دڕنـدە وگورگ هەنگاو بەهەنگاو بەدوامانەوەن.." ل٧١

بێگومان نووسەر ئازادە لەوەی چۆن ئەو ڕەگەزانـەی سروشـت بـە چ مەبەسـت و واتایـەك بەکار دەهێنێت، ئەمە لە ئەدەبی کوردیدا لەلایەن شاعیرانەوەش ئەم ڕەگەزانە بەپێی مەبەست

و ئامانجی شاعیرەکان بەکارهاتووە، ئەوەتا گۆران بەهەمان شێوە بەفر بە ستەمکار لـە قەڵـەم دەدات:

درەختی هەڵوژەی بەفر داپۆشیوو
دارسێوی ڕازاوەی بە پۆیلان زیو
هەڵاڵەی وەراندن تەوژمی باران
وەك بووکی ڕووت کراو کەوتووتە گریان
هەتا: ئەمەیە دیمەنی وەشتی نیسان
پێشێلی ستەمە گشت شتێکی جوان[1]

هەروەها هێمنی شاعیر بە هەمان شێوە ناڕەزایی و نائومێدی خۆی لەدەست وەرزی زسـتان دەردەبڕی و دەڵێت:

ڕێبەندان! دیسان هاتیەوە سەرمان
ڕەقمان هەڵبێنێ دیسان لەسەرمان
بەسۆزی زریان پیاو دەکەی سڕ
بەکڕێوە و باکوت ئاژەڵ دەکەی قڕ
ڕێ و بان دەبەستی بەفر هەموو
لەبەر پەساران هەڵدەێنێ ڕنوو[2]

لەسروشتی بێگیاندا لـەناو ڕۆمانەکـەدا ئەمانـە بـەکارهاتوون: ( بـەفر، ئاسمـان، گـەڵای هەڵوەڕیو، مانگ، ئەستێرە، چلورە، ڕەشـەبا، فیکـەفیکی بـا، هـەور، لقـی دار، کـالبپتۆز، هەنجیر، دار بەڕوو، مازوو، دەریا، ئەشکەوت، تاڤگە، دۆڵ، چیا، بەرد، گەردەلوول، دەشتایی، کانیاو، ڕووبار، دارستان، دار پەرتەقاڵ، دارچنار، شووتی، خـەیار، گنـدۆرە، زیتـوون، تـرێ، ڕیحان، هەڵاڵە، بەیبوون، پەلکی پیاز، گەنم...هتد).

لەسروشتی گیانداریش ئەمانە بەکارهاتوون: (مێرووله، سەگ، پشیلە، ئاژەڵی کێـوی،کرم، قالۆنچە، مێشوولە، مشك، مار، باڵندە، ماری حەوت سەر، گـورگ، ماسـی، چـۆلەکە، داڵ، پەپوولە، ئێستر، گوێدرێژ، سیمرخ، مێش هەنگوین، مەڕ، مانگا، مریشك، ورچ، دوپشك، قوم

١- دیوانی گۆران، بلاوکرنەدەوەی پانیز، چاپی دووەم ١٣٨٥ — تەهران . ل ١٤٤
٢- دیوانی هێمن، چاپی یەکەم، دەزگای چاپ و بەخشی چوارچرا، سلێمانی ل١١٨

قومۆك، جۆبرِەكە، كۆتر، ولاّغ، بزنەكێوی، ئاسـك، سوێسـكە، تیتواسـك، ئەسـب، بولبـول، پەرسێلەكە...هتد).

بەكارهێنانی ڕەنگ لەم ڕۆمانەدا هێماو دەلالەتی خۆی هەیە و ڕەنگ (بۆ خۆی زمـانێكی تایبەتی خۆی هەیە) [1] ، هەر ڕەنگێك دەلالەت لە شتێك و ڕووداوێك دەكات. بـەكارهێنان و وەسفكردنی ئەو ڕەنگانە لەناو پانتایی ڕۆمانەكە جیا لەوەی كاریگەریی ناخی كەسـایەتییەكان دیاری دەكات، لەهەمان كاتیشدا وەكو ڕەگەزێك بەشداری لە پێكهێنان و چـێكردنی وێنـەكان دەكات و فەزایەكی فانتازی و ڕەنگاورەنگ لەبەردەم خوێنەر دورست دەكات.

---

١- عبداللة خمار، فن الكتابة تقنيات الوصف، اصدار خاص بالانترنت، الجزائر،٢٠٠٥.

**ئەنجام:**

١ــ ڕۆمانەکــە، تــەوزیفکردنی کارەســاتە، کارەســاتی کۆچــکردن، کــە میللــەتی کــورد بــەزۆرەملیٚ بیٚــت، یــان بــەهۆی فشــار و هۆکارگەلیٚکــەوە بــە ناچــاری وڵاتەکــەی خــۆی بەجیٚهیٚشتبیٚت.

٢ـ هەرچەندە کرۆکی ڕووداوەکە بریٚتییە لە کۆچکردن، وەلیٚ چەمکی مەرگ زۆر زاڵترە لــە چەمکی کۆچکردنەکە و هەر لەســەرەتاوە خویٚنــەر ڕووبــەڕوو دەکریٚتــەوە لەگــەڵ کارەســاتی مەرگیٚکی چاوەڕوانکراو، ئەگەر سەرنجی ناونیشانی ڕۆمانەکە بدەین دەبیــنین(دوا نامــە)، کــە ئاماژەیە بۆ مەرگ پیٚش (دیٚوەرە)، کە ئاماژەیە بۆ کۆچکردن کەوتووە.

٣ـ ڕەنگدانەوەی ڕیالیزمی سیحری و تەکنیکە نویٚیەکانی ڕۆمانی هاوچەرخ لە ڕۆمانەکەدا بەرچاو دەکەون، هەر لە بــەکارهیٚنانی ئەفســانە و فۆلکلــۆر و پەنــدی پیٚشــینان و زمــانیٚکی خەیاڵی و فەنتازی و هیٚمــادار و ڕســتەی کــورت و مۆنتــاژی کــات و شــویٚن و بــەکارهیٚنانی تەکنیکی خەون و فلاش باگ و.... تاد.

٤ـ شویٚن لەڕۆمانەکەدا پانتاییەکی فرەوانی گرتووە و کرۆکی ڕووداوەکەیە و کە بریٚتییە لە کۆچکردن لە شویٚنیٚکەوە بۆ شــویٚنیٚکی دیکــە، بەمــەش کاریگــەریی لەســەر هــزر و بڕیــار و ئامانجی کەسایەتییەکە هەبووە.

٥ـ سروشت بە هەردوو جۆرەکانییەوە گیاندار و بیٚگیان و وەسفکردنیان بایەخیٚکی تــەواوی پیٚدراوە و ڕۆمانەکە وەکو فەرهەنگیٚك دیٚتە بەرچاو کە ناوی دیاردە سروشتییەکانی تیٚدا تۆمار کرابیٚت.

٦ـ ئەم ڕۆمانە دەچــیٚتە خانــەی ڕۆمــانی کۆمەڵایــەتیی بــەهۆی ئــەوەی کــە کیٚشــەیەکی کۆمەڵگەی باسکردووە و تیشکی خستۆتەســەر و کاریگــەری و ڕەهەنــدەکانی ئــەو کیٚشــەیە، هەروەها ڕۆماننووس ڕای خۆشی لە بەرانبەر ئەو کیٚشەیە خستووەتە ڕوو و بــە نەخۆشــی نــاو بردووە.

# سەرچاوەکان

## پەڕتووك

**أـ کوردی:**


١ـ دوانامەی دێوەرەیەك، ڕۆمان، سەلاّح عومەر، لە بلاّوکراوەکانی مانگنامەی بەدرخان ٢٠٠٣.

٢ـ ڕەنگدانەوەی ڕیالیزمی سیحری لە ڕۆمانەکانی کاکەمەم بۆتانیدا، حوسێن سابیر عەلی، نامەی ماستەر، ٢٠٠٨.

٣ـ ڕۆمانی کوردی، سابیر ڕەشید، بەشی یەکەم، دەزگەی ئاراس ـ هەولێر ٢٠٠٧.

٤ـ بینای کات لە سێ نموونەی ڕۆمانی کوردیدا، نەجم خالید ئەلوەنی، چاپ و بەخشی سەردەم ـ سلێمانی ٢٠٠٤.

٥. ڕەگەزەکانی دراما لەشیعری کوردیدا، پەروین عەبدوڵلا، چاپ و بەخشی سەردەم، سلێمانی..٢٠٠٨

٦ـ ئەفسانە و ئەدەب، د. ڕانیا سەمارە، و: حوسێن سابیر عەلی، چاپخانەی شەهاب، هەولێر ٢٠٠٨.

٧ـ سروشت لە شیعری گۆران، د. فازیل مەجید مەحموود، چاپ و بەخشی سەردەم ـ سلێمانی ٢٠٠٧.

٨ـ دیوانی گۆران، بلاّوکراوەی پانیز، چاپی دووەم،تەهران١٣٨٥.

٩ـ دیوانی هێمن، چاپی یەکەم، سلێمانی، دەزگەی چاپ و بەخشی چوارچراـ سلێمانی.

١٠ـ د. شوکریە ڕسووڵ، ئەدەبی کوردی و هونەرەکانی ئەدەب، مگابع التعلیم العالی، اربیل، ١٩٨٩.

١١ـ حوسێن عارف، چیرۆکی هونەری کوردی، دار الحریە للگباعە، بغداد، ١٩٧٧.

١٢ـ پ. ی. د. هیمداد حوسێن، دەروازەیەك بۆ ڕەخنەی ئەدەبی کوردی، دەزگەی توێژینەوەو بلاّوکردنەوەی موکریانی، چاپخانەی خانی ـ دهۆك، چاپی یەکەم ٢٠٠٧.

**ب ـ عەرەبی:**

١٣ـ البناءُ السردی في الشعر شێرکۆ بێکەس، د. فاضل عبود التميمی، چاپ و بەخشی سەردەم، سلێمانی ٢٠٠٨.
١٤ـ عبداللة خمار، تقنيات الدراسة في الرواية، (١) الشخصية، اصدار خاص بالآنترنيت، الجزائر. ٢٠٠٥
١٥ـ عبداللة خمار، فن الكتابة تقنيات الوصف، اصدار خاص بالانترنت، الجزائر،٢٠٠٥
* گۆڤار:
١٦ـ گۆڤاری ڕامان، ژمارە ( ١٤١) خولی سێیەم، ساڵی سێزدە، شوباتی .٢٠٠٩
١٧ـ گۆڤاری ڕامان، خولی سێیەم، ساڵی دوازدە ژمارە ١٢٥ تشرینی یەکەمی ٢٠٠٧
١٨ـ گۆڤاری ڕامان، خولی سێیەم، ساڵی یازدە، ژمارە ١١٠ کانوونی یەکەمی ٢٠٠٦
١٩ـ گۆڤاری ئایندە، ژمارە (٧٤) ئەیلوولی .٢٠٠٧
٢٠ـ گۆڤاری کۆچ، ژمارە(٩) ی ساڵی .٢٠٠٨
٢١ـ گۆڤاری ( پێشکەوتن) ژمارە (١٥٦)ی بەهاری ٢٠٠٩.

# خوێندنەوەیەك بۆ نۆڤلێتی
# (خەوتن لەماڵی سەراب)ی سەباح مەجید

کولتووری داخراوی ڕۆژهەڵات سەرەڕای ئەوەی ئەقڵێکی دۆگما و داخراو بەرهەم دەهێنێت، لێ هەر بەو ئەقڵە دوگمایەشەوە هیچ تام و چەشەیەك بەو ژیانەی کە خۆی پێی وایە ڕاست و دروستە نابەخشێت و هەمیشە ژیان لە ڕۆژهەڵاتدا واتای مەرگ و کوشتن دەگەیەنێت، کوشتن نەك بە واتا فیزیکییەکەی، بگرە بەواتا دەروونیی و فیسولۆژییەکەیەوە. خۆشەویستی یەکێکە لەو مەسەلانەی کە لە ڕۆژهەڵاتدا نەك هەر حەرام و ناپەسندە، بگرە باسکردنیشی تا ئێستە بەو شێوەیە نییە کە ببێتە بابەتێکی ژیاری نێو کولتوورەکەیەوە، ئەو مەسەلەیە کە یەکێکە لە پرسەکانی بوونی مرۆڤایەتی، کەچی لەو ڕۆژهەڵاتی تژی لە مەرگ، خۆشەویستی و مەرگ هاوتەریبی یەکدی دەڕۆن، باوك و دەسەڵاتی باوك مەملەکەتێك لە دیکتاتۆرییەت و سڕینەوەی کەسایەتیی گەنجانی ڕۆژهەڵاتیان پێکهێناوە و ڕۆژانە پیادەی کوشتن و هەڵوەراندنی بەهرەی گەنجەکانی لێ دەتکێتەوە، ئەو ئەقڵە وەستاو و چەقبەستووانەی کە بەمرۆڤبوونی مرۆڤ و خۆشەویستی لە تۆلازەکانی وڵات و ڕۆژهەڵات بەگشتیی دەسێننەوە، ئەو ئەقڵە وەستاوانەی، کە خۆی لە ڕەمزی باوك دەبینێتەوەو لەوێوەوە وێنای دەسەڵاتێکی ژەنگگرتووی تۆز لەسەر نیشتووی ڕۆژهەڵاتمان بۆ دەکەن.

نۆڤلێتی (خەوتن لە ماڵی سەراب) ی سەباح مەجید، خستنەڕوویەکی ئەو کێشەیەیە و باسکردنی ئەو دەسەڵاتە دۆگما و چەقبەستوویەی ڕۆژهەڵات و بەراوردکردنییەتی لەگەڵ شارستانییەتی ڕۆژئاوا، ئیدی لەوێوە ڕۆدەچێتە نێو ناخی تاکی ڕۆژهەڵاتەوە کە لە دۆزەخێکی بەناو بەهەشتی ڕۆژهەڵات و بە هەشتێکی بەناو دۆزەخی ڕۆژئاوا ساتەکانی ژیانی بەمەرگ دەسپێرێت.

ئەم نۆڤلێتــە کــە لــە (٦٠) لاپــەڕەی قــەبارە مامناوەنـدی پێکـدێت و لەسـاڵی(٢٠٠٣) بڵاوکراوەتەوە، لە (٧) چاپتەر پێکدێت کە هەر چاپتەرێك ژمارەیەکی لەسەر دیاریکراوە و لــە (١-٧) بەردەوام دەبێت.

سەرەتا ئەگەر تێبینی ناونیشانی نۆڤلێتەکە بکەین( خەوتن لەماڵی سەراب) ئــەوا خــەوتن دەلالەتی مردن دەبەخشێت و ماڵی سەرابیش، ئەو ماڵەیــە کــە کەسـێکی ڕۆژهــەڵاتی لــەنێو شارستانییەتی ڕۆژئاوادا هەست بە سەراببوون و نامۆبوونی خودی خۆی دەکـات، بەواتایــەکی دیکــە خــەوتن واتــای مــردن دەگەیــەنێت لــەناو کولتوورێــك، کــە بــە چەشــە و پــەروەردەی کەسایەتییەکی ڕۆژهەڵاتی ناتەبا و نامۆیە.

لە سەرەتاشدا وەکو چوونە نێو باسێك و ئاشناکردنی خوێنەر بە هێڵی درامــی نۆڤلێتەکــە، پێشەکییەك لەلایەن (ستاری پیرداودی) نووسراوە و تێیدا ئامــاژەی بــەو کولتــوورە داخــراوەی کۆمەڵگەی ڕۆژهەڵاتی کردووە، کە کوشتنی گشت جوانییەکی لێ کەوتووەتــەوە، نووســەر بــە زمانێکی هێمائامێزی فەلسەفی ئەو پرسەی ورووژاندووە و هەوڵی داوە هــەموو کۆدەکـان بــۆ خوێنەر کەشف نەکات، شیکردنەوەی ئەو کۆد و دەلالەتانەی بۆ خوێنەر جێهێشــتووە، ســتاری پیرداود لەو پێشەکییەدا دەڵێت: "ئێمە کە مەحکومین بەوەی لــەژێر شمشـێرەکانی باوکێــك و لەناو کولتوورێکی دۆگما هەنگاوەکانمان ڕەنگرێـژ بکــەین، لــەناو هــەرەمی کولتوورێــك کــە هەمیشــە و هەمیشــە ســەرجەم هزرکردنــەوە و ڕامــان و ســەلیقە جوانــەکانمان دەکــرۆژێ و چاویلەکەکانی جوانیمان لێدەشکێ، کولتوورێك هەمیشــە ڕۆژانــە بێــت و کــە بەتــەرزێك لــە یەکڕەنگی داب و نەریت و قیــەم، دوور لــە کرانــەوە، ســەرجەم واتــا و کایــە فــرە ڕەنگــەکان دەستەمۆ بکات...)، ئیدی لەگەڵ خوێندنەوەی ئەم پێشەکییە بیرۆکەی سەرەکیی چیرۆکەکەت بۆ دیار دەکەوێت و بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ دەخرێیتــە بــەردەم کێشــە و گرفتێکــی کۆنینــەی هەمیشە زیندوو.

ڕووداوی سەرەکیی نۆڤلێتەکە بریتییە لە خۆشەویستییەکی بە ئاکـام نەگەیشــتووی نێـوان کوردۆ و ئاشتیخانی ئەڤینیار، کە هەردووکیان لە گوندەکەی خۆیان ( تەلخێمی گەورە)دا دەچنە دەرەوە، وەلێ هیچ کامێکیان بە ئــارەزووی خۆیــان ئــەو زێــدەی خۆیــان بــەجێ نــاهێڵن و لــە هەمانکاتیشدا لەیەکدی دادەبڕێن و دوور دەکەنەوە. ئاشتیخان باوکی لــە بــەر چــاولێبوون لــە سامانی عوسمان سەکران، کچەکەی بەزۆر بە کوڕەکەی دەدات و کــوردۆش لــە داخــان بــەرەو

ئەورووپا سەفەر دەکات، لەمپەری سەرەکیی ئەو خۆشەویستییە باوکەکان بوونـە، ئـەو باوکـە ڕۆژهەڵاتییانەی، کە تژین لە دژایەتی و چاوچنۆکی و تەماعکاری، ئەو باوکانەی کـە هـەموو شتێکیان بۆ خۆیـان بـە ڕەوا زانیـووە و بـۆ منداڵـەکانیان هـەرگیز قبـووڵی هـیچ شـتێکیان نەکردووە:

(باوکم هەر شەوێ لەلای ژنێکی بە دیدەنی کامڵبوون دەگەیشت، بەڵام کە باسی سـەڵتی و قولّتی من و کرمانجی چاو فرمێسکاوی و ئامانجی کەمانجەژەن دەکرا، کێچ دەچـووە کـەوڵی و دۆو دۆشاوی تێکەڵ بە یەکتر دەکرد) ل٢٤.

دەرگا لەبەردەم ئارەزوو و سۆزەکانی ئەو باوکانە کراوە بووە، وەلـێ ئەگـەر منداڵـەکانیان بیریان لە شتێکی دیکەی جیاواز بکردبایەوە، ئەو کێچ دەچووە کەوڵیان و ڕەتیان دەکردە.

کوردۆ دوای حەوت ساڵ ژیـان لـە ئـەورووپا کەچـی ناتوانێـت لەگـەڵ ژیـار و کولتـووری ڕۆژئاوایی هەڵ بکات و هەمیشە و هەمیشە هەست بە نامۆییـەکی قـورس دەکـات، لـێ لـە هەمانکاتیشدا توانای گەڕانەوەی بۆ نێو کولتووره داخراوەکەی ڕۆژهەڵاتی نییە:

(ئاخر منێك کە کولتوورێکی وەك قەڵا کۆنم لە پشتەوە بوو چـلۆن بمتوانیبوایـە تـەنیا بـە حەوت ساڵ جاڕی مەرگی ڕابگەیەنم؟ هەرگیز ئەمەم پێندەکرا..) ل٥١

هەر لەوێ لە شوێنێکی تاریك و نوتەکـەدا دەژیـت، کـە نووسـەر نـاوی نـاوە ئـەعراف، ئەعرافیش ئەو شوێنەیە کە لە قورئاندا وا باسکراوە، کە دەکەوێتە نێـوان بەهەشـت و دۆزەخ، ئەوانەی تێدایە کە خێر و شەڕیان وەکو یەکە. واتە ڕووبەڕووی جەدەلییەتێکی فەلسەفی قـووڵ دەبینەوە لە نێوان کولتووری ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵاتـدا. کەسـایەتیی کـوردۆ لـە نێـوان ئـەو دوو جەمسەرەدایە و ڕۆح و جەستەی لە یەکدیی دابڕاون و ناتوانێت خۆی بناسێتەوە:

(لە ئەعرافە ڕەزا قورسەکە دوو ئەزم بـەدی دەکـرد، یـەکێکیان لـەلای خۆرئـاوا سـواڵی خۆشبەختی دەکرد، ئەو خۆرئاوایەی مەملەکەتێکی فیردەوسی لە دۆزەخ چوو بـوو. ئەویدیکـە دەرۆزەی بەختـەوەری لـە خۆرهـەڵات دەکـرد، ئـەو خۆرهەڵاتـەی مەملەکـەتێکی دۆزەخـی فیردەوسئاسا بوو. هەستم دەکرد ئەو ئەزانە یەکێکیان جەستە و ئەوی دیکە ڕۆحی منی کلۆڵ و سیاچارەن)ل١٨

نووسەر لێرەدا پێی وایە گەڕان بەدوای خۆشبەختی نە لە ڕۆژهەڵاتـە و نـە لـە ڕۆژئاوایـە، بەلای ئەوەوە ڕۆژهەڵات دۆزەخێکی بەهەشتییە و ڕۆژئاواش بەهەشـتێکی دۆزەخـی، چـونکە

مەسەلەکە لێرەدا پێوەستە بە چیرۆکی یەکەم خولقاندنی مرۆڤەوە، ئادەم و حەوا، بەهۆی ئەو هەڵە گەورەیەی لە بەهەشت کرا، ئیدی نەك هەر بەهەشتیان لێ حەرام کرا، بگرە سزاش دران و لەو کاتەوە تا نهۆ مرۆڤ تامی ئەو سزایە دەچێژێت:

(ڕۆحی ئادەم لەناو ڕۆحی من هەموو نێرینەیەك و ڕۆحی حەواش لەناو ڕۆحی هەموو مێینەیەکدایە، بۆیە گەڕەکە هەموو مرۆڤێك تامی سزا بچێژێت..) ل٢٠

ئەو سزایە توانەوە و خۆ خواردنەوە و تلانەوەیە لە شوێنێکی نێوان دۆزەخ و بەهەشتە، کە ئەعرافە، هەر لەو شوێنە تاریك و نوتەکەشدا کوردۆ دەمرێت:

(هەستم کرد خەوێکی قورس لەخۆییم دەگریت..) ل٥٩

(ئیدی خامۆشی هەموو کونج و کەلەبەرێکی ئەعرافە ڕەشەکەی تەنییەوە..) ل٦٠

چیرۆکبێژ لە ڕێگەی چیرۆکی دیکەی هاوشێوی چیرۆکی کوردۆ و ئاشتیخانی ئەڤینیار، ئادگار و سیفاتەکانی داخراوی و پاشکەوتوویی کولتووری ڕۆژهەڵات دیاری دەکات، ئەو چیرۆکانەی کە لەگوندەکەی خۆیان (تەلخێمی گەورە ) لە ڕێگەی بەکارهێنانی تەکنیکی چیرۆك لەناو چیرۆکدا باس دەکات:

ـ چیرۆکی گوڵبەهاری کچی مام ساڵحی سەیاد، لەوێوە لە ژان و سۆی قەیرە کچەکانی ڕۆژهەڵات دەگەین.

- چیرۆکی دەسماڵی شەنگەبی و ڕۆستەمی گوێبڕاو، کە بە هۆی خۆشەویستییەکەیانەوە دەسماڵی شەنگەبی لەلایەن مەلا سەیفەدینی بەهەشتی باوکییەوە دەسوتنێرێت و ڕۆستەمیش باوکی بەخەنجەرەکەی گوێی دەبڕێت.

ـ چیرۆکی کوژرانی ئامانجی کەمانجەژەن لە شەڕی نەگریسی ناوخۆدا. ئەو شەڕانەی کە هەمیشە لە ڕۆژهەڵاتدا دواییان نایەت و سەدان بەهرەمەند ڕاپێچی گۆڕستانەکان دەکەن.

چیرۆکبێژ لە نێو ئەو ئەعرافە نوتەك و تاریکەدا تەواوی ڕووداوەکانمان بۆ دەگێڕێتەوە، سەرەتاش بەراناوی کەسی یەکەمی تاك (من) کە هەر چیرۆکبێژ خۆیەتی دەست بە گێڕانەوەکانی دەکات و دواتر ناوی کەسایەتیی کوردۆمان لە زاری ئاشتیخانی ئەڤینیار بۆ ئاشکرا دەکات:

(کوردۆ! لێدانە مزرکەی مامۆستا ڕەفیقی چاوسوورت لەبیرچووە؟..) ل١٤

ئیدی گێڕانەوەکە لەزاری کوردۆ و ئاشتیخانی ئەڤینیار بەردەوام دەبێت، جار ناجاریش وەکو پشوودانێکی ئەو کەسایەتییانە، چیرۆکبێژ کەسایەتی(کرمانجی) دروست کردووە و لە زۆر شوێندا گێڕانەوەی پێدەسپێرێت، کە لەراستیدا هەموویان هەر چیرۆکبێژ خۆیەتی کە هەندێك جار بە ڕاناوی کەسی سێیەمی تاك ( ئەو ) و ڕاناوی یەکەمی کۆ (ئێمە) لە گێڕانەوەدا بەردەوامە. وەکو لەم خشتەیەدا دیارە:

| چاپتەر | راناوی گێرانەوە |
|---|---|
| ١ | من |
| ٢ | من ـ ئەو |
| ٣ | من ـ ئەو |
| ٤ | من ـ ئێمە ـ ئەو |
| ٥ | من ـ ئەو |
| ٦ | من ـ ئەو |
| ٧ | من |

شێوازی گێڕانەوە لەم نۆڤڵێتەدا، گێڕانەوەی بازنەییە و سەرەتای گێڕانەوە لە نێو ئەعرافەکەدا دەست پێدەکات:

( ئاشتیخانی ئەڤینیار هەنگاو...هەنگاو بۆ لام دەهات، لەگەڵ هاتنی ئەودا وەنەزیش دەهات و لوولی دەدام... هتد) ل٩

دواتر لە چاپتەری کۆتاییدا بازنەکە هەر لەناو ئەعرافەکەدا بە دووبارەکردنەوەی هەمان ئەو دێرانە دادەخرێتەوە:

((ئاشتیخانی ئەڤینیار هەنگاو...هەنگاو بۆ لام دەهات، لەگەڵ هاتنی ئەودا وەنەزیش دەهات و لوولی دەدام... هتد) ل٥٨

بۆیە دەبینین ڕووداوەکان بەشێوەی یەك بەدوایەکدا نین، هەروەکو جۆن ڕیکاردۆ دەڵێت: "کاتێك پێشکەوتنی هێڵی درامی دەکەوێتە نێو تەڵەی بازنەییەوە، ئەوا چیتر ناتوانێ یەك بەدوایەکدا هاتنی ڕووداوەکان ڕیزبەند بکات و جێبەجێیان بکات" [1] بۆیە لەرێگەی

بەکارهێنانی تەکنیکەکانی مەنەلۆگ و دایەلۆگ و فلاش باکەوە، ڕووداو شـوێنکاتیان پارچـە پارچە کراوە.

لە ناونانی کەسایەتییەکانیشدا نووسـەر ئامـانج و مەبەسـتی تایبـەتی خـۆی هـەبووە و دەکرێت بڵێین ناوی کەسایەتییەکانی ئەم نۆڤڵێتـە بەشـدارییەکی کارایـان لـە تـانوپۆی هێڵـی گشتیی درامی چیرۆکەکەدا کردووە و دەربڕی خاڵ و نۆتـەکانی کولتـووری ڕۆژهـەڵات بوونـە، بۆنموونە هەر دوو کەسایەتیی (کوردۆ و ئاشتیخانی ئەڤینیار) دەربڕی هـەر دوو ڕووی مرۆڤـی کوردن، لەلایەك کوردۆ هێمایە بۆ مرۆڤی کورد لەو ڕووەی کە لەناو ڕۆژهـەڵات و ڕۆژئـاوادا نامۆیە و ئاشتیخانی ئەڤینیاریش دەربڕی دیوەکەی دیکەیەتی کە مرۆڤێکی ئاشتیخوازە، بەڵام بەزۆر داگیرکراوە، بەهەمان شێوە ناوی (ئامانجی کەمانجـەژەن) کەناوەکـەی دەربـڕی هونـەر و ڕۆشنبیری دەگەیەنێت کە بەگوللەیەکی وێڵی شەڕی ناوخۆ کوژراوە، ناوی (ڕەفیقی چاوسـوور) بۆ ناونانی مامۆستایەك، گوزارشت کردنە لەو سیستەمە سەقەتەی پەروەردە لە ڕۆژهەڵاتدا کە تژییە لە توندوتیژی و چەپاندنی حەز و ئارەزووەکانی تاك.

یەکەی گێڕەوە و مەنەلۆگ و دایەلۆگ: ئەو سێ یەکـە شـێوازی نووسـەر دیـاری دەکـەن و مەودایەکی فرەوانیشی پێ دەبەخشن بۆ ئەوەی لە پلۆتی ڕووداوەکاندا دەستکراوە بێت. یەکەی گێڕەوە بە ئاسانی لەم نۆڤڵێتەدا خۆی نیشان دەدات و بێ هیچ سیمبول و ئـامراز و هێمایـەك دەناسرێتەوە و تا کۆتایی بەردەوام دەبێت:

(سروشت تاجی ئاڵتونی لەسەر ناوەو دەرختەکانی ئەسرینی گەڵا هەڵدەڕێژن و پرچی زەردی خۆیان دەڕننەوە..) ل١١

لەبارەی مەنەلۆگەوە، بەدانانی کەوانە ( ) مەنەلۆگەکان لەناو ڕستەکان جیاکراونەتەوە:

" (تۆ بڵێی مـن نەناسـنەوە، نـازانم، بـەڵام بێشـك ئەمانـە دەسمـاڵی ڕەش و ڕۆسـتەمی گوێبڕاون) ل٣٢

کەچی لە هەندێك شوێنیشدا بێ دانانی ئەو کەوانانە و بێ دانـانی هـیچ جـۆرە هێمایـەك مەنەلۆگی بەکارهێناوە:

( تەماشایەکی خۆمم کرد: سۆلافی ئارەقەم، لەخۆم دەبرسی: دەبێ شێت نەبووبم) ل١١

سەبارەت بە دایەلۆگیش بەبەکارهێنانی (هێڵ یان خەت یان داش) وەك (ـــ) ڕستەکانی دایەلۆگی لەوانی دیکەی جوداکراوەتەوە. لە دایەلۆگێکی نێوان کوردۆ و ئاشتیخانی ئەڤینیاردا هاتووە:

( ـ ئاشتیخانی ئەڤینیار هەموو بەختەوەری و کامەرانی ژین لەو چاوە گەشانەی تۆدا دەبینم.

ـ کوردۆی کلۆڵ، نازانم باوەڕ بکەم یان نا؟

ـ دەزانم مەبەستت چییە ئازیزەکەم، بەڵام چی بکەم، کە باوکت بۆتە چیای قەرەچوغێ لەبەردەممانە؟) ل ٣٣

ئەم نۆڤلێتە لە (٧٩٩) دێر پێکدێت کە (٦١٣) دێری گێڕەوەیە و (١٠٠) دێری مەنەلۆگەو (٨٦) دێری دایەلۆگە، کە بەڕێژەی سەدی دەکاتە (٧٦.٨٪) بۆ گێڕەوە و (١٢.٦٪) بۆ مەنەلۆگ و (١٠.٨٪) بۆ دایەلۆگە. هەر وەکو لەم خشتەیەدا دیارە:

| چاپتەر | گێڕەوە | مەنەلۆگ | دایەلۆگ | کۆ |
|---|---|---|---|---|
| ١ | ١٩ | ١١ | سفر | ٣٠ |
| ٢ | ١٤١ | ٥٢ | ٢ | ١٩٥ |
| ٣ | ١٥٦ | ١٠ | ٤٦ | ٢١٢ |
| ٤ | ١١٦ | ١٢ | ١٢ | ١٤٠ |
| ٥ | ٨٤ | ١٠ | ١٩ | ١١٣ |
| ٦ | ٦٨ | سفر | ٧ | ٧٥ |
| ٧ | ٢٩ | ٥ | سفر | ٣٤ |
| کۆی گشتیی | ٦١٣ | ١٠٠ | ٨٦ | ٧٩٩ |
| ڕێژەی سەدی | ٧٦.٨٪ | ١٢.٦٪ | ١٠.٨٪ | ١٠٠٪ |

لە رووی وشەوە، نۆڤلێتەکە لە (٥٣٤٩) وشە پێکدێت، کە (٤٢١٦) وشەی تایبەتە بە گێڕەوە و (٦٣٧) وشەی مەنەلۆگن و (٤٩٦) وشەی تایبەتن بە دایەلۆگ. کە بەرێژەی سەدی،

ڕێژەکانیان بەمشێوەیە دەردەچێت: (٧٨.٨٪) تایبەت بە گێڕەوە، (١١.٩٪) مەنەلۆگە و (٩.٣٪) تایبەتە بە دایەلۆگ. وەکو لەم خشتەیەدا دیارە:

| چاپتەر | گێڕەوە | مەنەلۆگ | دایەلۆگ | کۆ |
|---|---|---|---|---|
| ١ | ١٥٣ | ٥٨ | سفر | ٢١١ |
| ٢ | ١٠١٠ | ٣٩٠ | ١٣ | ١٤١٣ |
| ٣ | ١٠٩٣ | ٤٤ | ٢٦٤ | ١٤٠١ |
| ٤ | ٧٢٥ | ٦٤ | ٥٦ | ٨٤٥ |
| ٥ | ٥٩٠ | ٥٤ | ١١٦ | ٧٦٠ |
| ٦ | ٤٤٢ | سفر | ٤٧ | ٤٨٩ |
| ٧ | ٢٠٣ | ٢٧ | سفر | ٢٣٠ |
| کۆی گشتیی | ٤٢١٦ | ٦٣٧ | ٤٩٦ | ٥٣٤٩ |
| ڕێژەی سەدی | ٧٨.٨٪ | ١١.٩٪ | ٩.٣٪ | ١٠٠٪ |

لێرەدا تێبینی ئەوە دەکەین، کە نووسەر زیاتر تەکنیکی مەنەلۆگی لە تەکنیکی دایەلۆگ بەکارهێناوە، ئەمەش بۆ بارودۆخی ڕووداوی چیرۆکەکە دەگەڕێتەوە، کە زیاتر پێویستی بە بەکارهێنانی مەنەلۆگ هەبووە بۆ دەربڕینی ناخی کەسایەتییەکانی، چونکە (ئەو کاتە مەنەلۆگ لەدایك دەبێت کەوا مرۆڤ، ناخێکی شڵەژاوی هەبێت و کاروکردەوەیەك و بیرۆکەیەك لەهزرو دەروونی پەنگ بخواتەوە، ئەم پەنگخواردنەوەیە بە ڕێگەی مەنەلۆگ دێتە دەرەوە) [٢]، بۆ ئەم مەبەستەش هەردوو جۆری مەنەلۆگ (مەنەلۆگی ناوەوەی ڕاستەوخۆ و مەنەلۆگی ناوەوەی ناڕاستەوخۆ) بەکارهاتووە.

شێوازی زمان: زمان تەنیا وشە و ڕستەگەلێك نین لەناو پانتایی دەقێکدا، بگرە قورسایی جووڵە و کردارەکان لەسەر زمان وەستاوە و وەکو بەرگێك وایە لەبەر کەسایەتیی و شوێنکات دەکرێت و فەزای دەقەکەی بێ شوناس دەکرێت. بەکارهێنانی زمان بەشێوەیەکی هونەری کاریگەرییەکی گرینگ و بەرچاوی هەیە لە بەنەمربوونی دەقدا. لەم نۆڤلێتەدا زمان

مامەڵەیەکی سیحراوی لەگەڵدا کراوە و بەشێوەیەکی فانتازی و خەیاڵئامێز چوارچێوە بەبەر شتگەلەکان کراوە و مۆسیقا و هارمۆنییەت لەناو وشە و ڕستەکاندا کەشێکی شیعری خوڵقاندووە و داڕشتنی وێنە و خەون و خەیاڵەکان زیاتر خوێنەر دەخاتە ناو دنیای پڕ لەسیحری دەقەکەوە.

ئەوەی جێگەی سەرنجە سەباح مەجید بە حوکمی ئەوەی ماوەیەك لەناوچەی بارزان مامۆستا بووە، سوودێکی زۆری لە شێوەزاری کرمانجی سەروو بینیوە و لەم نۆڤلێتەدا تەواو کاریگەرییەکەی بەرچاو دەکەوێت، نووسەر زمانێکی تێکەڵ لە شێوەزاری کرمانجی خواروو و کرمانجی سەرووی بەکارهێناوە و دەیان وشەی کرمانجی سەرووی ئاخنیوەتە نێو زمانی دەقەکەوە:

(وەلێ وێنەی قەلا پڕگالییەکە ژ هەمیا پتر هەڵوەستەی پێدەکرد..) ل٤٥

( پێنگاڤەکانی لوولدەدا...) ل٤٨

(من ببوومە پەیکەرێك و نەمدەتوانی...) ل٢٧

لەگەڵ ئەوەشدا چەندین وشەی عەرەبی و فارسی لەناو دەقەکەدا دەکەونە بەرچاو کە بە فۆنەتیکی کوردی نووسراونەتەوە، وەکو ( ئەعراف، بەریئ، میحنەت، مەرحەمەت، غەریب، خەلق، کامل، فەرەحنایی، حەزین، غەرووب، مەلعون، زیبا، کاشکێ...هتد).

هەروەها چەندین هەڵەی زمانەوانی بەرچاو دەکەن، کە ڕەنگە هەندێکیان هەڵەی چاپ بن. بۆ نموونە:

( ڕۆحی ئادەم لەناو ڕۆحی من هەموو نێرینەیەك و ڕۆحی حەواش لەناو ..) ل٢٠

لێرەدا ئەو (من)ی نێوان هەردوو وشەی (ڕۆحی و هەموو)دا هەڵەیە و ڕاستییەکەی دەبێت بنووسرێت: ڕۆحی ئادەم لەناو ڕۆحی هەموو نێرینەیەك و...

(دەمیوست دەستەکانم بەرز بکەمەوە...) ل٣٢

دەمیوست هەڵەیە و ڕاستییەکەی (دەمویست)ـە.

(کردۆی کلۆڵ، نازانم باوەڕ بکەم یان نا؟...) ل ٣٣

کردۆی هەڵەیە و ڕاستییەکەی (کوردۆ)یە.

(گەلێك جارن هاوارم دەکرد....) ل ١٩

جارن هەڵەیە و ڕاستییەکەی (جاران)ـە.

(باوکم هەر شەوێ لەلای ژنێکی بەدیدەنی کامڵبوون دەگەیش...) ل٢٤.
دەگەیش هەڵەیە و ڕاستییەکەی (دەگەیشت)ـە.

ئەفسانە و حیکایەت و میتۆلۆژیا: مەزراندنی ئەفسـانە و حیکایـەت و میتۆلۆژیـا لـەناو دەقی چیرۆك و ڕۆماندا، جیا لەوەی بووژاندنەوە و زیندووکردنەوەی کەلـەپووری نەتەوایەتییـە، کەشێکی سیحری و فانتازیش بە دەقەکە دەبەخشێت و چێژ و خۆشییەك بە خوێنەر دەگەیەنێت و مەودای هزران فرەوانتر دەکات، چونکە (کرۆکی ئەفسانە لـە چـۆنییەتی گێڕانەوەیـدا نییـە، بگرە لە هەقایەت و بونیادە بەردەوامەکەی دایـە کـە لەیـەك سـاتدا لـە ڕابـردوو و ئێسـتە و داهاتووماندا، دادەنێ) [٣]. لەم نۆڤلێتەدا ئاماژە بە چەندین ئەفسانە و حیکایەت و میتۆلۆژیا کراوە، وەکو ئاماژەدان بە ڕۆڵی پیرەژن کە لە (ئەفسانەی کوردیدا بە هەردوو شێوەی ( ئـەرێی و نەرێی) ڕۆڵ دەگێڕێ و زۆر جارانیش لە ڕیزی کارەکتەرە سەرەکییەکانە، یەکێك لە ڕۆڵەکانی پیرەژن کە لەئەفسانەدا دەیگێڕێ ئەو نێوانەیە کە لـەناوان کـوڕان و کچـان، دڵـدار و دوڵبـەر دەگێڕێ) [٤]:

(گەلێك جارن هاوارم دەکرد و نەفرەتم بۆ ئەو باڵەفرە دەنارد، کە بە ئەعرافـە ناشـرینەکەی سپاردبووم، ئەو باڵەفڕەی کەوا هەر لە چەرخ و فەلەکی ئەو پیرەژنە ئەفسـونبازە دەچـوو، کـە دایکی داماوم لەسەر گوزشتە خەیاڵییەکاندا بۆی باس کردبووم...) ل ١٩

هەروەها ئاماژەدان بە مار، کە لە (ئەفسانە و بیر و باوەڕی کـۆنی میللەتانـدا ئامـادەیی هەیە) [٥]. مار وەکو هێمایەکی دوو لایەنی نەرێنی و ئەرێنی ناسـراوە، لایەنـە ئەرێنییەکـەی خۆی لەو خۆشەویستییە دەبینێتەوە، کە لە نێوان مارەکاندا هەیە، کە لە کوردەواری بە ماری ( عاشقە و مەعشوقە) ناودەبرێن، ئەم لایەنەش لـەم نۆڤلێتـەدا جـەختی لەسـەر کراوەتـەوە، کاتێك کوردۆ لەناو ئەعرافەکەدا دەسماڵی ڕەش و ڕۆستەمی گوێبڕاوی وەکو دوو ماری عاشق و مەعشوقە دێتە بەرچاوی:

(ئەوان وەکو دوو ماری سپی...سپی لێکهالابوون و بەرز دەبوونەوە...) ل ٣٢

ئاماژەدان بە ئەفسانە و بیروباوەڕی مرۆڤی کۆن لەبارەی گەردوون و فەزا و زەوی و ئاسمان و مانگ و خۆرەوە، ئەمەش کاتێك کۆردۆ باس لە سەردەمی منداڵی خـۆی دەکـات کـە ئـەو کاتە پرسیاری لە دایکی کـردووە لـەبارەی ئـەو ئەسـتێرانەی وا بـە ئاسمانـەوەن و دایکیشـی

ئەفسانەی چۆنییەتی دروستبوونی ئەستێرەی بۆ باسکردووە کە لەناوان مانگ و خۆردا بوونە و گوایە ئەستێرەکانی منداڵی مانگن:

( ـ گوێبگرە کوڕی شیرینم ! لەسەرەتا هەتاو و مانگ هاوڵی یەکتر بوون.. هەریەکە لەگەڵ منداڵەکانیدا دەردەکەوتن...) ل ٤٩

لەزۆر شوێنیشدا کارەکتەری ڕووداوەکەی بە کەسایەتییەکانی نێو حیکایەت و میتۆلۆژییەکان چواندووە، وەکو خۆچوواندن بە عیفریتەکەی سولەیمانی پێغەمبەر:

(ئەو باڵەفڕە نەگریسە دەتگوت عیفریتەکەی سولەیمانی پێغەمبەرە..) ل١٩

هەروەها خۆچوواندن بە یەعقوب و یوسف، کە چیرۆکی یوسفمان دێنێتەوە یاد:

(یەعقوبئاسا لەتاو ونبوونی یووسفی هێڤییەکانم دەگریام...) ل١٤

ئاماژەدان بە سیزیفی ئەفسانەی یۆنانی کۆن:

(سیزیفئاسا لە پۆپەی فیردۆسە دۆزەخییەکە...) ل ٥٢

کات: لەبەرئەوەی کوردۆ لە بارودۆخێکی خراپی دەروونی دایە لە سەرەتای چیرۆکەکەدا کات لێڵ و نادیارە و هیچ ئاماژەیەك بۆ کاتێکی دیاریکراو لە ئارادا نییە:

(ئەمڕۆ چ ڕۆژێکە: شەممە، یەکشەممە، دووشەممە، سێشەممە، چوارشەممە، پێنجشەممە، شەششەممە، دەشەممە..... چ ڕۆژە؟ خودایە وەفریام وەرە! نازانم سپێدەیە، نیوەڕۆیە، ئێوارەیە، شەوە چییە؟! سات بەتەواوەتی بەها خۆی لەدەست داوە...) ل ١٠

دواتر لە کۆتاییەکانی نۆڤلێتەکەدا چیرۆکبێژ ئەوەمان بۆ ئاشکرا دەکات، کە کاتی ڕوودانی چیرۆکە لە پێش حەوت ساڵ بووە، کاتێك لە ئەورووپا ناتوانێت لەگەڵ کچێکی دیکەدا خۆشەویستی بکات:

(ئاخر منێك کە کولتوورێکی وەك قەڵا کۆنم لە پشتەوە بوو چلۆن بمتوانیبوایە تەنیا بە حەوت ساڵ جاڕی مەرگی ڕابگەیەنم؟ هەرگیز ئەمەم پێنەدەکرا..) ل٥١

ئینجا لە کۆتایی نۆڤلێتەکەدا کاتی گێڕانەوەی ڕووداوەکە دیاری دەکرێت کە لەشەوێکدایە:

( شەو دەوارە دەیجورییەکەی هەڵدابوو، لەناو باخچەیەکی ڕەشی ئەعرافەکەدا ڕاکشابووم... ) ل٥٧

لێرەدا کاتەکان دیاریکراون، کاتی ڕوودانی ڕووداوەکە و کاتی گێڕانەوەی ڕووداوەکە، لەناو ئەو کاتە دیاریکراوانەش، چەندین کاتی دیکە دەستنیشان دەکرێت، واتە مەودای کات فرەوان

و درێژ کراوەتەوە و لە هەندێك شوێندا بەرەو ڕابردوو وەکو لە گێڕانەوەی چیرۆکەکانی دەسماڵی ڕەش و گوڵبەهار وئامانجی کەمانجەژەن و ئەفسانە و حیکاتەکان بەهۆی بەکارهێنانی تەکنیکی چیرۆك لەناو چیرۆك و تەکنیکەکانی مەنەلۆگ و دایەلۆگ و فلاش باگەوە بەدیار دەکەوێت. هەروەها لەهەندێکی شوێنی دیکەدا بەرەو کاتەکانی سەرەتای خوڵقاندنی مرۆڤ ڕۆچۆتە نێو ڕابردووە وەکو باسکردنی خوڵقاندنی ئادەم و حەوا. کاتە دیاریکراوەکان بە کاتی ناوەوەی ڕۆمان ناسراوە و کاتەکانی دیکەی نێو کاتە دیاریکراوەکە بەکاتی دەرەوەی ڕۆمان ناسراوەتەوە[٦].

بەگشتیی لەناو ئەم نۆڤلێتەدا چەندین یەکەی کات دیاریکراوە کە کاتی ڕووداوەکان و گێڕانەوەکانمان بۆ دیاری دەکەن، وەکو (بەهار، پایز، زستان، هاوین، دوای نیوەڕۆیەکی هاوینی، شەوێکی هاوین، ئێوارە، ڕۆژەکانی هەفتە، حەوت ساڵ...هتد).

شوێن:شوێن زەمینەی کاری ڕووداو و کاتی چیرۆکەکەیە. شوێن شێوازی نووسەرەکە دەردەخات، چونکە هەر شوێنێك پێویستی بە شێوازێکی تایبەتی نووسین و وەسفکردنەوە هەیە[٧]. دەکرێت لەم نۆڤلێتەدا بە شێوەیەکی گشتیی سێ جۆر شوێن دەستنیشان بکەین:

ـ شوێنێکی چەسپاو، کە بریتییە لەو ئەعرافەی نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا، کە لەناویدا چیرۆکەکەمان بۆ دەگێڕدرێتەوە، ئەو شوێنە، شوێنێکی ناهۆگر و نەویستراوە، لە لایەن کارکتەری کوردۆوە بە گرتووخانە چووێندراوە بە کرێت و ناشیرین وەسف کراوە:

(خودایە خۆ لەگرتووخانەی ئەعرافدا کەسێك نەبوو، تۆسقاڵێك دڵنەوایم بکات..) ل١٩

(گەلێك جاران هاوارم دەکرد و نەفرەتم بۆ ئەو باڵەفرە دەنارد کە بە ئەعرافە ناشرینەکەی سپاردبووم،...) ل ١٩

ـ شوێنێکی هەمیشە گۆڕاو: ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا دەگرێتەوە، کە ئەم دوو شوێنەش ناهۆگر و نەویستراو بوونە بۆ کارکتەرەکانی، کە هەمیشە بیر لە بەجێهێشتنی ڕۆژهەڵات دەکەنەوە و وەلێ مەرجیش نییە لەگەڵ ڕۆژئاوا بگونجێن، وەکو ئەزموونی کوردۆ.

ـ شوێنەکانی دیکەی نێو چیرۆکەکە، وەکو گوندی تەلخێمی گەورە، ماڵی گوڵبەهار، ماڵی مام ساڵحی سەیاد، ماڵی کوردۆ، ماڵی ئاشتیخانی ئەڤینیار، شاری هەولێر و قوتابخانەی گوندەکەیان و چەندین شوێنی دیکە. ئەم شوێنانە بەگشتیی وەکو شوێنێکی

موجەرەد و زێدی کارەکتەر شوێنگەلێکی هۆگر و ویستراو بوونە، لێ هزرو ئەقلێکی دۆگما و چەقبەستوو ناچاری کردووە جێی بهێڵێت.

باسکردنی شوێن بەشێوەیەکی هونەری لە دوو ڕێگەوە دەبێت، ڕێگەیەکی تەقلیدی کە برێتییە لە چەند هێما و ڕەمزێك بۆشوێن وەکو ( شەقام، ماڵ) کە ئەم جۆرە شوێنانە خاوەن ڕۆح و ئاوازێك نین و زیاتر گشتین، یاخود بە ڕێگەیەکی نوێخوازانەوە وەکو لە دەرگایەوە یاخود لە پەنچەرەیەکە بڕوانییە وڵاتێك یان شارێك و وردەکارییەکانی بخەیە ڕوو[٨]. لێرەدا شوێنی ئەعراف هەمان ڕۆڵی ئەو دەرگایە یاخود ئەو پەنجەرەیەی بینیووە و لەوێوە ئاشنای شوێنگەلێگ دەبین کە شوێنی ڕووداوەکانی چیرۆکەکەیە.

## سەرچاوەو پەراوێز:

١ــ الروایە الفرنسیە الجدیدە، نهاد التکرلی، جزو الپانی، دار الحریە للگباعە ـ بغداد، ١٩٨٥، ل.٤٤

٢ـ ڕەگەزەکانی دراما لە شیعری لیریکی کوردیدا، دەزگەی چاپ و پەخشی سەردەم ـ سلێمانی،٢٠٠٨، ل ٣٣٩.

٣ـ ئەفسانە و ئەدەب، د. ڕانیا سەمارە، و: حوسێن سابیر عەلی، چاپخانەی شەهاب، هەولێر ـ٢٠٠٦، ل ١٦.

٤ـ ڕەنگدانەوەی ڕیالیزمی سیحری لە ڕۆمانەکانی کاکە مەم بۆتانی، حوسێن سابیر عەلی، نامەی ماستەر، ل ٧٣.

٥ـ هەمان سەرچاوەی پێشوو.. ل ٦٨.

٦ـ ڕۆمانی کوردی، خوێندنەوە و پرسیار، سابیر ڕەشید، بەشی یەکەم، دەزگەی ئاراس، ٢٠٠٧، ل ١٩.

٧ـ الروایە و المکان، دراسە فی فن الروایە العراقیە، یاسین النصیر، دار الحریە للگباعەـ بغداد، ١٩٨٠، ل ٦

٨ـ هەمان سەرچاوەی پێشوو.... ل ٩.

## سەفەرێك بەرەو
## ڕۆمانی(شانشینی تاقگەکانی سۆز)ی  سەباح مەجید

بەبێ بوونی خۆشەویستی کۆمەڵگە ئیفلیج و نامۆ دەبێت، خۆشەویستی بەچەمکە فرەوانەکەی دەرگا خستنە سەرپشتە بۆ ئەوەی مرۆڤ مومارەسەی مرۆڤایەتی خۆی بکات و هەست و سۆزی لەشەقەی باڵی بدەن و ڕووەو بەهەشتەکانی سێو بفڕن، ئەو خۆشەویستییەی کە دەبێتە پەناگەیەك و سێبەرێکی جاویدانی بۆ حەسانەوەی ڕۆح و دیدەنی جوانییەکانی ژیان و فراهمبوونی خورپەکانی دڵ، هەر کۆمەڵگەیەك خۆشەویستی بە بیدعە بزانێ، بێگومان وەکو ((کانییەك تەنیا دڵتەنگی لێوە هەڵدەقوڵێ))، بۆیە لاوەی تەمبورژەن و لاوەند وەك دوو کەسایەتیی سەرەکیی ڕۆمانی (شانشینی تاقگەکانی سۆز)ن، کە لەلایەن ڕۆماننووس (سەباح مەجید)ـەوە نووسراوە. ئەم دوو هاوڕێیە، دوو هاوڕێی گیانی بەگیانی یەکترن  لەو شارەی کە تەمەنی نێزیکەی تەمەنی هەسارەکانە، لەو شارەی کە چەندین لەشکر و سوپای قەبەی شکاندووە، لێ چونکە خۆشەویستی تێیدا یاساخە و قەدەخەیە) تۆلازێك بەدیدەنی سێبەری کچێك شاد نابێت)، بۆیە سەری خۆیان هەڵدەگرن و ئیدی بەرەو سەفەرێکی دوور بۆ وڵاتی غەریبایەتی دەڕۆن و لە کۆڵان و شەقامەکانی قەڵا و گەڕەکە ئەفسووناوییەکانی هەولێر دوور دەکەونەوە، بگرە ئەگەر لەو شارەی خۆشیان نەیانتوانی سروودەکانی عیشق پڕ بەدەم بڵێنەوە، ئەوا لە هەندەران و لە وڵاتانی بێگانە وانەی عیشق بخوێنن، کۆچکردن تەنیا لەبەر باری ئابووری و کارەساتی سیاسی ڕوونادات، بگرە گەلێ جاران هەڵاتنە لەو دابونەریتە قێزەونە

کۆنەی کە تاکەکانی کۆمەڵ بەدەستییەوە گیرۆدەن و بەهەر نرخێك بێت دەیانەوێت لێی دەربـاز بن.

کاتێك نەوەی نوێ لـە هەوڵدانـەکانیان بـۆ گـۆڕینی بـاری کۆمەڵایـەتیی کۆمەڵەکـەیان ڕووبەڕووی هێزی ڕەشی کۆن دەبنەوە، ئەوهێزەی هەردەم چەکوچ بەدەسـت و بـۆ دوژمنـەکانی ئامادەبووە، ئیدی توانای بەرەنگاری زۆری و فرەوانی ئەو جۆرە هێزانەیان نابێتەوە. بۆیە شەڕی ئەو ئاسنگەرە بێ سۆزانەیان بۆ ناکرێ کە لەشەوە زەنگدا لەسەر سـندانەکانیان تریفـەی مـاچ دەشکێنن. ئەو هێزە ڕەشە بێ ڕوحمەی کە هیچ باکی بە سەفەری تۆلازەکانی نییە و ڕێگەشیان پێنادەن لەو شارە مێژووییەی خۆیان خۆشەویستی بکەن، بۆیـە تۆزەکانیشـی بـەرەنگزەردی و پەشۆکاییەوە بڕیاری سەفەرکردن دەدەن.

لاوەند دوای خواحافیزی لەتەمبوورژەن شارە مێژووییەکەی بەجێ دەهێڵێ و ڕوو لە بەغدا دەکات، بەغدا لە سەردەمی دیکتاتۆریدا وەکو ڕەمزێکە بۆ بێ ڕوحمی جەلادەکان، بۆیە هـەر لەوێشەوە بەبێ هیچ هۆکارێك قۆڵبەستی دەکەن و ڕەوانەی گرتووخانەی نەجەفی دەکـەن. ئـەو نەجەفـەی کـە مەڵبەنـدی ڕاپـەڕینی شـیعەکانە. هـەر لـەوێش لـەناو ژوورە تاریکـەکانی گرتووخانەدا لەگەڵ (ئەبو لوئەی) دەبێتە هاوڕێ. ژیانی نێو ئەم گرتووخانەیەش زۆر ناخایەنێ، چونکە ڕاپەڕینی سەرتاسەری دژی دیکتاتۆری و جەلادەکان کە شـارو شارۆچـکەکانی گرتـەوە دەست پێ دەکات و مژدەی ئازادی بە گەلانی عێراق دەدات، ئیدی نەجـەفیش وەکـو هـەموو شارەکانی عێراق ڕاپەڕی و ئازاد بوو. لەو نێوەشدا لاوەند و ئەبو لوئەی دوای ئازادبوونیـان لـە گرتووخانە هەر لە نەجەف دەمێننەوە.

لە شاری نەجەف لاوەند (بوشرا)ی ناسی، کە کچێکی شیعە مەزهەب بوو، توانی کـۆت و بەندی داوکەوتوویی بشکێنێت و سنووری خۆشەویستی فرەوانتر بکات و بیگەیەنێتە کوردستان و لەگەڵ کوڕە لاوەکەی هەولێر داستانی نەمری تۆمار بکـات. وەلـێ زۆری پێنەچـوو دووبـارە ڕەشەبای مەرگی بەعس سەر لەبەری بناخەی ئـەو ئازادییـەی کـە ڕاپـەڕین بـەدی هێنـابوو، تێکدایەوە و کەوتە گیانی هەموو ئەو تۆلازانەی کە بەچەند ساتێکیش خۆشەویستیان لـەولاتی ئاگرو شـەڕ نـەکردبوو. ئیـدی لاوەنـد بەناچـاری دەگەڕێتـەوە هـەولێر و پاشـان هـەواڵی لـە سێدارەدانی بوشرای کچە شـیعە مەزهەبیشـی پێـدەگات، کـە ڕژێمـی بـەعس بـە تۆمـەتی داڵدەدانی تۆلازێکی کوردەوە سزای مەرگی بەسەردا سەپاند. لێرەدا باسکردنی چرکە ساتەکانی

ڕاپەڕین و تەوزیفکردنی لەڕۆمانەکەدا، بەتایبەتیش لەشاری نەجەف و بەستنەوەی لەگەڵ ڕووداوەکانی هەولێر، زیاتر لەبەرئەوەیە، کە دوو شاری خێر لەخۆ نەدیوون، دوو شارن لەژێر چەپۆکی هێزی ڕەشدان و تەنانەت هەوری سەر ئاسمانیشیان هەمیشە ڕەشەو بەردەوام بارانی غەم بەسەریاندا دەبارێ. ئەمەش خۆی لەخۆیدا دەلالەتە بۆ واتا فرەوانەکەی چەمکی خۆشەویستی، بەو پێیەی کە خۆشەویستی ڕەگەزو نەتەوە نازانێت و هەر لەگەڵ یەکەم چرپەی ئازادی دەکەوێتە فڕینەوە.

باسکردنی ئەم دووشارە کەیەکێکیان مەڵبەندی ڕۆحی ئاینی شیعە مەزهەبەکانە و ئەوی دیکەشیان مەڵبەندی کوردایەتی و پایتەختی کوردستانە، ئاماژەیە بۆ خەباتی کورد و شیعە لەدژی هەموو ئەو هێزە شەڕو نەگریسانەی کە بەردەوام لە هەوڵی کوشتنی جوانییەکانی ژیاندا بوونە. لەهەمان کاتیشدا ئاماژەیە بۆ قوربانییەکانی ئەم دوو شارە مێژووییە کە هەردەم لە پێناو ئازادی و ڕەهابوونی خۆشەویستیدا باجی گەورەیان داوە.

لەلایەکی دیکەشەوە تەمبوورژەنی هاوڕێی لاوەندیش داوی ئەوەی لەکۆلێژ لەگەڵ ژالیای خۆشەویستی پەیمانی سۆز و وەفا دەبەستن، ئیدی باوکی ژالیا لەبەردەمیاندا دەبێتە لەمپەرێك و بەهۆی کولتووری عەشائیرییەوە کە ژالیا دەبێت بۆ ئامۆزای بێت، ڕێ لەو خۆشەویستییە پاکە دەگرێت. باوکی ژالیا ڕازی نابێت ژالیا بە ئارەزووی خۆی لەگەڵ خۆشەویستەکەی خۆیدا بە ئازادی بەنێو کوچەو کۆڵانە ئەفسووناوییەکانی قەلا پیاسە بکات. ئەو دەسەڵاتەی باوك کە بەشێکە لە هێزی دواکەوتوویی و هەمیشە لە گۆشەنیگایەك سەرچاوە دەگرێت کە بووەتە مایەی پاشکەوتن و کوشتنی باڵندە سپییەکانی ڕۆحەوە. دەسەڵاتی باوك هەردەم وەکو سێبەرێکی دیکتاتۆری بووە بۆ منداڵەکانی و لە هەموو ئازادییەك بێ بەشی کردوون. ئەو دەسەڵاتە هەموو جوانییە مێژووییەکانی ئەو پیرە هەولێرەی وێرانکردووە و شێواندوویەتی و خۆشی وەکو دەسکەلایەك لە بەرانبەر هێزی نەگریس و ڕەشدا هیچی پێنەکراوە. ئەو دەسەڵاتەی کە دژ بە نەوەی نوێ و دژ بە ئازادی و بەمێژووی شارەکەی تێکۆشاوە.

سەرەڕای ئەمانەش ئەو سیستەمە کۆنەی پەروەردەش هاوتەریب لەگەڵ ئەو ئەقڵییەتە پاشکەوتووەی دەسەڵاتە کلاسیکییەکەدا بووەتە سۆنگەی بێزاری نەوەی نوێ. پیربوونی کۆلێژەکان و سیکڕابوونی پرۆگرامەکانی خوێندن و بە ئۆردوگابوونی کۆلێژەکان و بە

ئەفسەربوونی مامۆستاکانیان لەناو ئەوگێژاوەیەدا بزمارێکی پتەویان لە لەشی ئەم نەوە نوێیەدا چەقاندوەو تا بەرەو پێشەوە هەنگاو نەهاوێن.

لەم چوارچێوەیەشدا تەمبوورژەن لەگەڵ ژالیا تەنیا ڕێگەیان لەبەردەمدا مابێتەوە، کۆچکردن بووە، کۆچکردن بەرەو شانشین، شانشینی تاڤگەکانی سۆز، چونکە هەر لەوێ ڕێز لە هەست و سۆزی مرۆڤایەتی دەگیرێ و هەر لەوێش نرخی ڕاستەقینەی خۆشەویستی دەزانـدرێ. لە شانشینەکەشدا دەرگا بۆ هەموو تۆلازێك والآیە بۆ هاتنە نێو جیهانی ئەبەدی عیشـەوە. بڕیاری کۆچکردن بۆ شانشینەکە ئاوا سانا نەبوو، بگرە لەڕێگەدا چەندین خەم و خەفەت و خەیاڵ و قسەو باسوخواسەکانی نێو کۆڵانە ئەفسووناوییەکانی مێژوویی هەولێریان بەبیردەهاتەوە، چەندین جاریش خەموخەفەت هەردوو خۆشەویستەکەی دادەگرت، کە چۆن ئەو کۆمەڵگەیەی کە لەواتای خۆشەویستی ناگەن، لەژیانێکی زەلیلی و زەبوونیدا دەگوزرێن.

هەر لەگەڵ گەیشتنیان بەشانیشنی تاڤگەکانی سۆز ئیدی بۆ چەند ساتێك بە ئازادی تەمبوورژەن لەگەڵ ژالیای خۆشەویستی لەناو گژوگیا و گوڵ و پەپوولەکانی بەهاری ئەو تاڤگانە بەتریفەی پێکەنیناوی دەسووڕانەوە. وەلێ ئەفسوون نەیانزانی ئەو شانشینە لەلایەن هێزی ڕەشەوە داگیرکراوە، بۆیە لەناکاوێکدا جەستەی ژالیای وەفاداریان پڕ گوللە کرد و خوێنی سووریان لەگەڵ ئاوی میهرەبانی تاڤگەکاندا تێکەڵاو کرد.

## ڕۆمان وەکو کەناڵێکی زمانەوانی
## ڕۆمانی (ڕێزمانی خۆشەویستی)ی سەباح مەجید بەنموونە

ڕۆمان وەکو ژانرێکی زیندووی سەردەم، ڕۆڵێکی ڕاستەوخۆ لەناو کایەکانی کۆمەڵگە وازی دەکات و هەمیشە لە پێوەندییەکی ڕۆحیدایە لەگەڵ مرۆڤ و کۆمەڵگەکەی. بۆیە نەك هەر بەشداری لە چارەسەرکردنی کێشەکان دەکات، بگرە دەروازەیەکی والایە بۆ خستنەڕووی تەواوی کێشەو گرفتەکانی مرۆڤایەتی و بەشێکی بنەڕەتی لە ناسنامەی میللەتان پێکدێنێت و بووە بە یەکێك لەسیما دیارەکانی جیهانی ئەمڕۆمان. ئەگەر لەکۆندا کاراکتەر و کەسایەتییەکانی نێو دەقە ئەدەبییەکان تەنیا خوداوەند و نیمچە خوداوەند و دێو و درەنج و گیانلەبەرە ئەفسانەیی و خورافییەکان و کەسایەتییە ئەرۆستۆکراتەکانی نێو کۆمەڵگە نمایش کراون. ئەوا لەسەردەمی ڕۆماندا جیا لەمانەش کارەکتەر و کەسایەتیی ڕەش و ڕووت و چینی خوارەوەی کۆمەڵگە وەکو پاڵەوانێکی بنەڕەتی دەقی ئەدەبییان پێکهێناوە. هەر لەبەر ئەمەشە کە دەقی ڕۆمان وەکو پانتاییەکی کراوە باوەشی بۆ هەموو چین و توێژەکانی کۆمەڵگە کردووەتەوەو هەموویان وەکو ئاوێنەیەك ژیانی دەرەوەو ناوەوەی خۆیان تێدا بینیوەتەوە. بۆیە لەمبارەیەوە وتراوە: (سنوورێك نییە ڕۆمان دیاری بکات یەکێکی وەك هـ. ج. ویلز ناوی نابوو تورەکەیە و دەتوانی هەموو ئەو شتانەی تێ بئاخنیت کەلات پەسندە)[1] بێگومان ئەو سنوورە کراوەیە ڕۆڵێکی زیاتری بە ڕۆمان بەخشیوە و وای لێکردووە ئاوڕ لە تەواوی کایەکانی نێو کۆمەڵگە بداتەوە و هەموو دیاردە و بوارەکان لەباوەشی خۆی کۆبکاتەوە. لەسەردەمی ئەمڕۆشماندا ڕۆمان هۆکارەکانی گەیاندن و هونەری سینەما و شانۆ و مۆنتاژ... هتد، کردووەتە کەرەستەی پێکهاتەی خۆی و لە هەناوی خۆیدا سیاسەت و کۆمەڵایەتیی و ئابووریی کۆمەڵگەی هەڵگرتووە و دەستی بۆ مێژووش درێژکردووە، چونکە ڕۆمان (ئەگەر ژیانی ئاساییش باس بکات ئەوا شتێکی مێژوویی هەر تێدایە)[2].

یەکێك لەو کایە هەر گرینگانەی کە بەشێکی سەرەکیی لە دەقی ڕۆمان پێکدەهێنێت، زمانە. ڕاستە زمانی ڕۆمان، زمانی پەخشانە و بریتییە لە وشە و ڕستە و لەئاستێکی ڕێکخراوی زماندا تانوپۆی دەقەکە ڕەنگرێژ دەکەن. وەلێ خودی زمانەکە خۆی (جا هەر

زمانێك بێت) بنەڕەت و هۆكاری گەیاندنی گشت مەبەستەكانی ڕۆماننووس لەخۆ دەگرن. بەم پێیەش ڕۆماننووس لە ساتێكی دیاریكراوی زەمەندا مامەڵە لەگەڵ وشە و ڕستە دەكات و ڕایەڵەكانی دەقەكەی بەهۆیەوە دادەڕێژێت. واتە لەدواجاردا زمان و ڕێزمانی ئەو زمانە گشت و بیرۆكە و هزرەكانی ڕۆماننووس دادەڕێژن و لەپرۆسەیەكدا ئەو بیرۆكە و هزرانە لە بوونێكی مەعنەوی نێو قالبی مێشكەوە بۆ بوونێكی مادی سەر كاغەز دەگوازنەوە، لەساتی ئەو گواستنەوەیەشدا پیت و وشەو ڕستەكان لەشێوەیەكی وێنەییدا بەرجەستە دەبن و دەبنە كائینێك كە بەپێی ڕێزمانێكی دیاریكراو و بەرنامەڕێژدا ڕێككدەكەون و تەبا دەكەونەوە.

لەم ڕوانگەیەوە ڕۆمان بەهۆی ئەو زمانەی كە بەكاریدەهێنێت، دەربڕی كێشەو گرفتەكانی نێو كۆمەڵ دەكات. ئەوەی لێرەدا لەبارەی ڕۆمانەوە باسی لێوە دەكەین شتێكی تازە و نوێیە، تازە ونوێ بەو پێوەرەی نا كە ڕۆمانێكی جیاواز لە تیۆری ڕۆمانی لێكەوتبێتەوە، بگرە بەو پێوەرەی كە ڕۆمانەكە دەستی بۆ كایەكی گرینگ بردووە كە ئەویش زمانەوانییە. واتە زمانەوانی و دەستەواژە و پێكهاتەكانی خۆیان بوونەتە سەرچاوەی پێكهاتنی دەقەكە و بەشداری لە بەڕێوەبردنی ڕۆمانەكەدا دەكەن. ڕۆمانی ( ڕێزمانی خۆشەویستی)ی ڕۆماننووس سەباح مەجید، لەو هەوڵە تازەییدا شكۆفەی داوە و تێیدا ڕۆماننووس، ڕێزمانی وەكو بەشێكی پێكهێنەر لەتەوەرەكانی ئەو ڕووداوەدا بەشداری پێكردووە و سەرنجی وەرگری بۆ لای گەلێك مەسەلەی زمانەوانی هەنووكەیی و دەستەواژەو زاراوەكانی زمانی كوردیی بردووە و لەگەڵ كێشەی سەرەكیی ڕۆمانەكەدا ئاوێتەی كردوون.

ناونیشانی ڕۆمانەكە (ڕێزمانی خۆشەویستی)یە، ئەو ناونیشانە دەلالەت لە جەوهەری دەقەكە خۆی دەكات و یەكڕاستیش سەرنجی وەرگر بۆ خۆی ڕادەكێشێت. ئەگەر بەوردی سەرنج لەم ناونیشانە بدەین دەبینین لەدوو وشە پێكهاتووە( ڕێزمان) و ( خۆشەویستی). ڕێزمان لێرەدا و لەسیاقی ئەو ناونیشانەدا دوو جۆر واتای لێ بەرهەم دێت، واتای یەكەمیان ڕێزمانی زمانێك دەگرێتەوە، بەواتای هەموو ئەو ڕێوشوێن و یاسا و هاوكێشانەی كە لەهەناوی تایبەتمەندییەكانی خودی زمانەوە بەدەستهاتوون و داڕێژراون بەمەبەستی فێربوونی ئەو زمانە و لێكدانەوە و شرۆڤەكردنی لەپێناو پەرەپێدان و دەوڵەمەندكردنیەوە. واتای دووەمیشان كە ڕاستەوخۆ پێوەستە بە واتای یەكەمیان و بەڕایەڵەكردنی لەگەڵ وشەی دووەمیان (خۆشەویستی) واتای یاسا و ڕێسا و ڕێوشوێنەكانی خۆشەویستی دێت، كە پرۆسەیەكی

مرۆڤایەتی و ویژدانی ناخی مرۆڤە بۆ بەردەوامیدان بەژیان و ڕەنگالەکردنی بالەکانی. لێرەدا ناونیشان لەگەڵ مەبەست و مەغزای دەقەکە دێتەوە، بەو پێیەی کە (ناونیشان ڕۆڵی کلیل دەبینێت بۆ کردنەوەی دەرگای دەق و چوونە ناو دەقەوە)[٣]، بەمەش خوێنەر لە نەستی خۆیدا واتای ناونیشانەکەی لەگەڵ ناوەرۆکی دەقەکەدا لێك دەدات و بەیەکەوە پارچەکانی مەبەست و مەغزای ڕۆمانەکە تانوپۆ دەکەن.

کارەکتەری سەرەکیی ئەم ڕۆمانە بریتین لە (ئەلەند) و (بەهەشت)، ناونانی ئەو کارەکتەرانەش لەلایەن ڕۆماننووسەوە زیاتر بەمەبەستەوە بووە، چونکە هەردوو کەسایەتییەکە مامۆستای زمانی کوردین و لە خۆشەویستییەکی بەگڕو تیندا دەبن، بەڵام دواتر بۆ یەکتر نابن، ئەمەش دەلالەتی ناوی (بەهەشت)مان بۆ ڕوون دەکاتەوە، کە لەلایەکەوە گەیشتن بەو بەهەشتە هێمای پاکبوونەوە و پاداشت و خەڵات وەرگرتنە و لەلایەکی دیکەشەوە گەیشتنە بەترۆپکی چێژو هەروەها یەقین. دەکرێ لێرەدشدا ئەم ڕۆمانە لەگەڵ ڕۆمانی دانتی ( کۆمیدیای یەزدانی) بەراورد بکەین، کە هەردووکیان لە دۆزەخەوە بەرەو پاکژەکە و بەهەشت ئاراستەی ڕووداوەکانیان بەرێدەخرێن. دیارە لێرەدا سەبارەت بە ئەلەند ڕزگاربوونە لە کۆمەڵگەکەی خۆی کە وەکو دەۆزخ وایە و پرۆسەی خۆشەویستنی بەهەشتیش پاکژەکەکەیە و گەیشتن بەو بەهەشتەش، گەیشتنە بەدوا مەنزڵگای ئارامی، بەڵام ئەوەی لەکۆتایی ڕۆمانەکەدا ڕوودەدات ڕێك پێچەوانەیە و ئەلەند بەو بەهەشتە ناگات و دەگەڕێتەوە ناو چەقی دۆزەخەکە. هەڵبژاردنی مامۆستای زمانی کوردی وەکو دوو کەسایەتیی سەرەکیی بۆ دەور گێڕان لەم ڕۆمانەدا و هەروەها ئەو گفتوگۆیانەی نێوانیان لەبارەی زانستی زمانەوە، دەکرێت بە هەوڵێکی نوێ لە ڕۆمانی کوردی لەقەڵەمیان بدەین.

شوێن لەم ڕۆمانەدا (قوتابخانە)یە کە پێوەندییەکی تۆکمەی بە بابەتی دەقەکەوە هەیە و بەشدارە لە خستنەڕووی بابەتە زمانەوانییەکان. ئەگەر چی لە ڕۆمانی کوردیدا قوتابخانە وەکو شوێنێکی ڕووداو بەکارهاتووە، وەلێ شوێنێکی لاوەکییەو کەمتر ڕووناکی خراوتە سەر، بۆیە ئەم ڕۆمانە بە یەکەم ڕۆمانی کوردی دادەنرێت کە قوتابخانە وەکو دەزگەیەکی فێرکردن و پەروەردە بکاتە شوێنی سەرەکیی ڕۆمانەکە و ڕووداوەکانی تێدا گوزەر بکەن. قوتابخانە بەو پێیەی دەزگەیەکە مرۆڤ فێری زمانی دایك و زمانەکانی دیکەش دەکات و لەهەمان کاتیشدا زانست و زانیارییەکان بەهۆی زمانەوە بە قوتابییان دەگەیەنێت، لەم گەیاندنەشدا مامۆستایان

ڕۆڵــی ســـەرەکیی خۆیـــان دەگێـــڕن، بۆیـــە دەبیـــنین قوتابخانـــە شـــوێنێکی ســـەرەکییەو کەسایەتییەکانیشی کەمامۆستان و بەتایبەتیش مامۆستای زمـان و ئـەدەبی کـوردین ڕۆڵـی سەرەکیی لە ڕووداوەکانی ڕۆمانە بەرجەستە دەکەن.

لەدوو تۆیی ئەو دایەلۆگەی کە لەناوان هەردوو کەسایەتیی سەرەکیی بەڕێوەدەچێت، جگـە لەخۆشەویستییەکی پاك و بێگەرد، زمان و کێشەکانی زمان دەبێتە تەوەرەیەکی سەرەکیی لە ڕووداوەکاندا، کە ئەمەش بۆ یەکەمجارە لە ڕۆمانێکدا کێشەکانی زمان و ڕێزمان بکرێنە بابەتی باس. لەیەکێك لـەو دایەلۆگانـەدا، ئەلەنـد بەمشـێوەیە دایـەلۆگ لەگـەڵ بەهەشـت دەسـت پێدەکات:

((مامۆستای بەڕێز ڕێزمان لای تۆ چی دەگەیەنێت؟))

ئەو زەردەخەنەیەك گرتی و گوتی:

((ڕێزمان شارەزابوون لە زمان دەگەیەنێت))

((بەقسەی تۆ بێت ئەو قوتابیانەی ڕێزمانیان پێدەڵێین هیچ شارەزای زمان نین؟))

((من مەبەستم ئەوەیە کە قوتابییان شارەزای یاسا و دەستوورەکانی زمـانی کـوردی نـین، بۆیە ڕێزمانیان پێدەڵێین.. ئەوەیە مەبەستی من.))

((بەڵام ئەگەر قوتابیان یاسا و دەستوورەکان نەزانن شـارەزا نـەبن، ئـەی چـۆن بـەزمانی کوردی قسە دەکەن))

((....))

(( مامۆستای بەڕێز نەك قوتابییان، بگرە هەر کەسێکی کوردزمان بگریت ئەوە بە کوردی قسە دەکات، باشە چۆن بە کوردی قسە دەکات ئەگەر شارەزای یاسا و دەستوورەکان نەبێت))

((قوتابیان دەزانن قسە بکەن، بەڵام شارەزاییان لە یاسا و دەستوورەکان نییە، ئەو یاسـا و دستوورانەی کە لەلایەن زمانەوانانەوە داڕێژراون)). ل٢٠-٢١

لە بەشێکی دیکەی ئەو گفتوگۆیانەی نێوانیان ڕەخنە لە زمانەوانەکان دەگرن کـە بـەهۆی ئەو یاسا و ڕێسایانەی لەبارەی زمانەوە دایانهێناون، سەر لە خەڵکی دەشێوێنن:

((بەکورتی بەلای منەوە هەر کەسێك، کە لـەدایك دەبێـت و زمـانی دەوروبەرەکـەی فێـر دەبێت و قسەی پێـدەکات، ئـەوە گشـت یاسـا و دەسـتوورەکانی ئـەو زمانـە بـە بـێ هەڵـە بەکاردێنێت بەبێ ئەوەی خۆی پێیبزانێت، بەڵام زمانەوانـەکان بـە بیـانووی ئاشـنابوون بـە یاسـا و

دەستوورەکانەوە چەندین یاسا و ڕێسا دێننە گۆڕێ کە بەهۆیانەوە سەر لە خەڵکیش دەشێوێنن، خەڵکی کە یاسا و دەستوورەکانیان بەبێ هەڵە بەکارهێنا چیان داوە لە زمانەوانەکان؟))، ئەو لەسەرخۆ گوتی: ((دەزانی من لەوەدا لەگەڵ تۆدام، مرۆڤەکان کاتێك فێری زمانێك بوون بەشێوەیەکی خۆکارانەش هەموو یاسا و دەستوورەکان بەکاردێنن، ئەوانە فێری هەموو یاسا و دەستوورەکان دەبن بەبێ ماندووبوون، من ئەمەش بە بەخششێکی خودای مەزن بۆ مرۆڤەکان دادەنێم، بەڵام تۆ ڕاست دەکەیت مرۆڤەکان لە بەکارهێنانی یاسا و دەستوورەکان هەڵە ناکەن، کەچی زمانەوانەکان لە دەستنیشانکردن و دیاریکردنی یاسا و دەستوورەکان زۆر جار هەڵە دەکەن..)) ل۲۲

ئیدی لەوێوە ڕۆماننووس ڕەخنە لەسیستەمی پڕ لە هەڵەی پەروەردە دەگرێت و پێی وایە پێویستە ئەو سیستەمە پەروەردەییە سەرلەبەری هەڵبوشێنرێتەوە و دووبارە لەسەر شێوازێکی مۆدێرن دابڕێژرێتەوە، چونکە ئەو سیستەمە پەروەردەییە فاکتەری سەرەکیی دواکەوتوویی کۆمەڵگەیە. لەراستیدا سەباح مەجیدی ڕۆماننووس ئەمە یەکەمجاری نییە ڕەخنە لە سیستەمی پەروەردە دەگرێت و دەیکاتە تەوەری باسێکی نێو ڕۆمانەکەی، بگرە پێشتریش لە ڕۆمانی ( شانشینی تاڤگەکانی سۆز) بەهەمان بۆچوونەوە ڕەخنە لە سیستەمی پەروەردە دەگرێت. ئەوەی لێرەدا جیاوازە ئەوەیە کە ئەو ڕەخنەگرتنەی لە زمان و لە زمانەوانەکان پێوەست دەکات بە چۆنییەتی خوێندنی وانەی زمان و ئەدەبی کوردی لە قوتابخانەکاندا و هەروەها لەگەڵ گشت وانەکانی دیکەی ئەدەبی و زانستیشدا، کە بەڕای ئەو پێویستە سەرجەم ئەم وانانە بەشێوازێك دابنرێن کە لەگەڵ ڕۆحی سەردەم و ئاستی قوتابیان بگونجێت. هەر لەو ڕوانگەیەشەوە هەڵەکانی وانەی ڕێزمانی کوردی لە قوتابخانەکاندا بە ڕێزمانی کۆمەڵگە دەبەستێتەوە و پێی وایە کە بەهەمان شێوە سیستەمی کۆمەڵگەش وەکو سیستەمە پەروەردییەکە سەقەتە:

(( بەڵێ ڕێزمانی کۆمەڵگە... ئەو ڕێزمانەی کە وەك ڕێزمانەکانی قوتابخانە پڕاوپڕن لەهەڵە، ڕێزمانی کۆمەڵگە بۆ تۆ و من و ئەوانی دیکە بۆتە ئاستەنگ لەبەردەم مومارەسەکردنی حەزەکانمدا، منیش وەك تۆ بەحەسرەتی ئەوەم لەبەر باراندا ناخم بشۆمەوە ئەگەر ڕێزمانی کۆمەڵگە نەبووایە ئەوە ئێستە دەمانتوانی خۆمان بدەینە بەر ئەو بارانە خۆشە!)) ل۲۵

لەتەوەرێکی دیکەدا ڕۆماننووس باسی مامۆستا دەکات و ئەو وێنەیەی کە لەناو کۆمەڵگەی ئێمە بۆ مامۆستا گیراوە تێکی دەشکێنێت، ئەو وێنەیەی کە وای کردووە مامۆستا لە زۆر شت

خۆی بەدوور بگرێت و حیساب بۆ ورد و درشتی شتەکان بکات و لە هەمانکاتیشدا هەمیشە لەخەمی ئەوە دابێت قوتابییەکانی لە کاتی پیاسەکردن یاخود هەر کارێکی دیکەدا نەیبینن، کە بێگومان ئەمەش بۆ نەبوونی متمانە لەناوان مامۆستا و قوتابی دەگەڕێتەوە، کە ئەو متمانەیەش ئەگەر هەبێت لەناوانیاندا دیارە خۆشەویستییەکی دوولایەنە بەدوای خۆیدا دەهێنێ و ئەنجامی ئەو خۆشەویستییەش بێگومان هاوڕێیەتی نێوان مامۆستا و قوتابی لێدەکەوێتەوە. لەناو کۆمەڵگەی ئێمەدا هێشتا بەهۆی یاساو ڕێسا دواکەوتووەکان و هەروەها نزمی ئاستی ڕۆشنبیریی ئەو پێوەندییە هاوڕێیەتییە لەناوان مامۆستا و قوتابی دروست نەبووە و تا ئێستەش مامۆستا تەنیا بەچاوی قوتابی، نەك هاوڕێ تەماشای خودی قوتابییەکە دەکات و قوتابیش هەر هێندە خوێندنی تەواو کرد یان وازی لەخوێندن هێنا، بە ژیانی حەز ناکات مامۆستاکانی خۆی ببینێتەوە:

((دەبێت مامۆستا لەسەرخۆ و هێمن بێت، چۆن دەبێت خێرا بڕوات یان خوانەخواستە ڕابکات! ڕێزمانی قوتابخانە وای فێرکردین، کە نابێت مامۆستا خێرا بڕوات.. یان ڕابکات و حەیای خۆی لەبەردەم مامۆستایانی تر و قوتابییانیش ببات.. نابێت مامۆستا پێبکەنێت.. یان خوانەکردە نوکتەیەك بگێڕێتەوە.. نابێت مامۆستا لە بازاڕدا پیاسە بکات، ئەی ئەگەر قوتابییەك ئەوی لەکاتی پیاسەکردندا بینی؟ چیی ڕوودەدات؟ خۆ حەیا و شەرەفی چەند ساڵانی لەیەك چرکەدا دەچێت!)) ل٤٠.

ڕۆماننووس لە چنینی ئەو خۆشەویستییەی کە لەناوان هەردوو کەسایەتییەکە دروست دەبێت ئاوێتەی زمان دەکان و دەستەواژەو یەکەکانی زمان دەکاتە زمانێکی خۆشەویستی نێوانیان:

((چاوگ بۆیە پێی دەڵێن چاوگ چونکە سەرچاوەی داڕشتنی کارە، وا نییە؟))

(( بەڵێ وایە.))

((کەواتە دەتوانم لە چاوگی (خۆشویستن) کارێکی ڕانەبردووی تێپەڕ دروست بکەم کە بکەرەکەی جێناوی لکاو بێت بۆ کەسی یەکەمی تاك و بەرکارەکەشی جێناوی لکاو بێت بۆ کەسی دووەمی تاك بێت؟))

بێدەنگ بوو، دیاربوو بیری دەکردەوە... گوتی: (( دەی بزانم چۆن؟))

ڕووم تێکرد و بەهێمنی پێمگوت: (( خۆشمدەوێیت.)) ل٤٧

تەنانەت لەو کورتە نامە خۆشەویستانەش کە بە مۆبایل بۆ یەکتریان ڕەوانە دەکرد، ڕۆماننووس ئاوێتەی زمانی کردوون و بەیەکەوە چەند دێڕە شیعرێکی جوانیان پێکهێناوە:

دڵم وەکو جێناوێکی لکاوە

بەدڵی تۆوە لکاوە

ڕۆحم وەك بکەرێکی پەرۆش

بەرۆحی تۆ هەڵزناوە ... ل٥٥

یان لە نامەیەکی دیکە دەڵێت:

ئەمشەو بێ تۆ کارێکی ناتەواوم

دوور لەجوانیت سەرگەردان و پەشۆکاوم

سۆزی خۆتم بۆ بکە بە تەواوکەرێك

دەسا زووکە تا نەمردووم ماوم.. ل٥٦

لەهەندێك شوێنیشدا نووسەر لە ڕێگەی بەراوردکردنـەوە، وێنەیـەکی جـوانی خۆشەویسـتی بـۆ کێشاوین و بەهەمان شێوە سوودی لە دەستەواژە و یەکەکانی زمان بینیووە لەو بەراوردکردنەدا:

((ئاخر لەرێزمانی سەقەتی قوتابخانەکاندا کاری دزێو و ناشیاو ناقۆڵاش هـەر کـارن، بـەڵام لـە ڕێزمانی ئەوینی ئێمەدا کارەکان سادە بن یان داڕژاو یان لێکدراو، تەنیا و تـەنیا جـوان و شـیاون و مایەی بەخشبوونەوەی مرۆدۆستین)) ل٥٨

ڕێزمانی خۆشەویستی، ڕۆمانێکـە دەکرێـت لـەوێوە ئاشـنای ڕێسـا و یاسـاکان و دەسـتەواژەو یەکەکانی زمانی کوردی ببین، بێگومان ئەمەش بۆ خودی ڕۆماننووس دەگەڕێتەوە کە لـەم بـوارەدا خۆی مامۆسـتای زمـان و ئـەدەبی کوردییـەو لەمبارەیـەوە توانیویـەتی شـارەزایی خـۆی لەمـەڕ زمانەکەی و هەروەها پیشەکەی کە مامۆستایەتییە بەجوانی لە ڕۆمانێکـدا تـەوزیف بکـات و بـۆ یەکەمجار قوتابخانە بکاتە شوێنێکی سەرەکیی ڕۆمان و کێشەو گرفتەکانی زمـانیش بکاتـە تـەوەری باسکردنەوە.

# سەرچاوە و پەراوێز

ڕۆمان و پیشەی نووسینی ڕۆمان، و: ئەژی گۆران، چاپخانەی المشرق ـ بغداد ١٩٨٢، ل٩.
حنا عەبود، من تاریخ الروایە، من منشورات اتحاد الكتاب العرب، دمشق ٢٠٠٢ ص٦.
عەتا قەرەداغی، مەحوی لەناوان نەفسی ئەممارە و تواندنەوەی لەرۆحی بالآدا، فەرهەنگ ـ هەفتەنامەی فەرهەنگی هەولێر، ژ٤٤، ئابی ٢٠١٠، ل٥.

## دەسەڵاتی ئایدیۆلۆژیا و سیاسەت
## لە ڕۆمانی (ئاشتیی کوردستان)ی محەمەد ساڵح سەعیددا

ڕۆمانی ئاشتیی کوردستان کەلەلایەن: ( محەمەد ساڵح سەعید)ەوە، لەساڵی (١٩٧٠)دا نووسراوە، یەکێکە لەو چەند ڕۆمانەی کە لە سەردەمانێکدا نووسراوە، کە بزووتنەوەی نووسینی ڕۆمانی کوردی لەسەرەتاییدا بووە و نووسین و شارەزابوون لە تەکنیك و توخم و ڕەگەزەکانی ڕۆمان لەلایەن کوردەوە تازەکی ناسراو بووە. ئەم ڕۆمانە لەگەڵ چەند دانە ڕۆمانێکی دیکەدا لەسەرەتای سەدەی بیستەمەوە تا ساڵانی هەشتاکاندا، بناخەیەکی پتەو وتۆکمەیان بۆ مێژووی ڕۆمانی کوردی پێکهێناوە. ئەوەی لێرەدا ئێمە لەسەری دەوستین و جەختی لەسەر دەکەینەوە شەنوکەوکردنی جیهانبینینی ڕۆماننووسە لە دەقەکەدا، بەو واتایەی لە هزر و بۆچوونەکانی نووسەرەوە بتوانین پەی بە لاگۆشەکانی دەق ببەین و لە ئاستی ڕووداوەکاندا هەڵوەستە بکەین. لە هەموو ئەمانەشدا دەسەڵاتی ئایدیۆلۆژیا و سیاسەت لەسەر خودی نووسەر و ڕێڕەوی ڕووداوەکاندا دیاری بکەین.

ئەم ڕۆمانە لە (١٨) بەش پێکهاتووە، کە بەشەکان ژمارەیان لە (١-١٨) وەرگرتووە و لەیەکدیی جیاواز کراونەتەوە. لە سەرەتاشدا ئەگەر تێبینی ناونیشانی ڕۆمانەکە بکەین، دەبینین باس لە توندوتیژی و شەڕوشۆڕ دەکرێت. هەرچەندە ناونیشانەکەی (ئاشتی)یە، بەڵام دیارە کە ئاشتی پێچەوانەی شەڕە و تا شەڕ و جەنگ نەکرێت، بێگومان ئاشتی نابێت، واتە ئاشتی ئەنجامی شەڕە و هیچ شەڕێکیش نییە دواتر ئاشتی لەگەڵ خۆیدا نەهێنێت، بەچاوپۆشین لە ئەنجامی سەرکەوتن و ژێرکەوتنی لایەنەکانی.. لێرەدا ناونیشان کە وەکو کلیلێکە بۆ چوونە ناو ژوورەکانی دەقەوە و لەگەڵ یەکەم خوێندنەوەدا مەبەست و دەلالەتی خۆی بەدیار دەخات و لە هەمانکاتیشدا ناونیشان بەتەواوتی کەوتۆتە ژێر دەسەڵاتی ئایدیۆلۆژیا و سیاسەتەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا ناونیشانەکە زیاتر پێوەستە بە کۆتایی ڕووداوەکە، بەشێوەیەك کە سەرەتا و ناوەڕاستی ڕووداو ڕێکخۆشکەرێکن بۆ ئەوەی کۆتایی ڕۆمانەکە لەگەڵ ناونیشانەکەیدا یەکبگرێتەوە.

بێگومان مەسەلەی شەڕوئاشتیش یەکێکە لەمەسەلەکانی سیاسەت و پێوەندییەکی توندو قووڵی بە سیاسەتەوە هەبووە، بەتایبەتیش کەلەسەرەتاکانی سەدەی بیستەمەوە نەهامەتییەکانی شەڕ چارەنووسی مرۆڤیان خستبووە بارودۆخێکی ترسناکەوەو لەم پێناوەشدا هەستی گەلان لەدژی ماڵوێرانییەکانی شەڕ و جەنگ دەبزوا، بۆیە بزاڤێکی جیهانی لەپێناو چەسپاندنی ئاشتی لە جیهاندا هاتەئاراوە، چونکە (لەو ساڵانەدا ئاشتی بووبووە پێویستییەکی گرینگ و ئەرکێکی ئەنتەرناسیۆنالیزمی و دیاردەیەکی شارستانی و لەسەرتاپای جیهاندا بانگەوازی بۆ دەکرا، بە بنج داکوتانیشی هیوا و ئاواتی گەلانی دنیا چرۆی دەرکردەوە، پاش ئەوەی کارەساتەکانی جەنگی جیهانی دووەم کەشێکی ڕەشبینی بەدوای خۆیدا هێنا و تارمایی شەڕی سێیەمیش بە چەکی ئەتۆمییەوە هێندەی تر کەشەکەی فرەوان کرد و تۆی نائۆمێدی دەچاند، هەر بۆیە بزووتنەوەی ئاشتیخوازی بووبووە ئەو ڕوانگە و ئاواتەی کەدوا ڕۆژێکی گەشی مرۆڤایەتی لێوە دەبینرا )[1] ، ئەوەی کە دەبێت بگوترێت ئەوەیە کە هەرچەندە جیهانی سەرمایەداری پاڵپشتی لەم بزاڤە جیهانییە دەکرد، بەڵام زیاتر بلۆکی کۆمۆنیستی و وڵاتە سۆسیالیستەکان ڕابەرایەتیی ئەو بزووتنەوەیان دەکرد. بەشێوەیەك کە بزووتنەوەکەیان پێوەست بە ئایدیۆلۆژیا و سیاسەتی کۆمۆنیزم کردبوو، ئەمەش زیاتر بەهۆی بیری ئەنتەرناسیۆنالیستەکەی بوو، کە پێی وابوو مرۆڤەکان جیاواز نین و نەتەوەکانیش برای یەکن. هەر ئەمەش وای کرد ئەدەبیاتی سۆسیالیستی لە سەرتاسەری جیهاندا بانگەوازی ئاشتی و پێکەوەژیان بکات. دیارە (محەمەد ساڵح سەعید)ی ڕۆماننووسیش هەروەکو لە ناوەڕۆکی دەقەکەش دواتر ڕوونی دەکەینەوە لە ڕوانگەی ئایدیۆلۆژیای چەپەوە بەهەمان شێوە هەوڵی داوە بەشداری لەو بزووتنەوە ئاشتیخوازییە سیاسییە جیهانییەدا بکات و ڕۆمانەکەی لەژێر ئەو ئایدیۆلۆژییەدا نووسیووتەوە.

بۆ ئەوەی بتوانین کاریگەریی و کارتێکردنی ئایدیۆلۆژیا و سیاسەت لەسەر ئەو ڕۆمانە ڕوون بکەینەوە، ئەوا پێویست دەکات بزانین ئایدیۆلۆژیا چییە؟. ئایدیۆلۆژیا ((زاراوەیەکی لاتینییە، لە دوو وشەی (idea) کە بە واتای (ڕوخسار و وێنەی سروشت) دێت لەگەڵ وشەی

(logia)، کە بە واتای (بیری زانستی، یان زانیاریی دێت) و بەهەردووکیان واتای (وێنە، یـان ڕووخسـاری زانسـتی دەگەیـەنن، هـەروەها بـەلای فەیلەسـووفی فەرەنسـی (ئـەنتوان لـویس کلۆد)ــەوە ئـەم زاراوەیـە لـە دوو وشـەی (idea) واتـە (هـزر) و (logia) واتـە (زانسـت) پێکهاتووە بەسەریەکەوە واتای (زانستی بیر) یان (زانستی هزر) دەگەیەنێت))[1] .

لـە ڕووی زاراوەیشـەوە چـەندین پێناسـەی جیاجیـای بـۆ کـراوە و هەریـەکێك لـە گۆشـەنیگایەکەوە لـەم چـەمکەی ڕوانیـوە، ئـەم زاراوەیـە (هـەروەك لـە فەرهـەنگ و مەوسوعەکانەوە هاتووە، بریتییە لە سیسـتەمی تیـۆریی و بیرکردنـەوەی سیاسـی، یاسـایی، ڕەوشـتمەندی، ئێسـتێتیکی، ئـاینی و فەلسـەفی...هەروەها بەشـێکە لـەژێرخانی کۆمـەڵ و وشیاریی کۆمەڵایەتیی، کە پێوەندیی بەو ئەرکە کۆمەڵایەتییە هەیە، کە کۆمەڵ ڕووبـەڕوویان دەبێتەوە، بەمەش پێوەندییە کۆمەڵایەتییـەکان ڕەنگدەداتـەوە بەمەبەسـتی گـۆڕین یـان پـتر مکومترکردنیان))[3] بەم کارەش ئایدیۆلۆژیا ڕابەرایەتیی هونەری سیاسەت دەکات بۆ گۆڕینی ئاراستەکانی کۆمەڵگە و دیارخستنی پێوەندییە کۆمەڵایەتییـەکان. بـە واتایـەی ئایـدیۆلۆژیا ئامێرێکە بۆ دەرخستن و وەسفکردنی دنیابینینی کۆمەڵگە و دەربڕین لە قۆناخە جیاوازەکـانی کۆمەڵ، کە بەوردی سروشتی کۆمەڵایـەتیی و سیاسـی کۆمەڵگەکـەی لـە هـەر یـەکێك لـەم قۆناخانەدا شی دەکاتەوە و ڕاڤـەی دەکـات. بێگومـان هـەر ئایدیۆلۆژیایـەك بـە کەرەسـتەی تایبەتی لێکدانەوەکانی خۆیـەوە ئـەو شـیکردنەوە و ڕاڤەکردنـە ئـەنجام دەدات. واتـە بـەپێی چەندێتی ئایدیۆلۆژیاکان ڕوانگە و گۆشەنیگاکان دیاری دەکرێن و بەو پێودانگەش باری سیاسی و کۆمەڵایەتیی کۆمەڵگە گوزارشتی لێدەکرێت. جا ئەو شیکردنەوە و ڕاڤەکردنانە چ لە بواری تاك بێت یاخود لە بواری کۆمەڵگەدا بێت. بەمشێوەیە ئایدیۆلۆژیا لەو کاتانـەدا ڕێبەرایـەتی تاك و کۆمەڵ دەکات، کە ببێتە شێواز و جۆری بیرکردنەوەی خەڵکەکە، چ وەك تـاك بێـت، چ وەك دەستە و گرووپ. بۆ گەیاندنی ئەو ئایدیۆلۆژیایەش، ئایدیۆلۆژیسـتەکان جیـا لـە وتـاری سیاسی و کۆبوونەوەی جەماوەری، ئەدەب و هونەریشیان وەکو گۆڕەپانێك و چەکێکی کاریگەر بەکارهێنا بە مەبەستی بڵاوکردنەوەی بیروڕایەکانیان و کاریگەریی خسـتنە سـەر جـەماوەر و دروستکردنی ڕای گشـتیی. لـەم ڕوانگەیـەوە ڕۆمـانی ( ئاشـتیی کوردسـتان) یەکێکـە لـەو

---

١- عەباس محەمەد قادر، ڕیالیزم لە شیعری هاوچەرخی کوردیدا (١٩٤٦-١٩٧٠) مەڵبەندی کوردۆلۆجی، سلێمانی ٢٠١٠، ل٩١.

ڕۆواتانەی کە ڕۆماننووس لەژێر کاریگەریی ئایدیۆلۆژیا و سیاسەت نووسیویەتەوە و مەبەستی گەیاندنی ئایدیۆلۆژیایەکی دیاریکراو بووە، بۆیە باشترین کاریش لەمبارەیەوە هەڵبژاردنی ڕووداوی سیاسی و کۆمەڵایەتیی بووە، بۆ ئەوەی لە ڕوانگەی ئایدیۆلۆژیاکەی خۆیەوە خوێنەر لە خەباتی چینایەتی و دەرخستنی زوڵم و زۆری چینی دەرەبەگەیاتی ئاشنا بکات. بۆیەش ڕووداوی ڕۆمانەکە ڕووداوگەلێکی سیاسی لەخۆ گرتووە، کە تێیدا کار ئاسانییەکی زۆری بۆ ڕۆماننووس کردووە تا بەهۆیەوە ڕایەڵەکانی ئایدیۆلۆژیای خۆی تێدا بەیەك ببەستێتەوە. بەگشتیی ئەم ڕۆمانە چوار ڕووداوی سیاسی تێدا تۆمار کراوە:

١ـ بارودۆخی سیاسی سەردەمی پاشایەتیی لە عێراق، هەرچەندە ناوی پاشایەتی ناهێنرێت، بەڵام بەخستنەڕووی بارودۆخی سیاسی و کۆمەڵایەتیی لەو سەردەمەدا، ڕۆماننووس ویستوویەتی تیشکێك بخاتە سەر زوڵم و زۆری سیاسی و کۆمەڵایەتیی کە لەلایەن پیاوانی حکوومەتەوە لە میللەت دەکرا.

٢ـ سەرهەڵدانی شۆڕشی (١٤)ی تەمووز و گۆڕینی دەسەڵاتی پاشایەتیی بۆ کۆماری. ئەم شۆڕشەی کە بەشێك لە ڕووداوەکانی لە ئەستۆ گرتووە، بەڵام لەلایەن ڕۆماننووسەوە ڕاستەوخۆ ناوی نەهێنراوە.

٣ـ شۆڕشی ئەیلوول، کە تێیدا ئەو بارۆدخەی شۆڕش و ڕەنگدانەوەی لەسەر کوردستان پیشان دراوە، بەهەمان شێوە ڕاستەوخۆ ئاماژە بە ناوی ئەم شۆڕشەش نەکراوە.

٤ـ ڕێککەوتننامەی (١١)ی ئادار، کە ناونیشانی بەشەکە ڕاستەوخۆ بەو ڕووداوە سیاسییە بەستراوەتەوە و ڕۆماننووسیش بە پێچەوانەی ڕووداوە سیاسییەکانی دیکەوە بە ئاشکرا ناوی هێناوە و بەهۆی ئەم ڕووداوە سیاسییشەوە ئاشتیی لە کوردستان دەخاتەڕوو و کۆتایی بە ڕۆمانەکەی دەهێنێت.

ڕۆماننووس ئەم چوار ڕووداوە سیاسییەی لە شوێنێکی دیاریکراودا، کە گوندێکی کوردستانە و لە چوارچێوەی ململانێی چینایەتیدا دەخاتەڕوو. شار هەرچەند باسکراوە، بەڵام بوونی شار لە بوونی دامودەزگەکانییەتی (دادگە، زیندان) و لەبەرانبەر گونددا، بوونێکی زۆر لاوەکییە. ئەمەش ڕاستەوخۆ پێوەستە ئایدیۆلۆژییەتی ڕۆماننووس خۆیەوە، چونکە ئەو زیاتر جەختی لەسەر چینی جوتیار و کرێکار کردووەتەوە. تەنیا لە بەشی دەیەمدا نەبێت کە مام زۆراب لە شاردایە ڕووناکی خراوەتە سەر ژیانی شار، ئەویش لە گۆشەنیکای ئایدیۆلۆژییەوە،

کاتێك باسی پیشەی کرێکاری مام زۆراب دەکات. واتە تەواوی ڕۆمانەکە لەلایەکەوە باسکردنی گوندەو لەلایەکی دیکەشەوە پیشاندانی ژیانی جوتیارانی گوندەکەیە. ڕۆماننووس ئەم ڕووداوە سیاسییانەی تێکەڵ کردووە لەگەڵ ململانێی نێوان ماڵی ڕۆستەمە سوور، کە لەلایەن میرییەوە کراوەتە دەرەبەگ و کوێخای گوندەکە و لەلایەن پیاوانی میرییەوە پشتگیری دەکرێت، لەگەڵ بنەماڵەی هێمن و مەریوان، کە وەکو کەسانێکی جوتیار، بەڵام هۆشیار بە سیاسەتەکانی میری و دژ بە دەربەگایەتین. بارودۆخی سیاسی لە سەردەمی پاشایەتیدا، کە قۆناخی یەکەمی ڕۆمانەکە پێکدەهێنێت پشکی هەرە زۆری ڕووداوی ڕۆمانەکەی بەر کەوتووە، ئەم قۆناخە لە بەشی یەکەمە و تا بەشی سیانزدەهەم بەردەوام دەبێت، واتە سێیەکی ڕۆمانەکەی گرتووەتەوە و تێیدا ڕۆماننووس زۆر بەوردی ململانێی نێوان ئەم دوو بنەماڵەیە و لەسەر دوانەکانی (چاك ـ خراپ) و( جوان ـ ناشیرین) و (نیشتمانپەروەر ـ نۆکەر و ناپاك) و...هتد، دارشتووە. زۆری ماوەی ئەو قۆناخە مەبەستێکی ڕۆماننووس بووە، کە مەبەستەکەش زیاتر مەبەستێکی ئایدیۆلۆژییە، بەوەی کە دەیەوێت بە هێواشی خوێنەر بە تاوانەکانی ئەم قۆناخە بناسێنێت و بیخاتە نێو کەشوهەوایەکی چینایەتییەوە و ڕق و کینەی لە بەرانبەر سیستەمی دەرەبەگایەتیی بورووژێنێت، بۆیە لەم قۆناخەدا زیاتر جەختی لەسەر ئەوە کردووەتەوە کە زوڵم و زۆرداری ڕۆستەمەسوور و دەستە و تاقمەکان و دەستدرێژی و داوێن پیسی ئەوان پیشان بدات لەبەرانبەر بێتاوانی و پاکو بێگەردی چینە ڕەشوڕووتەکە. لەم قۆناخەدا ڕۆماننووس زەمینەسازییەکی تەواوی بۆ شۆڕش و گۆڕانی بارودۆخەکە کردووە، هەمیشە هەوڵیداوە لە هۆشی خوێنەر ئاماژەکانی سەرهەڵدان و شۆڕش بچەسپێنێت:

(جاروبار بڵاوکراوەی جووتیارانە کە هەندێ خەبەری دڵخۆشکەری بڵاو دەکردەوە، کەمێك سوکنایی پێی دەهات، وەکو ئەوەی ئەفسەرە ئازادەکان و گۆڕینی بارودۆخەکە و ڕێککەوتن و داوای بەربوونی گیراوەکان و...) ل١٢٤

(دیسان دەڵێن جووڵە جووڵەکە و موزاهەرە و جووتومووتەکە، دەستیان داوەتە شتە قۆڕەکان) ل١٤٠.

لەم بەشانەدا ڕۆماننووس بەشێوەیەکی تەواو کەوتووەتە ژێر دەسەڵاتی ئایدیۆلۆژیا و ڕووداو هەمووی لەژێر ڕکێفی ئایدیۆلۆژیا دایە و ڕێچکە و ڕێڕەوەکانی ڕووداو بەپێی بیروبۆچوونە سیاسییەکانی خودی ڕۆماننووس تەی دەکەن، بەهەمان شێوە کەسایەتییەکانیش لە ڕەنگ و

ڕووکاری ئایدیۆلۆژی ڕۆماننووس ڕزگاریان نەبووە و لە هەڵسوکەوت و ڕفتارەکانیاندا جێ دەستی ڕۆماننووس بەتەواوەتی هەستی پێدەکرێت و زۆر جار بەشەکانی ڕووداو و هەڵسوکەوتی کەسایەتییەکان لە قاوغی قەناعەت پێهێنانی خوێنەر دەچێتە دەرەوە و لەگەڵ کەتواردا وێك نایەتەوە، هەر بۆ نموونە لە کەسایەتیی (پیرۆزە)دا، هەر زوو ڕۆماننووس ئەوەمان پێدەڵێت کە پیرۆزە کچە هەژارێکە، بەڵام زۆر ناشرینە، لەبەرئەوەش بە (پیزە چاو قیچ) ناو دەبرێت، بەکارهێنانی ئەم نازناوە خۆی لەخۆیدا وێنەکێشانێکی گونجاوە بۆ پیشاندانی ناشرینی ئەم کەسایەتییە و خوێنەر هەر لەگەڵ خوێندنەوەی ئەم ناوە یەکسە زیهنی بۆ دەموچاوێکی ناقوڵاو ناشیرین دەچێت. هەر لەسەرەتاوەش ڕۆماننووس پێمان دەڵێت کە مینەی ڕۆستەمەسور پەلاماری پیزەی داوە:

(ئێوارەیەك لەم بەینەدا مینەی ڕۆستەمە سوور لە ڕێی کانی پەلاماری داوە...) ل١٧.

هەر لەبەرئەوەی کە مینە حەزی لە پیزەیە بۆ ڕابواردن، باوکی لە گوندەکە شار بەدەر دەکەن و لەشار کۆچی دوایی دەکات. پرسیار لێرەدا ئەوەیە کەسێك بەم شێوەیە ناشرین بێت، بەم شێوەیە خەڵك بەدواوەی دەبێت؟ جیا لەمەش نووسەر لە بەشەکانی(١٠ ـ١١ـ ١٢)دا، ڕابورادن و هەڵخەڵەتاندنی پیزەی لەماڵی ڕۆستەمە سوور تەرخان دەکات، کە لەلایەن مینەو باوکییەوە دەستدرێژی دەکرێتە سەر و تەنانەت بۆ بەرپرسەکانی حکومەتیش ئامادەی دەکەن:

( ئەمشەو میوانمان هەیە، کچێ بە پاکیی وەرە بەردەمیان، ئەمجارە میری بەڕێوەبەر دێت، ئەمشەو نابێت لەهیچی کەم بێت، بێ دڵیی نەکەیت ها، ئەوە پێم گوتی...) ل١٤٥.

ڕاستە ڕێی تێدەچێت مینە پەلاماری پیزە بدات، تەنیا بۆ تێرکردنی غەریزە سێکسییەکانی، بەڵام کەسێك ئەوا ناشیرین بێت چۆن بۆ بەرپرسان ئامادە دەکرێت! لێرەدا نووسەر زێدەڕۆییەکی نەگونجاوی کردووە، ڕاستە ڕۆماننووس بۆی هەیە زێدەڕۆیی بکات، بەڵام دەبێ ئەم زێدەڕۆییەی لە چوارچێوەی کەتوار دەر نەچێ و خوێنەر قەناعەتی پێیان هەبێ. پێموایە ڕۆماننووس لەژێر کاریگەرێتی ئایدیۆلۆژیاییەکەدا و بۆ ئەوەی زوڵم و زۆری چینی دەرەبەگایەتی پیشان بدات، کەوتۆتە نێو ئەم جۆرە نەگونجاوییەوە، لەلایەکی دیکەشە مەسەلەی چاوتێبڕینی مینە لە گوڵەوە، ڕۆماننووسی ناچار کردووە پیزە بەشێوەیەکی ناشرین پیشان بدات و تەنانەت بیکاتە پۆستەچییەکی مینە و بیروڕای مینە بە گوڵە بگەیەنێت کە بێگومان گوڵە هەر زوو هەستی بەمە کردبوو، بۆیە زوو لەو ئەرکەیدا دۆڕا. پێموایە ئەگەر

ڕۆماننووس پیزەی بەم شێوەیە پیشان بدابوایە کە کچە هەژارێکی زۆر جوانە و بێ باوك و بێ لانەیە و خەڵکی گوندی چاویان تێبڕیوە و لە جوانیدا پێشبڕکێ لەگەڵ گوڵەدا دەکات، هەروەها مینەش چۆن پیزەی لەخشتەبرد و دەستدرێژی کردە سەر، دەیوست بەهەمان شێوەش لەگەڵ گوڵە بێت، بە شێوەیەکی زۆر باشتر تانوپۆی ڕووداوەکانی دەکرد و لەهەمان کاتیشدا تەشویقێکی دیکەشی دەخستە نێو ڕۆمانەکە.

وێنەکێشانێکی لەم جۆرە زوڵم و زۆرداری و داوێن پیسی چینی دەرەبەگایەتی بە دەیاردەخست، هەروەها ململانێیەکی جوانی لەناوان عەشقێکی پاك و بێگەردی نێوان مەریوان و گوڵەی ئامۆزای لەگەڵ ئەو عەشقە درۆو فریودراوانەی مینە دروست دەکرد و لەهەمان کاتیشدا بەجوانکردنی پیزە و دواتر کەوتنە نێو داوی مینەو سکپڕکردن و کوشتنی لەلایەن برایەکەیەوە لەسەر تاوانی شەرەف، هەست و سۆزی خوێنەری دەرووژاند و دەیهەژاند، بەڵام لێرەدا بە بەخشینی ڕوخساری ناشرین و ناقولا بە کارەکتەری پیزە، ئەم وێنەیە ناتەواو کەوتۆتەوە و کاریگەرییەکانی خۆی لەدەست داوە. لەمڕووەوە وای بۆ دەچم ڕۆماننووس ئەوەندە لەخەمی کێشانی هێڵە سەرەکییەکانی ئایدیۆلۆژی خۆیەتی، ئەوەندە لەخەمی وێنەکێشانی ڕاستەقینەی ڕووداوەکانی نییە.

ڕۆماننووس بەشەکانی (١٣-١٤-١٥)ی تەرخان کردووە بۆ ڕوودانی شۆڕش و گۆڕانی بارودۆخەکە. بێگومان هەروەکو باسمان کرد زۆربەی ڕووبەری دەقی ئەم ڕۆمانە بۆ باسکردنی بارودۆخی پێش شۆڕشە و پیشاندانی خراپی دەسەڵاتی پاشایەتییە، بۆیە لە زۆربەی بەشەکانی پێش ڕوودانی شۆڕشەکە ئاماژە و هێما بۆ هەڵگیرسانی شۆڕش و ڕاپەڕین و گۆڕانی بارودۆخ و سەرکەوتنی هێزی حەق کراوە و لەم ڕووەوە ڕۆماننووس چەند مەبەستێکی هەبووە لەوانە ویستوویەتی بەپێی بیروباوەڕە ئایدیۆلۆژییەکەی خۆی خوێنەر ئامادە بکات بۆ ئەوەی، کە باوەڕی بەوە بهێنێت کە هێزی پێشکەوتوخوازی چەپ شۆڕشەکە هەڵدەگیرسێنن و ئەوان دانەمۆی گۆڕانگاریی و بەدیهێنانی خەونەکانی مرۆڤی چەوساوە و زوڵملێکراوانن، بۆ ئەمەش لە سەرەتاوە تا دەگاتە هەڵگیرسانی شۆڕش، چەندین هێمای تایبەت بە ڕێکخستنی جوتیاران و کرێکاران بەکاردەهێنێت، هەر بۆ نموونە لەکاتی دادگەیی کردنی مەریواندا، مەریوان بەئاشکرا ئەم بۆچوونەی سەرەوەی ڕۆماننووس دەردەبڕێت:

**(تێشیگەیاندن کە ئەم خۆی یەکێکە لە لایەنگرانی جووتیـاران و ئـەو دامودەزگەیـەش بەسەرچاوەی سەر لێ شێواندنی ئەو خەڵکە دادەنێت) ل٩٦**

بۆیە ڕۆماننووس لە بەشی چواردەیەمدا کاتێك، کە شۆڕش کراوە و دەسـەڵاتی پاشـایەتی ڕووخاوە و مەریوان لە زینداندا ئازادکراوە، دووبارە ئەوە بەبیر خوێنەر دەهێنێتەوە، کە خـودان ڕاسـتەقینەی شـۆڕش و هەڵگیرسـێنەری گۆڕانکـاری و بەدیهێنـەری ئازادییـەکان، چـەپ و ڕێکخستنەکانی جووتیاران و کرێکارانن، بۆ نموونە لە دیمەنی ئازادکردنی مەریواندا باس لەمـە دەکات:

**(ئەمە ئەوەیە تۆی هێنایە دەرەوە.... تۆی قوتار کرد لە بەندییەکی دوور ودرێژ، ئەوانە هێزی کرێکارە مانگرتووەکانی ئەوسان، بەڕاستی پاڵەوان بوون... مەریوان لەناوان خەسـرەو هیوادا وەستا بوو، دەستێکی بەدەستی ئـەمیان ئـەویتر لەقولەمسـتی ئـەودا، بەسـۆزێکی پەژاراویی، دوای هەناسەیەکی تاڵ:( ئای... کەسە دڵسۆزەکانم، چەندین شەومان بەورتە ورتی ئەم مەسەلانەوە ڕۆژ کردووەتەوە، لەناوان بڕوابوون و بێ بڕواییدا...، لەناوان هیوا و ئاواتی گەرموگوڕ ترس و بیم و نامۆییدا... ئێستە بەتەواوی تێگەیشتم...) ل١٥٥**

سەرەڕای ئەمەش بەربوون و ئازادبوونی مەریوان لە زینداندا وێنەی کێشراوە، بەڵام دەبوایە ڕۆماننووس زیندانییەکانی دیکەش، کە لەگەڵ مەریوانـدا بوونـەو تەنانـەت لـە ڕێکخسـتنی چەپەکانیشدا کاریان کردووە، لەپێش ئازادبوونی مەریوان یان لەگەڵ ئازادبوونی ئەودا باسـیان بکردایێ. ئەوەی جێگەی باسە لەکاتی هەر گۆڕانێکی سیاسی و ئەمنیدا، یەکـەم شـتێك کـە ڕوودەدا ئەوەیە کە زیندان دەشکێت و زیندانیان ئازاد دەبن، چونکە زیندانییەکان هەمیشە لـە دەسەڵاتی چەوسێنەردا شوێنی بێ تاوان و کەسـانی بەرهەڵسـتکارن، نـەك دوای سـەرکەوتنی شۆڕش زیندانییەکان تەنانەت ئەوانەی کە بەشێك بوونـە لـەو ڕێکخسـتنەی کـە بەشۆڕشـەکە هەڵساوە، چـاوەڕوانی فـەرمانی ئازادبوونیـان بکـەن. دەکـرا ڕۆمـاننووس لەڕێگـەی شـکانی زیندانییەکە و ئازادبوونی زیندانیان و تێکەڵبوونیان لەگەڵ ئاپۆرای جـەماوەری خۆپیشـاندەر، وێنەیەکی جوانی ئازاد بوون و سەردەمی نوێی کێشابا.

ڕۆماننووس تەنیا بەشی سێزدە و نیوەی بەشی چواردەی بۆ ڕوودانی ئـەم شۆڕشـە تـەرخان کردووە و لەناوەکەی دیکەی بەشی چواردەشدا، وێنەی ئـەو بارودۆخـەی کـە شـۆڕش هێنایـە کایەوە دەکێشێت و ئامـادەیی خـەڵکی و پێشـوازیکردنیان لـە گۆڕانکارییـەکان و هـەروەها

بارودۆخی دەروونی پیاوان و دارو دەستەی دەسەڵاتی پاشایاتیش دەخاتە نێو ڕووناکی و هەوڵ دەدات ڕێگە خۆش بکات بۆ ئەوەی چارەنووسی ئەو کەسانەی تا دوێنێ لە دژی بەرەی گەل بوون دیاری بکات و خوێنەر بە کۆتایی و سزادانی ئەو کەسانە دڵخۆش بکات، بەڵام لەجیاتی ئەوەی شۆڕش و دەسەڵاتی کۆماری نوێ دادگە دابمەزرێنێت بۆ ئەوەی کەسانی خوێنمژ و زۆردار و زاڵم، ئەوانەی سەر بە دەسەڵاتی پاشا بوون بەپێی یاسا سزا بدات و هەروەها ڕێگە بە خەڵك بدات هەرچی سکاڵا و گلەییان هەیە لەسەر ئەو زوڵم و زۆردارییە بەشێوەیەکی فەرمی پێشکەش بە دادگە بکات، بەتایبەتیش لەم ڕۆمانەدا کە دەبوایە ڕۆستەمە سوور و مینەی کوڕی لەلایەن دەوڵەتی نوێیەوە دەستگیر بکرابوانێ، یان هەر هیچ نەبێت لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ کرابوایە، چونکە ئەگەر دەسەڵاتی نوێش لەو کەسانە خۆشبووبێت، ئەوا ڕۆماننووس دەبێ ئاگای لەوە بێت کە خۆی لە بەشێك لە ڕووداوەکاندا بەهۆی تاوانێکەوە کە لەلایەن مینەوە ئەنجامدراوە کە برێتییە لە کوشتنی شەفەی شوان، کە بەناحەق بەملی مەریوانیان کرد و حەوت ساڵ لەزیندانیان خست، دەبوایە لەڕێگەی ئاشکراکردنی مەتەڵی کوشتنی شەڤەی شوانەوە، مینە و ڕۆستەمە سوور زیندانی کرابان، بەتایبەتیش ڕۆماننووس خۆی ئاماژەی بەوەداوە کە خەڵکی گوند گومانیان لە مینەیە، کەچی لەجیاتی ئەوەی ڕۆماننووس ئەو تاوانە بکاتە کۆدێك بۆ دەستپێکردنی کۆتایی دەسەڵاتی دەرەبەگایەتی ڕۆستەمەسور، ڕووداوێکی دیکەی خولقاندوە کە پێشتر هیچ زەمینەسازییەکی بۆ نەکردووە و خوێنەر لەناکاو و بێ هیچ پێشینەیەك ڕووبەڕووی ئەوە دەبێتەوە کە سوورە لەگەڵ گوندێکی دیکەدا دەبێتە دوژمندارییان و لەهێرشێکی مینە و چەکدارەکانی بۆ سەر گوندەکە دەکەونە نێو بۆسەی ئەوانەوە و سوورە دەکوژرێت و ڕۆستەمەسووریش لە داخی کوژرانی مینە دەمرێت. لە ڕاستیدا ئێمە نازانین ئەو گوندە کێن و چ پەیوندییەکان لەگەڵ گوندەکەی مینەدا هەیە؟ هەروەها لەتەواوی ڕۆمانەکەدا بوونی پێوەندیی نێوان ئەم دوو گوندە نەهاتووە و ناشزانین هۆکارەکانی هەڵگیرساندنی ئەم دوژمنکارییە چ بووە؟ لەبەرچیش ڕاستەوخۆ لەدوای شۆڕش ئەم دوژمندارییە دروست دەبێت؟.
خوێنەر لەکاتێکدا چاوەڕێی ئەوە دەکات چارەنووسی ئەو دەرەبەگەیە بزانێت و دڵی ئاو بخواتەوە بە چەسپاندنی یاسا و دادپەروەری، لەناکاو ڕووبەڕووی ئەم ڕووداوە دەبێتەوە و بەیەکجار هەموو ئەو کارەکتەرانەی کە زوڵم و زۆردارییان دەکرد لەناو دەچن. جیا لەمەش ڕۆمانووس لەڕێگەی هێنانی کارەکتەری مەلاوە بۆ گێڕانەوەی ئەم ڕووداوە، هەوڵیداوە

چارەنووسی ئەوانە بە ڕەهەندێکی ئاینییەوە پێوەست بکات و وا پیشان بدات کە حەزو خواستێکی خواوەندانە لەپشت ئەم ڕووداوەدا هەبووە:

**(مامۆستای مزگەوتی گوندەکە، بۆ یەکەمجار لەسەر بەردەنوێژەکان بەدەنگی بەرز سڵاواتێکی دا، سەری هەڵبڕی بۆ ئاسمان، ئەمجا بە ئەسپایی و لەژێر لێوەوە گوتی:**

**ـ گەردوون...، هەر خۆت دەزانیت چی دەکەیت... خۆزگە هەموو تۆڵەیەکت ئەئاوا دەسەند و پیشانی بەندەی ڕووڕەشت دەدا...**

**تا زۆردار بەرپێی خۆی ببینێت و دڵی بەردی ببێت بە ئاو.. دوایی، مامۆستا مەلا گوێی بۆ گێڕانەوەی کوژرانی مینە هەڵخست کە یەکێ لەوانەی لەگەڵ تەرمەکەیدا هاتبوون....)ل ١٧٢**

لەدوا بەشەکانی کۆتایی ڕۆمانەکەدا، واتە لەبەشەکانی (١٦،١٧،١٨)دا، ڕۆماننووس باس لە بارودۆخی گوندەکە لەپاش شۆڕش و هەروەها بارودۆخی بنەماڵەی مەریوان و هێمن دەکات، بەڵام کۆمەڵێك ڕووداوی دژ بەیەك تێکەڵ بەیەکتر دەکات و پەلەییەکی زۆر بە تێکەڵکردنی ئەم ڕووداوانەدا دیارە و بوونەتە سەرلێشێوانی خوێنەر و لە قەبارەیەکی بچووکدا خوێنەر ڕووبەڕووی کۆمەڵە ڕووداوێکی دژ بەیەك دەکرێتەوە. هەروەها لەو سێ بەشەدا بە ئاشکرایی هەست بە پەرش و بڵاوی بیروڕایە سیاسی و ئایدیۆلۆژییەکانی ڕۆماننووس دەکرێت و ڕۆماننووس نەیتوانیوە بەردەوام بێت لەسەر ئەم ئایدیۆلۆژییەکەی خۆی کە زۆر بە ڕژدی لە سەرەتاوە لەسەری ڕۆیشتووە و تانوپۆی ڕووداوەکانی لە قەبارەیەکی گەورەی دەقی ڕۆمانەکەیدا بەو ئایدیۆلۆژییەتە داڕشتووە.

کات لە گێڕانەوەی ڕووداوەکاندا لەم سێ بەشەی کۆتاییدا زۆر بەخێرایی بەڕێکراوە و خوێنەر، کە لە بەشەکانی یەکەمەوە تا ئەو سێ بەشەی دوایی، هەموو هۆش و هەستی لە قۆناخێکی دیاریکراو سنووردارکراوە، کە قۆناخی دەسەڵاتی پاشایەتی و شۆڕشە بەسەر ئەو دەسەڵاتە، واتە کات لە ڕەوتی  ڕووداوەکاندا نیمچە چەسپاوییەك بەخۆیەوە دەبینێت، کەچی تەنیا لەو سێ بەشەی کۆتاییدا کات لە ڕوودانی شۆڕشە لە ساڵی(١٩٥٨) تا ساڵی(١٩٧٠) و بەیاننامەی یانزەی ئادارە، واتە کات لە گێڕانەوەی ڕووداوەکاندا یەکجار خێرا کراوە و ڕووداوگەلێکی زۆر لەم ماوەیەدا بەڕێخراوە کە بوونەتە هۆکاری ئەوەی خوێنەر تووشی ماندوو بوون و شەکەتییەك بکەن تا دەگاتە کۆتایی ڕۆمانەکە، کە بریتییە لە سەقامگیربوونی ئاشتی

لە کوردستاندا، ئەو ئاشتییەی کە کلیلی ناونیشانی ڕۆمانەکە لەخۆ دەگرێت، واتە لە کۆتـایی دەقدا خوێنەر دووبارە لەگەڵ مەبەست و مەغزای ناونیشانەکە ئاشنا دەبێتەوە.

لەکاتێکدا ماوەی دوو ساڵ بەسەر ئاشتی و خۆشگوزەرانی لەگوندەکـە لـەدوای شـۆڕش و لەژێر سایەی ئەو شۆڕشەی کە ڕێك لەگەڵ بۆچوون و ئایدیۆلۆژیای سیاسی ڕۆمـاننووس خـۆی یەکدەگرێتەوە هاتبووە ئاراوە، کە چی لەناکاوێك و بێ هیچ پێشینەیەك دەسەڵاتی ئەم شۆڕشە لەلای ڕۆماننووس دەبێتە ((دوژمن)) و هێرش دەهێنێتە سەر گوندەکە:

**(هەتا ئەو بەیانییەی کارەساتی جەرگبڕ ڕوویدا... گوند درایە بەر تۆپ و ئەو ناوە گوللە باران کرا... خەسرەوی برای گوڵەخان بەر گوللەی وێـڵ کـەوت و دەمـی نـەدا بەیەکـدا... خەرمانەکانی نێزیك دێ ئاگری تێبەردا....، گوڵە گڕی گرتبوو، هەناوی کەوتبووە خوارەوە، بەناو سکی برژاوەو، چۆن شێتی سەر لێشێواوی لێهاتبوو...، هێمن هەڵات و بۆی دەرچـوو، خۆی کرد بەناو شۆڕشـدا... مـەریوان لـەماڵ نەهاتـە دەرێ... گوڵـە نـاو دەرگاکـەی لـێ گرتبوو....، چەرە دووکەڵی لێزمەی گوللەباران تەواو بوو...، گەرداوی لەپڕی هێرش هێنانی دوژمن بڕایەوە.... سوپا هەر جارە لە قۆڵێکەوە هێرشی دەبرد، دوای دەستدرێژی و وێرانکاری دەکشایەوە و لەشوێنێکی ترەوە شاڵاوی دەبرد..) ل١٨٠**

جارێ لێرەدا باس لەوە دەکەین خوێنەر لەناوکاوێکدا شۆڕشێکی دیکەی بۆ باسـکراوە بـێ هیچ پێشەکییەك و بێ ئـەوەی زەینـی خوێنـەر بـۆ ئـەو مەبەسـتە ئامادەکرابێـت. ئەمـەش لەوەکاتەدایە کە ڕۆماننووس ئاماژە بە ڕۆیشتنی هێمن بۆ ناو شـۆڕش دەکـات، گواسـتنەوەی خوێنەر لـە شۆڕشـێکەوە بـۆ شۆڕشـێکی دیکـە پێویسـتە هۆکـار و بارودۆخەکـەی بـۆ ڕوون بکرێتەوە، بەتایبەتیش لەم ڕۆمانەدا، کە زیاتر جەخت لەسەر ئایدیۆلۆژییـەتی چـەپ کـراوە و ڕۆمـاننووس بەشـی هـەرە زۆری ڕووبـەری دەقـی ڕۆمانەکـەی بـۆ مەسـەلە چـینایەتییەکە دیاریکردووە کە لەدواجاردا دەبێتە شۆڕشێك کە چـینی زەحمـەتکێش ئـەنجامی دەدەن، بـەڵام لەناکاو لە دوابەشی ئەم ڕۆمانەدا، ئەم شۆڕشەی کە ڕۆمـاننووس لایـەنگری بـووە و جـەختی لەسەر کردووەتەوە، بۆشۆڕشێکی نەتەوەیی دەگوازرێتەوە، لەراسـتیدا بـەرگریکردن لەنەتـەوە، مافی ڕۆماننووسە، هەروەها گۆڕانی هەڵوێستە سیاسییەکانیش بەتایبەتی ئەگەر هۆکارەکـانی ڕوون بێت ئاساییە، بەڵام پێویسـتە زەمینەسـازی بـۆ ئـەم گۆڕانکارییانـە بکرێـت و لـەناکاو خوێنەران ڕووبەڕووی ئەم گۆڕانکارییە سیاسییە گەورانە نەبنەوە کە تەواوی ئەو بیروبۆچـوونەی

کە مەبەست بووە پێی بگەیەنرێت مایەپووچ دەربچێت. ئەمە لەلایەك، لەلایەکی دیکەشەوە پێویستە گۆڕانکاری لە هەڵوێستێکی سیاسییەوە بۆ هەڵوێستێکی دیکە بە شێوازێك بێت، چوارچێوە گشتییەکە پارێزراو بکات، هیچ ماقووڵ نییە ڕۆماننووس سێ بەشی ڕۆمانەکەی بۆ ئاشکراکردنی گەندەڵییەکانی دەسەڵاتی پاشایەتی تەرخان بکات و شۆڕش لەدژی ئەو ستایش بکات، دواتر لەهیکرا ئەو شۆڕش و ئەو دەسەڵاتەی کە لە هەوێنی ئەو شۆڕشەوە هاتووەتە ئاراوە بە دوژمن لە قەڵەم بدات. هەر هیچ نەبێت پێویستە خوێنەر لە هۆکارەکانی ئەم ناونانە ئاگەدار بکرێتەوە، بۆ نموونە دەیتوانی ئاماژەیەك چێ بکات بەوەی، کە شۆڕشەکە لە ڕێڕەوی ڕاستەقینەی خۆی لایداوە، بۆ ئەوەی زەمینەیەك بخولقێنێت تا بە دوژمن ناوی بهێنێت.

سەرەڕای ئەمانەش، ئەگەر بەچاوێکی وردوە لەم وێنەیە بڕوانین کە نموویەکمان لێی وەرگرتووە و باس لەوە دەکات، کە سوپای شۆڕش لە چەند قۆڵێکەوە هێرشی هێناوەتە سەر ئەو گوندە بچووك و ئارامە و خەڵتانی خوێنی کردووە و وێران و خاپووری کردووە، ئەم وێنەیە چەند جیاوازی گەورەی لەگەڵ ئەو وێنەیە هەیە کە ڕۆماننووس بەشی هەرە گەورەی لە ڕووبەری دەقی پێ بەخشیووە و باس لە خراپەکارییەکانی دەسەڵاتی پاشایەتی دەکات و چۆن لەو گوندە بچووکەدا ئەو دەسەڵاتە هەڵسوکەوتی کردووە و بە چەندین شێوازەوە ڕۆماننووس وەسفێکی خراپی دەکات، لەکاتێکدا ئەو گوندە لە سەردەمی پاشایەتیدا ئەوپەڕی دەربەگێکی لەسەر قوتکرابوویەوە و ناعەدالەتی لە بەڕێوەبردنی ولاتدا هەبووە، کەچی ئەمجارەیان زۆر خراپتر لە سەردەمی دەسەڵاتی پاشایەتی، لەسەردەمی شۆڕشدا ئەم گوندە دەدرێتە بەر ڕێژنەی گوللە و تۆپ و وێران دەکرێ و خەڵکەکەی دەکوژرێت. کامە وێنە سامناکتر و ترسناکترە، ئەگەر خوێنەر سەرپشك بکرێت لە هەڵبژاردنی ئەم وێنانەدا کامەیان هەڵدەبژێرێت؟! بێگومان دەسەڵاتی پاشایەتی ئەگەر خراپەکاری و کەموکوڕیشی هەبێت، بەڵام ڕۆژێك سوپای نەهێنایە سەر گوندەکە و ئەوەها بەدڵڕەقی بۆردومانی نەکرد. ڕۆماننووس لەبەر بیروباوەڕە ئایدیۆلۆژی وسیاسییەکەی خۆیەوە نەیتوانیوە خۆی ئەو بەراوردکارییە بکات و بزانێت کامە سەردەم باشتر بووە لەوانی دیکە. دەبوایە ڕۆماننووس هەستی بەوە بکردایە کە لە سێ بەشی کۆتاییدا کارەسات و ناخۆشی و دڵەڕاوکێ گەلێك زۆرترە لە سەرجەم بەشەکانی دیکە، کەمەبەستی سەرەکیی ڕۆماننووس پێکدەهێنێت، ئەمەشیان پێوەندیی بە ئایدیۆلۆژیای سیاسییەوە هەبووە. بەواتایەکی دیکە ڕۆماننووس ئەوەندە پەلەی لەوە کردووە کە بۆچوونی سیاسییەکانی خۆی

دەربڕێت و بیگەیەنێت، ئەوەندە لە خەمی ئەوە نەبووە گرینگی بە بەشەکانی دیکەی دوای ئەو ڕووداوە سیاسییانە بدات کە لە خزمەتی مەبەستە ئایدیۆلۆژییەکەیدا بووە.

بەشێوەیەکی گشتیی ڕۆماننووس هەوڵیداوە لەو ڕۆمانەیدا هەردوو خەباتی چینایەتی و خەباتی نەتەوەیی بە بەکتر ببەستێتەوە، بەڵام سەرکەوتنێکی وای بەدەست نەهێناوە، چونکە لەبنەڕەتدا خۆی زیاتر باوەڕی بەخەباتی چینایەتی بووە و هەروەها سێ چارەکی ڕووبەری دەقی ڕۆمانەکەی بۆ خستنەڕووی خەباتی چینایەتی تەرخانکردووە کە ئەمەش لەژێر دەسەڵاتی ئایدیۆلۆژیا و سیاسییەکەی بووە، کەچی تەنیا لە دوو بەشی کۆتاییدا باسی لە خەباتی نەتەوەیی کردووە و شۆڕشێکی نەتەوەیی بە چەند پەرەگرافێك تێپەڕاندووە و لەهەمان کاتیشدا نەیتوانیوە لە ڕووی هزرییەوە هاوسەنگییەك لە بیروباوەڕی خوێنەر دروست بکات، بۆ ئەوەی قەناعەتی ئەم گواستنەوەیەی لە خەباتی چینایەتییەوە بۆ خەباتی نەتەوەیی پێ بهێنێت. بۆیە لەدەربڕینی هەڵوێستەکانیشدا دووچاری تەمومژ بۆتەوە، بەتایبەتیش لە بەشەکانی کۆتاییدا لەبەر کەمی ڕووبەری ڕەوتی ڕووداوەکان و خێرایی کاتەکانەوە، نەتوانراوە ئەم هەڵوێستانە لەنێوان خەباتی چینایەتی و خەباتی نەتەوەییەوە یەکلایی بکرێنەوە و بخرێنەڕوو.

لەم ڕۆمانەدا، دەسەڵاتێکی گەورەی ئایدیۆلۆژیا و سیاسەت دەستی بەسەر ڕەوتی ڕووداوەکاندا گرتووە و لەهەموو دێر و وشەیەکەوە بۆنێکی خەستی ئایدیۆلۆژیاو سیاسەت دەکەین، کەئەمەش بووەتە هۆی ئەوەی هەست بە ڕووداو تەناتەت کارەکتەرەکانیش نەکەین و زیاتر خەریکی شیکردنەوەی کۆمەڵە دروشمێکی سیاسی بین کەلە سایەی سێبەری ئایدیۆلۆژیایەکی دیاریکراوەوە نووسراوە. بۆیە ئایدیۆلۆژیا دەقی ئەم ڕۆمانەی کوشتووە، چونکە ئێمە زیاتر هاوارکردنێکی سیاسییانەمان گوێ لێیە، هەروەکو (جەبار جەمال غەریب) ئاماژەی پێداوە و دەڵێت: (ئایدیۆلۆژیا جۆرێکە لەبیرکردنەوە، بیرکردنەوەی سیاسی، یان دینی، یان کۆمەڵایەتیی، لەهەموو حاڵەتەکاندا ئایدیالۆژیا زۆرنایەکە بۆ هاوارکردن بەبێ ئەوەی توانای بیستنی هەبێ)[٤] لەژێر ڕۆشنایی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا و لەناواخنی ڕۆمانەکەدا دەگەینە ئەو ئەنجامەی، کە دەتوانین ئەم ڕۆمانە لەخانەی ڕۆمانی سیاسی کوردیدا پۆلێنبەند بکەین، چونکە هەروەکو (د. تەها وادی) ئاماژەی پێکردووە ڕۆمانی سیاسی (وەکو هەموو ڕۆمانێك تەواوی ڕەگەزەکانی پێکهێنانی لەخۆگرتووە، ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە گۆشەنیگایەکی سیاسی کە ڕووداوی سەرەکیی تێدا پێکدەهێنێت لەخۆ دەگرێت)[٥] بەو پێیەش کە ئەو ڕۆمانە تەواوی

ڕووداوەکانی سیاسین و ئایدیۆلۆژیایەکی دیاریکراویش بەخەستی لەپشت دەقەکەیە و سـەرەڕای ناتەواوییەکانیشەوە، دەکرێ بە ڕۆمانێکی سیاسی لە قەڵەمی بدەین.

## سەرچاوەکان


١ـ د. دڵشاد عەلی، دیـلان و تاقیکردنـەوەی شـیعری، دەزگـەی چـاپ و پەخشـی سـەردەم، سلێمانی ٢٠٠٧، ل.٦٦

٢ـ عەباس محەمەد قادر، ڕیالیزم لە شیعری هاوچەرخی کوردیدا (١٩٤٦-١٩٧٠) مەڵبەندی کوردۆلۆجی، سلێمانی ٢٠١٠، ل.٩١

٣ـ حەیدەری حاجی خدر، ڕەخنە و ئایدلۆژیا، لەبلاوکراوەکانی سەنتەری لێکۆڵینەوەی فیکری و ئەدەبی نما، هەولێر ٢٠٠٥، ل١٥.

٤ـ جەبار جەمال غەریت، ئەو نەوەیەی ئێستە دەنووسێ تاڕادەیـەکی زۆر لێکجیـاوازن، تاکـە خەسڵەتی هاوبەشیان ئەوەیە کە وەك یـەکنین، چـاوپێکەتن،گ.کاروان، ژ(٢٠١) مـانگی (١٢)ی ساڵی ٢٠٠٥، ل.١٤٣

٥ـ د.گە وادی، الروایە السیاسیە، دار النشر للجامعات العربیە، ١٩٩٦، صژ٠.

## مۆبایل
## ئەو دەسەڵاتەی ژیانمان بەڕێوە دەبات

مۆبایل چیرۆکێکی (حەسەن نازدار)ی چیرۆکنووسە، کە تێیدا ژیان و کاریگەریی ئامێرێك دەکاتە ناواخنی چیرۆکەکەی و لەوێوە هەوڵ دەدات لایەنەکانی بەکارهێنانی ئەو ئامێرە ڕوون بکاتەوە و پەیامێك ئاراستە بکات بەوەی، کە ژیانی ئێستەی مرۆڤ چۆن هەمیشە وابەستەکراوە بەو ئامێرانە، لەهەمان کاتیشدا بێ بوونی ئەو ئامێرانە، مرۆڤی سەردەم ڕەنگە توانای بەڕێوەچوونی کارەکانی نەمابێت، چونکە تەواوی کار و سیستەمەکان بەو ئامێرانە بەستراونەتەوە و وەکو تۆڕێك کارەکانی خۆیان ئەنجام دەدەن.

ئەوەی لەو چیرۆکەدا تێبینی دەکرێت ئەوەیە، کە چیرۆکنووس هەوڵیداوە جەخت لەسەر شێوازی بەکارهێنانی ئەو ئامێرە بکاتەوە و ڕووناکی بخاتە سەر لایەنی سلبی بەکارهێنانەکەی، چونکە هەموومان دەزانین مۆبایل کاری چییە و بۆ چ مەبەستێك دروستکراوە، بۆیە سەرنج ڕاکێشانی خوێنەر بۆ لایەنە نەرێنییەکان یەکێکە لەو ئامانجانەی کە چیرۆکنووس هەوڵی بۆ داوە.

مۆبایل وەکو ئامرازێکی پێوەندییکردن یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی مرۆڤ و گیانلەبەران ئەوەیە، کە توانای پێوەندییکردنیان پێکەوە هەیە، لەو پێوەندییکردنەشیاندا سوود لە یەکدیی دەبینن و یارمەتی یەکدیی دەدەن بۆ بەڕێکردنی ژیانیان، هەر بۆیە وتراوە مرۆڤ بونەوەرێکی کۆمەڵایەتییە، چونکە ناتوانێت بەتەنیا و گۆشەگیر کەنار بگرێت و ژیان بەسەر بەرێت. ئەوەی لە ژیانی مرۆڤ بەدی دەکرێت، ئەوەیە کە بەکۆمەڵ دەژین، هەر لەبەر ئەمەش بەپێی پێشکەوتنی هزر و جۆری بیرکردنەوەی ڕەنگدانەوەی ئەو ژیانە کۆمەڵییەی لەسەر بووە و لەشێوەی دەستە و تاقمەوە لەشوێنێکی دیاریکراودا نیشتەجێ بوونە و دواتر ئەو شوێنە

نیشتەجێبوونە گوندی لێ بەرهەم هاتووە و لەگوندیشەوە بەرەو شار هەنگاوی هاویشتووە. بەهۆیەشەوە ئەو پێوەندییانەی، کە مرۆڤەکان بەیەکتر دەبەستێتەوە لە هەر سەردەمێك لەو سەردەمانە گۆڕانی بەسەرداهاتووە و پێشکەوتووە، ئەو گۆڕان و پێشکەوتنانە هەمیشە سەر لە نوێ ڕەنگرێژی پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی مرۆڤیان کردووەتەوە، بۆیە جۆر و ئاستی ئەو پێوەندییە لە سەردەمێك و بارودۆخێکەوە جیاواز بووە لەگەڵ سەردەمێك و بارودۆخێکی دیکەدا، بۆ نموونە ئەو پێوەندییەی کە مرۆڤەکان لە گوند بەیەکتر دەبەستێتەوە، جیاواز بووە لەو پێوەندییانەی کە مرۆڤەکانی لەشار بەیەکتر بەستۆتەوە، ئەو جیاوازییەش بەدەوری خۆی کاریگەریی لەسەر هەڵسوکەوت و ئاکار و ناخی مرۆڤ دروست کردووە. بۆیە دروستبوونی ئەو ئامرازو ئامێرانەی کە هاتونەتە نێو کۆڕبەندی ئەو پێوەندییانەوە و بوونەتە بە بەشێك لە ڕایەڵەکانی ئەو پێوەندییە کۆمەڵایەتییانە، ڕۆڵێکی کارایان لە گەشەکردنی ژیار و شارستانییەتی مرۆڤایەتی بینیوە، لەهەمان کاتیشدا بوونەتە بەشێك لە پێداویستییەکانی ژیانی خودی مرۆڤ و ئیدی مرۆڤ بەهیچ شێوەیەك توانای ئەوەی نەبووە دەستبەرداری ببێت و لێ جودا ببێتەوە.

سەرەڕای ئەمەش مرۆڤ بەهۆی زمانەوە بەشێك لەپێوەندییەکانی لەگەڵ دەوروبەری خۆی بەڕێوەدەبات، لەسەرەتاشدا شێوەی ئەو زمانە زیاتر لە دەنگ واتە قیژەقیژە و ئاماژەدانە جەستییەکان خۆی دەبینییەوە، بەڵام لەبەر دابەشبوونی مرۆڤ خۆی بەسەر چەند گرووپ و تاقمێك و نیشتەجێبوونیان لە شوێنی دیاریکراوی دوور لەیەکترییەوە، وای کردووە پێویستییەك بۆ پێوەندییکردنی مرۆڤە لە یەکدیی دوورەکان بێتە ئاراوە، هەر لەسەرەتاشدا ئەو پەیوەندیکردنە لەگەڵ یەکتری شێوەیەکی سادەو ساکاری بەخۆیەوە بینیووە و ئیدی بەپێی پێشکەوتن و داهێنانەکانی خودی مرۆڤەوە، هۆکارەکانی ئەو پێوەندییە پێشکەوتنی بەخۆیەوە بینیوە، بۆ نموونە لە قۆناخێك لە قۆناخەکانی شارستانییەت، پێستی ئاژەڵ وەکو نامەیەك بۆ پێوەندییکردن بەیەکتر بەکارهاتووە، واتە لە قۆناخێکدا پێوەندیی کردن بە هۆی پارچەکانی جەستەی ئاژەڵ ئەنجامدراوە، وەکو پێست و پەڕەمووچ، بۆیە لێرەدا دەتوانین ئاماژە بەوە بدەین کە ئاژەڵ یەکەم ئامێر بووە مرۆڤ بۆ پێوەندییکردن لەناوان خۆیاندا بەکاریان هێناوە، نامەبەرەکان ئاژەڵی وەکو (کەر، ئەسپ)یان بەکارهێناوە بۆ گەیاندنی نامە لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکەوە، هەروەها (کۆتر) وەکو گیانلەبەرێك بۆ گەیاندن و گواستنەوەی نامە

بەکارهاتووە. دواتر ئامرازەکانی ڕاگەیاندنی وەکو ڕۆژنامە و گۆڤار و ڕادیۆ و تەلەڤیزیۆن جێگەیانی گرتەوە و ئەرکی گواستنەوەی هەواڵ و زانیارییەکانیان پێ سپێردرا، لە راستیشدا هەر یەکێك لەو ئامرازانە کاریگەرییان لەسەر ڕێکخستنەوەی پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکان کردووە، ئەوەی تێبینی دەکرێت ئەوەیە، کە ئامێرە یەکەمینەکانی وەکو ئاژەڵ هیچ زەرەرو زیانێکی بۆ خودی مرۆڤ نەبووە، لەبەرئەوەش بەشێوەیەکی خۆڕسك و سروشتی بوونە، بەپێی ئەو خۆڕسکییە و سروشتیبوونەیان کاریگەرییان لەسەر پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکان داناوە، بەڵام دەکرێ بڵێین کاریگەرییەکی ئیجابییانە بووە، بەواتایەکی دیکە تاکڕەهەندانە کاریان کردووە و زیاتر لە خزمەتی کۆمەڵگەی مرۆیی ئەو سەردەمدا بوونە، ئەمەش ڕەنگە بۆ ئەوە بگەڕێتەوە، کە خۆڕسك و سروشتیبوونی خۆیان لە گەیاندنی زانیارییەکان و بەیەکدیی بەستنەوەی مرۆڤەکان و دروستکردنی ڕای گشتی لەسەرخۆ بوونە وخێراییەکی ئەوتۆیان نەبووە، بەپێچەوانەوە ئامرازەکانی ڕاگەیاندنی وەکو تەلەفۆن و ڕۆژنامە و گۆڤار و ڕادیۆ و تەلەفزیۆن، کاریگەرییەکی خێرایان لەرەوتی ژیانی مرۆڤایەتی هێنایە ئاراوە توانیویانە بەزوویی مەعریفە و زانیارییەك بە مرۆڤ ببەخشن و ڕای گشتیی پێ دروست بکەن، بەمەش ڕۆڵێکی کارایان گێڕاوە لە ڕەنگکرێژکردنی پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی مرۆڤایەتی و بوونەتە بەشێك لە پێداویستییە ژیارییەکانی مرۆڤی سەردەم، لەگەڵ ئەوەشدا ئەمانە وەکو ئامرازە یەکەمینەکان تاکڕەهەند نەبوون، بگرە فرە ڕەهەند بوون، بەواتایەکی دیکە جیا لە کاریگەریی ئەرێنی، کاریگەریی نەرێنیشیان لەسەر خودی مرۆڤ و ڕایەڵە کۆمەڵایەتییەکەی هێناوەتە ئاراوە، بۆ یەکەمجار مرۆڤ بەهۆی ئەو ئامرازانەوە ڕووبەڕووی تەوژمی لادان لە ڕێچکەی کۆمەڵایەتییەکەی بووەتەوە و ڕێڕەوەیەکی ناڕاستی گرتۆتەبەر. لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا توانای مرۆڤ لە زاڵبوون بەسەر ئەو دەزگە و ئامێرانە هەر مابوو و تاڕادەیەك دەسەڵاتی بەسەر ئەو ئامرازانە هەبووە و توانیویەتی سنووری دیاریکراویان بۆ بکێشێت و لایەنی ئیجابیانەی ئەو دەزگە و ئامێرانە بخاتەگەڕ و لەخزمەتی کۆمەڵگەی مرۆییدا بەخشش بکات و لایەنی سلبییەکانیش ڕێگیری لێ بکات. دواتر لە سەردەمی شۆڕشی زانیارییەکاندا پێوەندییەکانی نێوان مرۆڤ خێراییەکی بەرچاوی بەخۆیەوە بینی، بەرادەیەك سنووری فروانی ژیانی مرۆڤیان داگیرکرد و جیهانیان لە چەندین کیشوەرەوە کردە گوندێکی بچووك و ئەوەی وەکو خەونێك وابوو کرا بە کەتوارێك، ئەو ئامرازانەش وەکو کۆمپیوتەر و ئینتەرنێت و مۆبایل و سەتەلایت

بوونە بەشێك لە ژیان و پێداویستییە سەردەمییەكانی مرۆڤی ئێستە و تەواوی كارو كردەوەكانیان كۆنترۆڵ كردووە، تا وای لێهاتووە ڕادەی خوێندەواری و پێشكەوتن بە زانینی بەكارهێنانی ئەو ئامێرانە پێوانە بكرێت، كە ئەمانەش ڕاستەوخۆ كاریگەرییان لەسەر سیستەمی كۆمەڵایەتیی داناوە و گۆڕانكارییەكی گەورەیان لە ژیاری كۆمەڵایەتی هێناوەتە كایەوە.

بێگومان ئەم ئامێرانە هەر وەكو ئامێرەكانی دیكەی پێوەندیی دروستكردن لایەنی ئیجابی و سلبی لەخۆ گرتووە، بەڵام دەكرێت ئەوە باس بكرێت كە لایەنی سلبییەكانی ئەو ئامێرانە زیاتر تاكڕەوییە و تاكەكەسییە، چونكە خودی ئامێرەكان زیاتر لەخزمەتی تاك دانە و بەمەش بەكارهێنانی ئەو ئامێرانە كارو كاردانەوەی تاكە كەسی زیاتری لێدەكەوێتەوە، بۆیەش لەبەكارهێنانیدا سنووری كۆمەڵی بەزاندووە و بۆ ژیان و تایبەتمەندییەكانی تاكەكەس شۆڕبۆتەوەو فۆرمێكی نوێی بە ژیانی تاكەكەس بەخشیووە.

## ناونیشان و سەرەتای چیرۆك:

ناونیشان دەروازەیەكە بۆ دەرگەكردنەوەی دەق و لەوێوە خوێنەر دەچێتە ناواخنی ناوەرۆكەوە، بۆیە ناونیشان بایەخێكی گرینگی هەیە وەكو ڕەگەزێكی چیرۆك، چونكە (خوێنەر یەكەم بەركەوتنی لەگەڵ ناونیشاندا هەیە و پاشتر لەگەڵ دەستپێك و ئەوسا ڕووبەڕووی ناوەرۆكی دەق دەبێتەوە بەشێوەیەكی ڕاستەوخۆ)[1] ، واتا ناونیشان یەكەم شتێكە، كە خوێنەر ئاشنای دەبێت و بەشێكە لە پێكهاتنی تێگەیشتن و چێژبەخشینی چیرۆك، بۆیە بایەخێكی لە ڕادەبەدەری هەیە و پێویستە چیرۆكنووس وەكو ڕەگەزێك، بایەخێكی تەواوی پێ بدات و هەمیشە هەوڵ بدات ناونیشانێك بۆ چیرۆكەكەی هەڵبژێرێت كە ببێتە هۆكاری وردبوونەوەو ڕامانی خوێنەر، بەدیوەكەی دیكە خوێنەر یەكسەر لەگەڵ بینینی ناونیشاندا پەلكێشی خوێندنەوە بكرێت، بە واتایەی كە پێویستە ناونیشان سەرنجڕاكێش بێت و ببێتە جێگەی پرسیار وورووژاندنی خوێنەر. لەم ڕوانگەیەوە ناونیشانی ئەم چیرۆكەی (حەسەن نازدار) بەناوی ئامێرێكەوەیە، كە هەموو مرۆڤێكی ئەو سەردەمە بەكاری دەهێنێ و دەزانێ لەچی پێكهاتووە و چۆن بەكاردێت، تەنانەت بووەتە بەشێك لە ژیانی ڕۆژانەی، واتە ناونیشان پێوەندیی ڕاستەوخۆی بە كەسایەتیی یاخود شوێن یان كاتەوە نییە، بگرە پێوەندییەكی ناڕاستەوخۆی بە

ڕووداوەوە هەیە، چونکە خوێنەر کە چاوی بەو ناونیشانە دەکەوێت، یەکڕاست لەوە دەگات، کە ڕووداوەکانی ئەو چیرۆکە لەسەر مۆبایلە، بەو واتایەی ئەو ئامێرە تەوەری سەرەکیی ڕووداوەکانی لە ئەستۆ گرتووە و ئاراستەی ڕەوتی ڕووداوەکان دەکات، لەهەمان کاتیشدا دەکرێ بڵێین ناونیشانی ئەم چیرۆکە بەشێوە ئاسایی و باوەکەی بەکاربراوە و سەرنجڕاکێش نییە، هەرچەندە یارمەتی خوێنەر دەدات تا لەوە بگات، کە تەوەری سەرەکیی ڕووداوەکان مۆبایلە، بەڵام ناونیشانی چیرۆکە ناونیشانێکی وەستاوە و سنوورەکانی دیاریکراوە و خوێنەر دووچاری ڕامان و بیرکردنەوە وروروژاندنی پرسیار ناکات، بەواتایەکی دیکە هیچ خەیاڵ و فانتازییەك لەو ناونیشانە بەدی ناکرێت، کە چێژە ئێستێتیکییەکانی خوێنەر جوانتر و گەشاوەتر بکات، کە ئەمەش خاڵێکی لاوازی ئەم چیرۆکەیە. لەم ڕووەوە جوانتر بوو، چیرۆکنووس بەشێك لە ئامانجەکانی ڕووداوی چیرۆکەکە بۆ ناونیشان هەڵبژێرێت، لەبەرئەوەی ناونیشانێکی لەم جۆرە سەرنجی خوێنەر ڕادەکێشێت و هەروەها ڕووی قسەکردنیشی بۆ خوێنەرە و هەڵگری جۆرە تەمومژێکیشە کە دەبێتە هۆکارێك بۆ ڕامان و وردبوونەوە. لەهەمان کاتیشدا جۆرێك لە کۆمیدیای بە ناونیشانەکە دەبەخشی، کە ئەمەش ڕێك لەگەڵ ناوەرۆکی چیرۆکەکە ڕێکدەکەوت کە بەزمانێکی کۆمیدی نووسراوە و ئاکامێکی تەنزئامێزی لەخۆگرتووە. بەهەر حاڵ ئەم ناونیشانە سنوورەکانی داخراوە و ناکرێت لەم ناونیشانەوە واتا و مەبەست هەڵبهێنجرێت کە دوور بێت لە واتا و مەبەستەکانی ئامێرەکەوە.

دەستپێك وەکو هونەرێك کە سەرەتای چیرۆك دادەڕێژێت گرینگی خۆی هەیە، بەوەی زەمینەسازییەك و ڕێگەخۆشکەرێك بۆ ئامادەکردنی خوێنەر دەکات تاوەکو بچێتە ناو ڕووداوەکانەوە و هێدی هێدی پێیان ئاشنا بێت. لە دەستپێکی ئەم چیرۆکەدا ئاماژە بە ناوی کەسایەتیی نەکراوە و هەروەها دایەلۆگێکیش لە ناواخنی سەرەتای چیرۆکەکەدا هەست پێناکەین، بگرە چیرۆکنووس هەوڵی داوە یەکسەر خوێنەر پەلکێشی نێو ڕووداوەکە بکات و لەگەڵ خۆیدا گوزەر بکات بەناو ڕەوتی ڕووداودا، بەمەش هەوڵی داوە وێنەیەکی پڕ لەدڵەڕاوکێ لە دەستپێکی چیرۆکەکەدا دروست بکات، بۆ ئەوەی یەکسەر خوێنەر دووچار بێزاربوون نەبێتەوە، هەروەها جۆرە تامەزرۆیەکیش چێ بکات بۆ ئەوەی ببێتە هاندەرێك بۆ خوێنەر تا هەوڵی تەواوی خوێندنەوەی ڕووداوەکە بدات. چیرۆکنووس بەمشێوەیە دەستپێکی چیرۆکەکەی داڕشتووە: (نەمدەزانی کاتژمێر چەند بوو، بەڵام وا هەستم دەکرد کە نیوەی شەو بوو، خۆم

دابووە دەست پڕخەکانی خەوێکی قووڵی دوای سەفەرێکی دوورو درێژ و ماندووکەر، لەناکاو زەنگی مۆبایلەکەم وە ئاگامی هێنام و بەخەبەربوونەوەکەشم بەڕاچەنینێکی لەناکاو و هاوارێکی بەرز دەستی پێکرد کە هەناسەبڕکێ و قورگ گیرانی بەدواوە بووە، نیگام بڕیە شاشەی مۆبایلەکەم، ژمارەکە نەناسراو بوو، تۆوی ترسێك لەدڵدا چەکەرەی کرد) ئەم دەستپێکە کە گێڕەرەوە کە چیرۆکنووس خۆیەتی بۆمانی باس دەکات، وێنەکێشانێکی زیندووی ناخ و هەڵسوکەوتی مرۆڤێکە کە لەکاتێکی لەناکاودا هەواڵێکی پێدەگات، یاخود شتێکی بەسەر دێت، ئەم وێنەیە پڕە لە دڵەڕاوکێ کە ڕەنگە زۆر جار بەسەر خودی خوێنەریش هاتبێ، بەهێزی ئەو دەستپێکە زیاتر لەوەشدایە کە ئەم وێنەیە پێوەستە بە کۆتایی ڕووداوەوە و لەوێوە ئەنجامەکانی ئەو بەخەبەرهاتن و زەنگی مۆبایلە ڕوون دەبێتەوە. بۆیە چیرۆکنووس لە هەڵبژاردنی ئەو دەستپێکە بۆ چیرۆکەکەی سەرکەوتنێکی تەواوی بەدەستهێناوە و توانیویەتی زەمینەسازییەکی لەبار و بەپیت بخوڵقێنێت و بەزوویش خوێنەر بخاتە ناو چوارچێوەی ڕووداوەکەوە.

## بەکارهێنانی توخم و ڕەگەزەکانی تەکنیك:

ڕووداوی سەرەکیی چیرۆکەکە بریتییە لە زەنگلێدانی مۆبایلی کارەکتەری سەرەکیی، چونکە لێدانی مۆبایلەکەی لە کاتێکی ناوەختدا بووە کە نیوەی شەوە، بۆیە کارەکتەر چەندین خەیاڵی ناخۆش و ترسناك لەبارەی ئەو زەنگلێدانەوە بەمێشکیدا گوزەر دەکەن و کۆتاییەکەشی ئەوەیە کە ئەو زەنگلێدانە گفتوگۆیەکی تەنزئامێزی لێ دەکەوێتەوە کە لەهەمان کاتیشدا خەمێکی تراژیدی دەردەبڕێت. بۆیە ڕووداو لە ڕووداوێکی ئاسایی ناو کەتواری ژیان خواستراوە و بەشێوەیەکی هونەری تەوزیف کراوە لە پێناو گەیاندنی ئەو مەبەست و مەغزایانەی، کە چیرۆکنووس مەبەستی بووە دەری ببڕێت.

کارەکتەری سەرەکیی ئەم چیرۆکە ئەو کەسەیە کە لەناوەشەودا زەنگی مۆبایلەکەی لێدەدات و چیرۆکنووس هیچ ناوێکی دیاری بۆ دەستنیشان نەکردووە، بگرە بەهۆی گێڕانەوەی ڕووداوەکانەوە و بەهۆی کەسی یەکەمی تاك (من)ەوە هەر چیرۆکنووس خۆیەتی کە گێڕانەوەی لەئەستۆگرتووە و سەرتاپای ڕایەڵەکانی ڕووداوەکەی بەیەکتر بەستۆتەوە، سەرەڕای ئەمانەش چەندین کارەکتەری لاوەکی دیکە بەدی دەکەین کە ڕۆڵیان لە تانوپۆی ڕووداوەکەدا هەیە

لەوانەش ( باوکی گێڕەرەوە، کچە شارییەکە، هاوڕێ سەر زلـە خـۆش مەشـروبەکە، پیـاوێکی دەنگ گڕی ئیداری، کوڕێکی گەنج) کە بەهۆیانەوە گێڕەرەوە چەندین چـیرۆکی دیکـەی لـەناو ڕووداوەکەدا دەخولڤێنێت.

ئەوەی لەم چیرۆکەدا تێبینی دەکرێت ئەوەیە، کە چیرۆکنووس لە دەستپێکدا گرینگی بـە ڕەگەزێکی تایبەت داوە، کە بەشێك لە ئەتمۆسفیری ڕووداوەکەی لە ئەستۆ گرتووە، کە ئـەویش کاتە، کات خولڤێنەری وێنەکانی نێو دەستپێکەکەیە و بـەهێزی ئـەو دەسـتپێکەش بـەخودی ڕەگەزی کاتەوە بەستراوەتەوە، بەواتایەکی تر کـات بناخـە و بنەمایـەکی پتـەوی ڕووداوکـەی داڕشتووە و لەهەمان کاتیشدا ئەرکی پێشکەشکردنی دەستپێکی چیرۆکەکەشی لەسـەر شـانە. نەك هەر لە دەستپێکیشدا، بگرە لەتەواوی چیرۆکەکەدا کات بـەردی بناخەیـە و کەشـوهەوای چیرۆکەکەی لەسەر داڕێـژراوە و بـەهۆی کاتـەوە ڕووداوەکـە جۆرێـك لـە تامـەزرۆیی و چـێژ بەخشینی بەخۆیەوە بینیوە، هەر لەبەر ئەمەشە کە چیرۆکنووس لەسەرەتاوە ئاماژەی بەکاتەوە کردووە:

(نەمدەزانی کاتژمێر چەند بوو، بەڵام وا هەستم دەکرد کە نیوەی شەو بوو)

لێرەدا چیرۆکنووس سەرەتا ئاماژەی بە پارچەیەك لە پارچـەکانی کـات کـردووە و هۆشـی خوێنــەری بــۆ دیــاریکردنی کــاتێکی دیــار بــردووە، دواتــر شــوێنی ئــەو پارچــە کاتــەی دەستنیشانکردووە، کە نیوەی شەوە، واتە تەواوی ڕووداوەکە زۆر کەمترە لە کاتژمێرێك، بگرە تەنیا چەند چرکەیەکە، ئەو چرکەیەی کە زەنگی مۆبایلەکەی بۆ دێت و ئەو کاتەش لـە نیـوەی شەوەدایە. بەمەش سنووری کـاتی نـاوەوەی دەقـی دەستنیشـان کـردووە و هـەوڵی داوە لـەو سنوورەی کاتەوە ڕووداوەکە بخاتەڕوو. دیارە دەستنیشانکردنی سنوورەکانی کاتی ناوەوەی دەق، بەرچاو ڕوونییەك بۆ خوێنەر دروست دەکات تا بەتەواوەتی بە ناخی چیرۆکدا ڕۆبچێت، چـونکە کێشانی سـنوورەکانی کـات، بەتایبـەتیش لـەم چـیرۆکەدا کـە کـات پێوەسـتکراوە بـەخودی ڕووداوەکەوە، بەها و چێژێکی ئیسـتێتیکی لای خوێنـەر دروسـت دەکـات. لەگـەڵ ئەوەشـدا چیرۆکنووس بەهۆی بەکارهێنانی تەکنیکی فلاشباك و چیرۆك لـەناو چـیرۆکەوە چـەندین جـار کاتی ناوەوەی دەق جێدەهێڵێت و بۆ کاتی ڕابردوو دەگەڕێتەوە. لەو ڕێگەیەوە چەندین چـیرۆك بۆ ئێمە دەگێڕێتەوە کە هەموویان پێوەندییدارن بـەم چـیرۆکە سـەرەکییەوە کـە ئـەویش ئـەو گفتوگۆیەی مۆبایلە کە لە نیوەشەوەدا ڕوودەدات، لەوانە چیرۆکی چـۆنییەتی پـێ ڕاگەیانـدنی

هەواڵی مردنی باوکییەتی کە بەهۆی ئامێری مۆبایلەوە ئەو هەواڵەی پێگەیشتووە، ئەمەش بەشێك لە پارچەکانی ڕووداوەکەی لە ئەستۆ دەگرێت و دەروونی خوێنەر ئامادە دەکات بۆ ئەوەی ئامادەیی هەر ڕووداوێك ببێتەوە کە لە ئەنجامی ئەو زەنگلێدانەوە چاوەڕوانییەتی، هەروەها چیرۆکی کچە شارییەکە کە بەهۆی بەهەڵە لێدانی ژمارەی مۆبایلەکەیەوە چەندین جار جنێو بە کارەکتەری سەرەکیی کە چیرۆکنووس خۆیەتی دەدرێت. هەروەها چیرۆکی ئەو شەوانەی، کە لەگەڵ هاوڕێیەکەیدا سەرەڕای باسوخواسی دیکە، باسیان لەو ئامێرە کردووە و هاوڕێیەکەی پێشنیازی ئەوەی کردووە، کە شەوانە مۆبایلەکەی دابخات، چونکە لەوانەیە تووشی نەزۆکی بکات. باسکردنی ئەم چیرۆکانەش بەهۆی بەکارهێنانی فلاشباکەوە ئەنجام دەدرێن. هەروەها لەلایەن چیرۆکنووسەوە کاتی نووسینی دەق دیاریکراوە، کە ئەویش لە کۆتایی دەقەکەدا تۆمارکراوە، کە پایزی ساڵی(٢٠١٠).

شوێن لەم چیرۆکەدا هەرچەندە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ ئاماژەی بۆ نەکراوە، بەڵام لەناواخنی چیرۆکەکەدا وەکو ئاماژە ئەوەمان بۆ ڕووندەبێتەوە کە شوێن ماڵی کارەکتەری سەرەکییە:

(نەمدەزانی کاتژمێر چەند بوو، بەڵام وا هەستم دەکرد کە نیوەی شەو بوو، خۆم دابووە دەست پڕخەکانی خەوێکی قووڵی دوای سەفەرێکی دوورودرێژ و ماندووکەر، لەناکاو زەنگی مۆبایلەکەم...)

(وا خەریکە بەدەم چوونم بۆ سەر ئاوەوە زەردەخەنەکە وردە وردە تۆختر دەبێتەوە..)

لەم کۆپلانەی سەرەوەدا هەرچەندە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ ناوی شوێن نەهاتووە، تەنیا لە کۆپلەی دووەمدا نەبێت، کە شوێن تێیدا بریتییە لە ئاودەست، کە ئەمەش دیارە بەشێکە لەو شوێنەی، کە شوێنی ڕووداوەکەیە کەئەویش ماڵی کارەکتەر خۆیەتی و لەوێشدا ژووری نووستنەکەیەتی. بەڕای ئێمە ناونەهێنانی شوێن بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ زیاتر لەبەرئەوەیە، کە توخمی کات لەم چیرۆکەدا بەهێز و کاریگەرە و بناخەی داڕشتنی ڕووداوەکەیە، بۆیە شوێن بە باسنەکردنیشی کاریگەرییەکی ئەوتۆی لەسەر ڕەوتی ڕووداوەکان دروست ناکات، لەمەشدا چیرۆکنووس سەرکەوتوو بووە کە لەسەرەتاوە ئاماژەی ڕاستەوخۆی بە شوێن نەداوە، بگرە لەو کاتەوە ئاماژەیەکی ڕاستەوخۆی بەشوێن داوە، کە پێوەستە بە ڕەوتی ڕووداوەکە کاتێك کوڕە گەنجەکە لەو گفتوگۆیەی مۆبایلەکەدا بە کارەکتەری سەرەکیی دەڵێت:

(هەستە میزەکەت بکە، بانەیکەت بەخۆتدا)

ئینجا چیرۆکنووس وەکو تەواوکەرێکی ئەوەوە ڕووداوەکە بە شوێن دەبەستێتەوە کاتێك کارەکتەر دەڵێت:

(وا خەریکە بەدەم چوونم بۆ سەر ئاوەوە زەردەخەنەکە وردە وردە تۆختر دەبێتەوە..)

بەشێوەیەکی گشتیی ئەم چیرۆکە لە (٩٥٠) وشەیە پێکهاتووە کە زیاتر گێڕەرەوە بەشی سەرەکیی لە گێڕانەوەی ڕووداوەکاندا بەر کەوتووە و گەلێکجاریش بەهۆی مەنەلۆگی ڕاستەوخۆی ناوەوە، چیرۆکنووس ڕووداوەکانی گێڕاوەتەوە کە ئەم دوو ڕەگەزەش گێڕەرەوە و مەنەلۆگی ناوەوە بەتەواوەتی کۆنترۆڵی دەقیان کردووە، تەنانەت بەسەر دایەلۆگیشدا زاڵبوونە و کەشوهەوای دەقیان لەژێر ڕکێفی خۆیان توند گیرکردووە.

دایەلۆگ لەم چیرۆکەدا کەمتر ئاوڕی لێ دراوەتەوە و لەناو بۆتەی دەقدا تواوەتەوە، ئەگەر ئامارێکی ئەو وشانە بکەین کە لە دایەلۆگدا بەکارهاتوون ئەوا لەکۆی (٩٥٠) وشە، تەنیا (٤٩) وشەی بۆ دایەلۆگ بەکاربراوە، ئەوەی کە بەکاریش هاتووە زیاتر دایەلۆگی ناڕاستەوخۆیە، کە برێتییە لەو دایەلۆگەی کە ڕاستەوخۆ لەزاری کارەکتەرەکانەوە وەردەگرێت و (( وشەو دەستەواژەی (وتی، پرسی، وتیان، ئەو وتی،...تاد) دەقاودەق قسەی کارەکتەرەکان وەردەگرێ و وەکو خۆیان دەیانگێڕێتەوە))[٢]. چیرۆکنووسیش بە هۆی دەستەواژەکانی (گوتم، دەڵێت، دەیگوت، دەڵێم) دایەلۆگی ناڕاستەوخۆیانەی داڕشتووە، هەروەها هیچ ئامرازێك یاخود نیشانەیەك بۆ جیاکردنەوەی دایەلۆگ لە ڕەگەزەکانی دیکەی تەکنیك دیاری نەکراوە، بگرە لەتەك ئەو دەستەواژانەوە بۆ دەربڕینی وتەی کەسەکە، دوو خاڵ لەسەر یەك بەستوونی کراوە بەمشێوەیە ( دەڵێت:).

زمانی ئەم چیرۆکە، زمانێکی تەنز ئامێزە، و چیرۆکنووس هەوڵی داوە وێنەیەکی خراپ و ڕەشی نێو کۆمەڵگە لە بەرگێکی تەنز ئامێز پیشان بدات. ئەمەش بۆ ئەوەی وەکو هۆکارێك بێت تا بەهۆیەوە کێشە و گرفتەکان بخاتەڕوو و بەهایەکی ڕۆشنبیری لەلای خوێنەر دروست بکات و لەڕێگەی زەردەخەنە خستنە سەر لێوەکانیەوە ئەو پەیامەی کە چیرۆکنووس مەبەستییەتی بیگەیەنێت، چونکە پێکەنین لەڕووی دەروونییەوە هۆکاری خاوبوونەوەی مێشك و دەروونی مرۆڤە، بەمەش خوێنەر بەهێمنی ئەو مەبەست و مەغزایانە وەردەگرێت و قبوڵی دەکات. بۆ گەیاندنی ئەمەش چیرۆکنووس گەلێکجار پەنای بردۆتە بەر بەکارهێنانی زمانی

ئاسایی ڕۆژانەی خەڵکییەوە، بەتایبەتیش لە دایەلۆگەکەکاندا وشە و دەستەواژەکانی ئاسایی خەڵکی کە لە هەندێك دۆخدا جنێوەکانیشی تۆمارکردووە، بۆ نموونە لەو دایەلۆگەدا، کە چیرۆکنووس باس لەوە دەکات کە ژن لە کۆمەڵگەی ئێمەدا کاتێك ژمارەیەکی نەناسراو تەلەفۆنیان بۆ دەکات، وەکو وەفا و داوێن پاکییەوە، مۆبایلەکە بەمێردەکانیان دەدەن، ئەویش سەرەتا بەدەنگێکی تووڕە وەڵام دەداتەوە، بەڵام ئەگەر کەسێکی ناسیار بوو، ئەوە دەڵێت: (ئاخر نەمزانی تۆیت حەیوان، وامزانی کەرێکی تریت)، بەڕای ئێمە بەکارهێنانی ئەو زمانە ڕۆژانەییە لەلایەن چیرۆکنووسەوە زیاتر بۆ ئەوە بووە، کە لەگەڵ کەشوهەوای کۆمیدی نێو چیرۆکەکە بگونجێت کە لەمەشدا سەرکەوتوو بووە.

## مۆبایل و ئامازە کۆمەڵایەتیی و کولتوورییەکانی:

مەبەست و مەغزای ئەم چیرۆکە دەکرێت لەوەدا کورت بکرێتەوە، کە ڕەهەندەکانی کۆمەڵایەتیی و کولتوورییەکانی بەکارهێنانی مۆبایل وەکو ئامێرێکی پێوەندییکردنی سەردەم ڕوون دەکاتەوە. لەم ڕووەوە چیرۆکنووس زیاتر هەوڵی ئەوەی داوە کە لایەنە نەگەتیف و خراپەکانی ئەو بەکارهێنانە ڕوون بکاتەوە و لە بۆتەیەکی تەنزئامێزدا ڕەخنە لە سیستەمی بونیادی کۆمەڵگەش بگرێت کە کۆمەڵگەیەکی دواکەوتووە و زانیاریی و مەعریفەی بەکارهێنانی ئەم جۆرە ئامێرە پێشکەوتووانە نازانێت. سەرەڕای ئەمەش بوونی ئەو ئامێرە سەردەمیانە لەناو کۆمەڵگەیەکی داخراوی دواکەوتووی وەکو کۆمەڵگەی ئێمە کاریگەری لەسەر ڕایەڵەکانی پێوەندیی کۆمەڵایەتیی هەیە و بە ئاقارێکی خراپیدا بردووە. سەرەڕای ئەوەش جۆرێك لە نەریت و ئاکارێکی بەدوای خۆیدا هێناوە، کە ئیدی لادان لەو نەریت و یاسا و ڕێسایە کۆمەڵایەتی و ئاکارییانە کارەساتی خراپی لێ دەکەوێتەوە. یەکێك لەو نەریت و ڕووکارە دواکەوتووانەی کۆمەڵگەکەمان، کە چیرۆکنووس باسی کردووە ئەوەیە کە ئافرەتانی کۆمەڵگەی ئێمە لە بەکارهێنانی ئەو ئامێرە سەردەمەییەش ئازاد نین:

(پڕ بەدڵ ئیرەیم بە ژنان دەبرد، کە کاتێك ژمارەیەکی نەناسراو زەنگیان بۆ لێ دەدات، لەلایەکەوە وەکو نازکردنێك و پیشاندانی پاکدامێنیان لەلای مێردەکانیان، مۆبایلەکەیان دەدەنە دەست مێردەکانیان و مێردەکانیشیان بە دەنگێکی گڕی نێرانەی پڕ لە تووڕەییەوە وەڵامیان دەدەنەوە).

سەرەڕای ئەمانەش چیرۆکنووس پەنجە دەخاتە سەر لایەنێکی دەروونـی، کـە تـاکی کـورد پێوەی دەناڵێنێت و گیرۆدەی دەستی بـووە و بووەتـە بەشـێك لـە پێکهاتـەی دەروونییەکـەی، ئەویش بە خێرایی گەیاندنی هەواڵی ناخۆشە، کە دیارە لەمەشـدا مۆبایـل کارەکـەی ئاسـانتر کردووە و یارمەتیدەرێکی باشی ئەو کارە بووە، ئەمە لە کاتێکدا پێویستە چارەسـەر بـۆ ئـەم جۆرە حاڵەتە دەروونییە بدۆزرێتەوە، چونکە ئەم حاڵەتە دەروونییە کاریگەرییەکی ڕاستەوخۆی لەسـەر گەشـەی چـێژی لـەلای مرۆڤـی ڕۆژهـەڵاتی دروسـتکردووە و هەمیشـە بـەهۆی خەموخەفەتەوە لەبەرانبەر ژیاندا ڕەشبینە، بەپێچەوانەی مرۆڤی ڕۆژئاوایی کە سـەرەڕای ئـەو دۆخە تایبەتیانەی دروونیش کە لە هەموو مرۆڤێکدا هەیە، کەچی لەبەرانبەر ژیاندا گەشبینن، بۆیە چیرۆکنووسیش لەبەرانبەر ئەم دیاردەیە دۆشداماوە و سەرسوڕماوییە پرسیار دەکات:

(نازانم بۆ هێندە چێژ لە گەیاندنی هەواڵە ناخۆشەکان دەبینین تا هەواڵـە خۆشـەکان؟ تـا ئێستەش نازانم ئەو دەمارە سادیە لە کوێی گیان و لاشەماندا خۆی حەشارداوە؟)

ئەمـەش وای لەچـیرۆکنووس کـردووە بـوونی ئـەو ئـامێرە سـەردەمییە ڕەت بکاتـەوە و نوستالیژیانە خۆزگە بە سەردەمی ڕابردوو و شتە جوانەکانی بخوازێت:

(بە هۆی ئەم هەواڵە ناخۆشانە و ئەو گێچەڵانەی لە دوای خۆی بەجێی دەهێڵێـت زۆر جـار خوزگەم خواستووە کە مۆبایل هەر نەبایە هەندێك جاریش کە تووڕە دەبم چەند دەرزەن جنێـوی مزر ڕەوانەی باوکی ئەو کەسە ئەکەم کە بۆ یەکەم جار ئەم مۆبایلە نەعلەتیەی دروستکردووە، خستیە بازاڕەوە، باوەڕیشم وایـە کـە ئـەم ڕێککەوتنـە خێراییـەی مرۆڤایـەتی و تەکنـەلۆژیا نەعلەتییە زۆر شتی جوانی خۆماڵی لەناو برد)

لێرەدا بەتەواوەتی گۆشەنیگای چیرۆکنووسمان بۆ دیار دەکەوێت کە دژی ئەو ڕێککەوتنەیـە کە لە نێوان مرۆڤایـەتی و تـەکنۆلۆژیاوە هاتووەتـە ئـاراوە و بەهۆیـەوە گـەلێك دابونـەریتی کۆمەڵایەتیی و کولتووریمان لەدەستداوە، بێگومـان کاتێك بەرهەمێکی تەکنـەلۆژیای سـەردەم دێتە نێو کۆمەڵگەوە، کە ئەو کۆمەڵگەیـە خـۆی داهێنـەری نییـە و هـەروەها بـەپێی پلـەی پێگەیشتنی کۆمەڵایەتیی نەهاتووە، هەمیشە کاریگەرییەکانی بـەو شـێوەیە نابێـت کـە لـە ئەسڵدا لەپێناوی ئامێرەکە داهێنراوە. مۆبایل داهێنراوێکی زانستی و تەکنەلۆژیای ڕۆژئاوایـە و ئەوان بەپێی پێگەیشتنی سیستەمی کۆمەڵایەتیی و کولتووری خۆیانەوە دایانهێناوە و هـیچ حیسابێکیشان بۆ ئەو کۆمەڵگەیانە نەکردووە کە لەچاو ئەواندا دواکەوتوونە، بۆیە کاتێك ئـەو

ئامێرە لەو کۆمەڵگەو ژینگە لەبارەی خۆیەوە دەگوازرێتەوە بۆ کۆمەڵگە و ژینگەیەك کە لەبارنییە، دووچاری جۆرێك لە بارە نەگەتیفەکانی دەکەوێتەوە، ئەمەش جیاوازییەکانی لەوەدایە کە کۆمەڵگەیەکی پێشکەوتووی ڕۆژئاوایی بەشێوەیەکی کۆمەڵگەیی لە خزمەت و خێرایيەکانی تێیگەیشتوونە، بەڵام لە کۆمەڵگە دواکەوتووەکاندا بەکارهێنانی تەکنۆلۆژیای سەردەم دەوستێتە سەر ئاستی ڕۆشنبیریی تاك، بە هۆیەوەش بەکارهێنانەکە شێوازێکی جۆراجۆر لەخۆ دەگرێت و ڕەنگە کەسانێك کە ئاستی ڕۆشنبیرییان نزم بێت بەشێوازێکی وا خراپ بەکاری بهێنن کارەساتی لێبکەوێتەوە، لەهەمان کاتیشدا کەسانێك بەشێوازێك بەکاری دەهێنن کە لەگەڵ ئاستە ڕۆشنبیرییەکەی خۆیان گونجاوە. بۆیە مۆبایل وەکو ئامرازێکی سەردەمیانە بەتوندی بوونی خۆی لە ژیانی کۆمەڵایەتیی و ژینگەیی و ئابووری کۆمەڵگەدا چەسپاندووە، بەڵام شێوازی بەکارهێنانەکەی جیاوازی لە نێوان کۆمەڵگەکان دروستکردووە. بوونی مۆبایلیش دەبێتە هۆکاری گۆڕانکارییەکی جەوهەری لە تێگەیشتنی تاك لە خۆی و لەو جیهانەی کە تێیدا دەژیت و بەمەش ئەو شێوازەی کە ژیانمانی پێ بینا دەکەین دەگۆڕێت[٣]. لەم ڕوانگەیەوە چیرۆکنووس دژی مۆبایل و هاتنی ئەو تەکنەلۆژیایە سەردەمییە دەوستێتەوە، کە لێرەدا ئێمە هاوڕا نین لەگەڵیدا، چونکە مۆبایل وەکو ئامرازێکی پێوەندییکردن چەندین خاڵی دیکەی پۆزەتیفی هەیە، هەر بۆ نموونە بە نرخێکی گونجاو و هەرزان دەگاتە دەست هەموو کەسێك بە بێ ڕەچاو کردنی باری چینایەتی ئەو کەسە، کە ئەگەر بەراوردی بکەین لەگەڵ تەلەفۆنی نۆرماڵ لەرابردوودا لەبەر گرانی نرخەکەی تەنیا چینی سەرەوەی کۆمەڵ هەیانبوو، چینی خوارەوە لەو خزمەتگوزارییە بێبەش بوون، هەروەها مۆبایل ماوەی نێوان کەسەکانی بەشێوازێکی سەرسوڕهێنەر کورت کردووەتەوە و یارمەتیدەرێکی خێرای گەشەکردنی کەرتی بازرگانی و ئابووری بووە، کە دەبنە هۆکاری فەراهەمبوونی خۆشگوزەرانی، بەڵام کێشەکانی مۆبایل وەکو لەسەرەوە ئاماژەمان پێدا دەگەڕێتەوە سەر شێوازی بەکارهێنانەکەی. دیارە شتێکی ئاساییە بەهاتنی هەر ئامرازێکی نوێ کۆمەڵێك ڕووخسار و شێوازی کۆن نەهێڵێت و ڕووخسار و شێوازی نوێ شوێنیان بگرێتەوە، هەر بۆ نموونە بە داهێنانی تراکتۆر و دەڕاسە کۆمەڵێك ڕێوڕەسمی زەوی کێڵان و دروێنە و شەنەکردن و.... تاد، لەناو چوون کە هەر یەکێکیان چەندین ئاکار و دابونەریت و سروودوی تایبەت بەخۆیان هەبووە. بێگومان بەهاتنی مۆبایلیش کۆمەڵێك ئاکاری نوێ سەریان هەڵداوە لە پێوەندییە

کۆمەڵایەتییەکاندا کە لەوانەیە هەندێکیان باش بێت و هەندێکی دیکەشیان خراپ بن. بۆیە ئێمە پێمان وایە مۆبایل ئەگەر بە شێوازێکی مۆدێرن و شارستانیانە بەکاربرێت لە خزمەتی مرۆڤایەتی دایە.

چیرۆکنووس لە بەشێکی چیرۆکەکەیدا وەکو ڕەخنەگرتنێك لە کۆمەڵگە و ئاکار و ڕەوشتییەکانییەوە و لەڕێگەی پێوەستکردنی کۆمەڵێك ڕووداوی کۆمەڵایەتیی و سیاسی نێو کۆمەڵگە بە مۆبایلەوە، ڕەخنەیەکی توند ئاراستەی هزر و بیروبۆچوونی کۆمەڵگە دەکات لە خولڤاندنی ئەو کێشە و گرفتانە. دیارە مۆبایل بەهۆی ئەو تایبەتمەندییانەی کە هەیەتی توانیویەتی مرۆڤ لە زۆرترین شوێن و زۆرترین کات دابنێت[٤] ، ئەمەش لەڕێگەی گواستنەوەی هەواڵەکانەوە کە بەشێکە لە ئەرکە سەرەکییەکانی مۆبایل، لەوانەش خۆسووتاندنی ئافرەتان و خراپی ڕێگەو بانەکان کە چەندین ڕووداوی هاتووچۆی خوێناوی لێ دەکەوێتەوە و شەڕی خێڵەکی و تەقینەوە و ڕفاندن و...هتد، کە دیارە مۆبایل ئامرازێکی کاریگەرە بۆ گواستنەوەی هەواڵی ئەم ڕووداوانە و بەپێی تۆژینەیەوەکی نوێ، کە لەلایەن زانکۆی بیرکلی ئەمەریکاوە ئەنجام دراوە ئەو ڕوون بۆتەوە کە(٩٨٪)ی زانیارییەکان بەهۆی مۆبایلەوە بۆ یەکتر دەگوازرێنەوە[٥] ، دیارە چیرۆکنووسیش سوودی لەمە بینیوە و بەهۆی بەکارهێنانی مۆبایلەوە بۆ گەیاندنی هەواڵی ئەو ڕووداوانە، توانیویەتی کۆمەڵێك کێشەی کۆمەڵایەتیی لەتانوپۆی ڕووداوەکە هەڵبکشێت و ڕەخنەیان ئاراستە بکات.

## سەرچاوەکان


١- ئارام سدیق، ناونیشان لە چیرۆکی کوردیدا، چاپخانەی کاردۆ، سلێمانی .٢٠٠٩

٢- د. نەجم خالید نەجمەدین، تەکنیکی دایەلۆگ لەهەندێ نموونەی هاوچەرخی کورتە چیرۆکی کوردیدا، گۆڤاری(زانکۆ)، ژمارە(٢٤)، نیسانی ٢٠٠٥.

٣- د.أحمد محمد صالح، نحو نظريّة اجتماعيّة لَلهاتف المحمول، www.ejtemay.com

٤- ئارام سدیق، ستاتیکای گێڕانەوە، چاپخانەی یاد، سلێمانی ٢٠٠٩.

## سێبەری مەرگ و بەکەتواربوونی ئازادی
## لە سێ چیرۆکی
## ( محەمەد ئەمین ئەحمەد)دا

١ـ کەناری و حەوزەڵی دەرختەکان:

٢ـ بورجی تەڵەتاس:

٣ـ ناسێتا و دەنکە هەناری عەنەب:

رەنگە گێڕانەوەی ئەو رۆژانەی، کە بەعس وەکو دەسەڵاتێکی داگیرکەر لە کوردستاندا بوو، لە سەرەدەمێکی وەکو ئێستەدا ئەو کاریگەرەی پێشانی نەمابێت، بەتایبەتیش بۆ نەوەی ئێستە کە بیست ساڵە لە دەرەوەی بازنەی دەسەڵاتی بەعس ژیان بەسەر دەبەن و بەچاوی خۆیان زوڵم و چەوسانەوەی ئەو رژێمەیان نەبینیووە، لەگەڵ ئەوەشدا نەوەی نوێ خاوەنی دەیان گرفتی تایبەتی خۆیەتی کە گرفتەکانیان زۆر جیاوازە لەگەڵ ئەو گرفتانەی کە نەوەی پێشووتر هەیانبووە.

بۆیە زۆر بەئاسانی دەتوانین هێڵێکی جیاکەرەوە لەناوان هەردوو نەوەی کۆن و نەوەی نوێ بکەین بەوەی کە نەوەی کۆن بەحوکمی بارودۆخی داسەپاوی ئەو کاتە لەروانگەی هزرێکی نەتەوایەتی و رۆحێکی بەگژداچووی یاخی دەڕوانییە مەسەلەکان و گرینگترین شتێك کە لای ئەو مەبەست بووبێت و هەوڵی وەدیهێنانی بۆ دابێت و هەموو ئامرازەکانی ژیانی لەپێناوی بەگڕ خستبێت، بەرژەوەندی گشتیی بووە، کە ئەویش خۆی لە رزگاربوون و ئازادبوونی تاکی کورد بینیووەتەوە، هەر بۆیە لە ناوەندەکانی فەرمانگە و دامودەزگە و قوتابخانە و دەشت و شاخ و کێوەکانەوە هەوڵی بەدەستهێنانی ئازادییەکانی داوە و بۆی تێکۆشاوە، واتە بەپلەی یەکەم کێشە و گرفتی نەوەی کۆن، کێشە و گرفتی کۆمەڵگە و خاك بووە. بە پێچەوانەوە کێشە و گرفتەکانی نەوەی ئەمڕۆی کوردستان بە حوکمی ئەو بارودۆخەی کە تێیدا دەژیت لە

ئاقارێکی دیکەدایە و ڕاپەرین و ئـازادبوونی کوردسـتان و دامەزرانـدنی نیمچـە قەوارەیـەکی نەتـەوەیی و کاریگەرییـەکانی پێشـکەوتنی زانیـاریی و جیهانگـەرایی و کێشـەو گرفتـە هەنووکەییـەکانی نـاوخۆیی، نـەوەی نوێیـان سـەرقاڵ کـردووە و ئەوەنـدە لەخـەمی کێشـەو گرفتەکانی ئێستەی دایە، ئەوەندە ناپرژێتە سەر مەسەلە چارەنووسسازەکانی نەتەوەکەی، کـە ئەمەش زەنگێکی مەترسیدارە لەسـەر ئاینـدەی ئـەو کۆمەڵگەیـە، بەتایبـەتیش کـە هـزری نەتەوەیی لە پاشەکشەدایە و نەوەی نوێ کە خۆی لـەژێر سـایەی دەسـەڵاتی بەعسـدا ژیـانی نەگوزرانـدووە، ئەوەنـدەش لـە ئـێش و ئـازار و موعانـاتی وان سـەردەمان ناگـات، یـاخود بەواتایـەکی دیکـە تـەنیا بـاس لـە زوڵـم و زۆرداری دەسـەڵاتی بـەعس دەکرێـت، بـەڵام وردەکارییەکانی ئەو زوڵمە و کەتوارەی لەبەرچاو نییە.

بۆیە گێڕانەوەی ئەو کارەسات و زوڵم و زۆرداریيانەی بەعس بۆ نەوەی نوێ کارێکی بەجێیە و پێویستە ئەو کارەسات و زوڵم و زۆرداریيانە لە کۆی نەستی نەوەی نوێـدا جـێگیر بکرێـت و هەمیشە خۆمان بەوە فریو نەدەین، کە ئیدی ئەو سەردەمە بەسەرچـووە و ئێسـتەش زوڵـم و زۆرداری هەر ماوە و ئەوەی لەو سەردەمدا بەعس کردوویەتی ئێستەش بەشـێواز و بـەرگێکی دیکەوە ئەنجام دەدرێت و...هتد، کە ڕەنگە ئەم جۆرە لێکدانەوانە لە ئەنجامی بـێ ئومێـدبوون بێت لە چارەسەرەکردنی کێشەکانی ئێستە، بەڵام پێویستە کارەساتەکان هەمیشـە بەچـاوێکی دیکەوە تەماشا بکرێن و هەوڵبدرێن بکرێنە ڕێگەیەك بۆ وەدیهێنـانی ئـاوات و ئازادییـەکانی میللەت. ئەوەتا ئێسـتەش گـەلێکی وەکـو جوولەکـە بـەڕێز و شـکۆیەوە یـادی جینۆسـایدی هۆلۆکۆست دەکەنەوە، هەروەها ژاپۆنییەکان تا ئێستەش کارەساتی بۆردوومـانکردنی هـەردوو شاری هیرۆشیما و ناکازاکیان لـە پـێش چـاودا نەسـڕاوەتەوە و یـادی دەکەنـەوە، یـەکێك لـە ئامانجەکانی ئـەو یادکردنەوەیـە لای ئـەو وڵاتانـە ئەوەیـە کـە لەڕێگـەی ئـەو یادکردنەوەیـە هەوڵدەدەن گوتارێك بەرهەم بهێنن بۆ نەوەی نوێ کە هەمیشـە کارەسـات و زوڵـم و سـتەمی داگیرکارییان لەبیر بێت و وەفایەکیش بێت بۆ قوربانییەکانی ئەوان ڕۆژان کە بوونەتە هۆکـاری سەربەرزی ئەمڕۆکەیان.

لە راستیشدا ئەو کارەسـاتانەی بەسـەر میللـەتی کـوردا هاتوونـە کـەم نـین و وێنـەیان لەمێژوودا دەگمەنە، تا ئێستەش دژایەتییەکان و دوژمنداریيکردنی کورد بە چەندین شـێواز و بەرگی جیاوازە وەکو پرۆسەیەك ئەنجام دەدرێت و بەڕێوەدەچێت. بۆیە گێڕانەوەی ڕووداوەکـانی

کارەساتەکانمان ئەرکێکە و پێویستە ئێمە سوود وەربگرین لە تەوزیفکردنی ئەو کارەسات و چەوساندنەوەیە لە دارشتنی چیرۆك و رۆماندا. چونکە چیرۆك جگە لەوەی کە دەقێکی ئەدەبییە، لەهەمان کاتیشدا دەکرێت ببێتە دەروازەیەك بۆ خوێندنەوەی مێژووی میللەتێك و هەروەکو (رۆلان بارت) جەخت لەسەر ئەمە دەکاتەوە کە هیچ گەل و نەتەوەیەك لە رابردوو و ئێستەو لەهیچ شوێنێکدا نییە بەبێ ئەوەی چیرۆکی نەبێ(١). لێرەشدا ئەو پرسیارە دێتە پێشەوە کە ئایا چیرۆکی کوردی بەراستی توانیویەتی سوود لەو کارەساتانە وەربگرێت و لەدووتوێی دەقێکدا بیخاتەروو، بەواتایەکی دیکە تا چەند چیرۆکی کوردی لەتەك ئەو کارەساتە جەرگبرانەدا تەی کردووە، بۆ ئەوەی ئەویش ببێتە مینبەرێك بۆ رەنگدانەوەی ئێش و ئازاری تاکی کورد؟ بێگومان لێرەدا دەبێ ئاماژە بەو راستییە بدەین کە مەرج نییە کارەساتی گەورە و جەرگبر دەقی چیرۆکی گەورەو مەزن بهێنێتەکایەوە و دواتر ببێتە هۆکارێك بۆ خۆدیتنەوەی تاکەکان لەناویدا، بگرە دەکرێت کارەساتێکی گەورە زۆر بەکورتی باس بکرێت و بخرێتەروو، یاخود تەنیا ئاماژەیەك بەس بێت بۆ کارەساتەکە، لەهەمان کاتیشدا دەکرێ رووداوێکی بچووکی لابەلای کارەساتەکە بکرێتە چەقی دەقەکە و لەوێوەوە کارەسات باس بکرێت. بەواتایەکی دیکە ئەوە چیرۆکنووس خۆیەتی کە لە چ گۆشەنیگایەکەوە باس لەو کارەساتە دەکاتە و چ لایەنێکی تەوزیف دەکات بەمەبەستی گەیاندنی پەیامەکەی. چیرۆکنووس لەو گۆشەنیگایەی کە باس لەو کارەساتانە دەکات، دەتوانێت دیمەنێکی ئەو کارەساتانە وەربگرێت و بەهۆیەوە شوێنەواری ئەو کارەساتانە لەسەر تەواوی کایەکانی ناو کۆمەڵگە شیبکاتەوە. لەم روانگەیەوە چیرۆکنووس (**محەمەد ئەمین ئەحمەد**) لەهەر سێ چیرۆکەکەیدا ( کەناری و حەوزەڵی دەرختەکان و بورجی تەڵەتاس و ناسێتا و دەنکە هەناری عەنەب) سەرەرای رەنگدانەوەی بارودۆخی ئەو سەردەمە، لەگەڵ ئەوەشدا رەنگدانەوەی کارەساتەکانی ئەنفال و کیمیاباران و جینۆسایدکردنی لەسەر تەواوی بنیاتی کۆمەڵگەی کوردی باس دەکرێت، لەوانەش سیستەمی پەروەردە کە چۆن لە ناو سیستمەمێکی داپڵۆسێنەری وەکو بەعس بەچاوێکی سووك سەیری دەکرا و بێ حورمەتی بەرانبەر دەکرا. هەروەها کارەکتەری مامۆستا، کە نەوەی نوێ پێدەگەیەنێت، کەچی لەلایەن رژێمەوە هیچ رێز و بەهایەکی نییە، ئیتر تەواوی ئەو سیستەم و کایەی نێو کۆمەڵگە لەچوارچێوەی ئەو کارەسات و نەهامەتییانەدا دەخرێنەروو. بۆیە ئەگەر بگەرێینەوە بۆ وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارەی، کە پێشتر ورووژاندوومان لەبارەی چیرۆکی

کوردییەوە، دەتوانین بڵێین چیرۆکی کوردی بەپێی ئەو گۆڕانکارییە سیاسی و کۆمەڵایەتیی و ئابوورییانەی کۆمەڵگەی کوردی هەنگاوی ناوە و گوزارشتی لە ئێش و ئازاری تاکەکانی کۆمەڵگەکەی کردووە. چیرۆکنووسان وەکو توێژێك لەناو کۆمەڵگەدا کاریگەر بوونە بەو کارەسات و زوڵم وزۆردارییەی کە بەسەر کۆمەڵگەکەیاندا هاتووە.

بۆیە تا ڕاپەڕین چیرۆکی کوردی بەشێوەیەکی گشتیی لەچوارچێوەی ئایدیۆلۆژی و سیاسەت کە خۆی لە خانەی بیری نەتەوەیی دەبینیەوە نەچۆتە دەرەوە، کە ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە کە چیرۆکی کوردی لەلایەکەوە وەکو بەشێك لە ئەدەبی بەرگری وازی خۆی کردووە، لەلایەکی دیکەشەوە بەپێی بارودۆخەکە هەنگاوی هاویشتووە و لەگەڵ خەم و ئێش و ئازارەکاندا بووە وهەوڵیداوە لایەنە کەموکوڕییەکانی ئەو سەردەمە دەستنیشان بکات و چارەسەرییان بۆ بدۆزێتەوە. بۆیە بەڕای ئێمە چیرۆکی کوردی لەکاتی سەرهەڵدانیەوە تا ڕاپەڕین، دەکرێت بڵێین لەلایەن چیرۆکنووسانەوە بەشێوەیەکی گشتیی لەسەر دوو تەوەری سەرەکیی کاری کردووە:

١ــ بەبیروباوەڕێکی چەپخوازییەوە لەمەسەلەکانی ڕوانیوەو هەوڵیداوە لە ڕێگەی چارەسەرکردنی کێشەی چینایەتی، میللەت بە مافەکانی بگەیەنێت.

٢ـ لەروانگەی بیروباوەڕێکی نەتەوەیی و لەچوارچێوەی ئەدەبی بەرگریدا هەوڵیداوە لەگەڵ بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی میللەت هەنگاو بهاوێت و گیانی بەرخۆدان و یاخیبوون بەرز بکاتەوە.

بەشێوەیەکی گشتیی ئەم دوو ڕەوتە کە ناوەرۆکی دەقەکانی پێش ڕاپەرینیان پێکدەهێنا، کە دەشڵێین بەشێوەیەکی گشتیی مەبەستمانە لەوەی کە لەناو ئەم دوو ڕەوتەشدا فەزای دیکەش هەبووە و چیرۆکنووسان بابەتی دیکەشیان خستۆتە بەر تیشك و ناوەرۆکی دەقەکانیان لەسەر بنیاتناوە، بەڵام بەهۆی بارودۆخی ئەو سەردەمە کەمتر بواری باسکردنی بابەتی دیکە بۆ چیرۆکنووسان لواوە، بەتایبەتیش کە هەندێك لەخودی چیرۆکنووسەکان خۆیان بەشێك بوونە لە پرۆسەی یاخیبوون دژی ڕژێم و پاڵپشتیکەری شۆڕش بوونە. بۆیە بەڕای ئێمە لە مێژووی کاروانی چیرۆکی کوردیدا بەشێوەیەکی گشتیی ئەم دوو ڕەوتە ناوەرۆکی دەقی چیرۆکی کوردییان پێکهێناوە و هەمیشە لەسەر ڕایەڵەکانی ئەم دوو فەزایەدا چیرۆکنووسان کاریان کردووە و بەرهەمیان هەبووە. ئەگەر لەم چوارچێوەیەدا سەیری ئەم سێ چیرۆکەی چیرۆکنووس (

محەمەد ئەمین ئەحمەد) بکەین دەبینین لەسەر بنەمای تەوەری دووەم کار دەکات و چیرۆکەکانی زیاتر لە سەر بناخەی بیروبۆچوونی هزری نەتەوەییەوە دارێژراون، دیارە مەزراندنی چیرۆکێك لە سەر بیروبۆچوونی نەتەوەیی بەتایبەتیش بۆ میللـەتێکی ژێردەسـتە، دەچـێتە خانـەی ئـەدەبی بەرگرییەوە.

لەم دۆخەشدا ئەدەب بە هەموو ژانرەکانییەوە لە خزمەت خەبات و تێکۆشانی میللەتـدا دەبێت. چیرۆکنووسیش لەم سێ چیرۆکەیدا لەسەر تێکۆشان و قوربانی میللەتەکەی دواوە، لـە چەند دیمەنێکدا زوڵم و زۆرداری دوژمنان و پاکی و بێ تاوانی خەڵکی پیشان دەدات، ئەمـەش لەڕێگەی خوڵقاندنی ململانێیەك لەناوان دەسەڵاتدارێکی بیۆیژدان کـە سـڵ لـە هـیچ کـار و کردەوەیەك ناکاتەوە، هەروەها کەسانێك کـە سـڤیل و بـێ پشـتوپەنان و داوای ئـەوان تـەنیا ئازادییە و لەم پێناوەشدا خۆیان کردۆتە قوربانی. ئەو ململانێیە بەتایبەتی لەهەردوو چـیرۆکی (کەناری و حەوزەڵی دەرختەکان و ناسێتا و دەنکە هەناری عەنەب) پێکهێنەری پیشاندانی ئەم وێنەیەیە و تانوپۆی ڕووداوەکانی لەسەر ئـەم دژایەتییـەدا دارێـژراوە و لەچـیرۆکی کـەناری و حەوزەڵی دەرختەکان)دا دروستکردنی ئەو ململانێیـە لەچوارچـێوەی خۆپیشـاندانی قوتابیـانی ئامادەیی سلێمانیدا و لەبەرانبەریشـدا دلڕەقـی و بیۆیـژدانی دارودەسـتەی ڕژێـم دەرخـراوە، لوتکەی ئەو ململانێیە کوشتنی کەنارییە کە یەکێکە لە قوتابییەکان، دواتر دەسـتگیرکردنی تەواوی ئەوانەی کە بەشدارییان لەو خۆپیشاندانەکەدا کـردووە. لەچـیرۆکی (ناسـێتا و دەنکـە هەناری عەنەب) یشدا ململانێیەکە لەناوان خەڵکی بێ دەرەتـان و سـڤیلی هەڵەبجـەو هـەمان ڕژێمدایە کە تاوانی کیمیابارانیان وەکو تاوانێکی بێ وێنە لە بەرانبەریان ئەنجام دەدرێت. دیارە لەم دوو چیرۆکەدا پیشاندانی ململانێیەکە تاکلایەنانەیـە، بەواتایـەی کـە تـەنیا دەرخسـتن و پەنجەخستنەسەر تاوانەکانی دوژمـن و کۆڵنـەدان و خـەباتی میللەتـە. واتـە لـەژێر ڕۆشـنای ململانێی چین و توێژەکانە لەدژی دەسەڵات و بەپێی ڕەوتی ڕووداوەکانی ئەم دوو چیرۆکەش ئەو ململانێیە بێ کۆتایی و هێشتا ئەنجامدانی تاوان لە دژی ئەم نەوەیـەی کـە داوای ئـازادبوونی خۆی دەکات بەردەوامە و یاخیبوون و بەرگریکردنیش بەهـەمان شـێوە بەردەوامـە و کـاروانی خۆی تەی دەکات، بەڵام لەچیرۆکی (بورجی تەڵەتاس)دا ئەو ململانێیە دەگاتە ترۆپك و هەموو ئەو زوڵم و زۆردارییەی دوژمن، بە خەبات و تێکۆشانی میللەت کۆتایی دێت، ئـەو خـەبات و تێکۆشانەش بە ڕاپەڕین دێتەدی کە چیرۆکنووس لێرەدا هێماکارییەکی جـوانی بـەکارهێناوە و

دەرگاكردنەوەی وەكو هێمایەك بۆ ڕاپەڕینی كورد بەكاربردووە كە دوای ئابلوقـەدانی لەهـەموو لایەكەوە و هەوڵدان بۆ خنكاندنی، ڕاپەڕین وەكو دەرگایەك بەڕوویدا كرایەوە و بە ئاواتـەكانی گەیاند:

ـ (( كێ درەگامان لێ دەكاتەوە؟))

ـ لە دەرگا بدە، هەر لەدەرگا بدە، تا دەكرێتەوە.

ـ دەرگا كردنەوەی گشت ئاواتێك هەر بەلێدانە، لە دەرگا بدە، وەڕس مەبە.

ئەم هێماكارییە هەرچەندە پێشتریش لە چیرۆكی كوردیدا بەكارهاتووە، بەڵام بەكارهێنانی لەچیرۆكەكانی دوای ڕاپەڕیندا ( هەم بۆ دەربڕینی مەبەستی سیاسییان و هەمیش بۆ جوانكاری و بەرگێكی نوێی گێڕانەوە كە لە گێڕانەوەی ئاسایی دەربازی كەن و مۆركێكی پڕ لە سـیحر و فانتازیای بەبەردا بكەن) [٢] بەكارهاتووە كە بەهۆیەوە خوێنەریش بەشـداری لـە ڕاڤەكردنیـدا دەكات.

لەم چیرۆكەدا كۆتاییەك بۆ ئەو زۆرانبازییە دادەنرێت كە چیرۆكنووس لە ڕێگەی خولّقاندنی ململانێی نێوانیان دروستی كردبوو و بەسەركەوتنی هێزی چاكە و لەسەر حەق و دوایی هاتنی زوڵم وزۆرداریی ڕژێم كۆتایی دێت:

(ئیدی كیژۆڵەی نازدارمان بە تالآنی نـابرێن. ئـاودیو نـاكرێن، لـەبازاڕی ڕەشـدا، ئـالوێر ناكرێن. گەنج و لاومان سنووورداش ناكرێن....)

هێڵی درامی ئەم سێ چیرۆكە لە هەڵكشاندایە و لەهەردوو چیرۆكی (كەناری و حـەوزەڵی دەرختەكان و ناسێتا و دەنكە هەناری عەنەب) دا خوێنەر بە ڕووداوە دڵتەزێنەكان و كارەساتە نالـەبارەكان ئاشـنا دەكرێـت و هـەموو ئـەو زوڵـم و زۆردارییـەی دوژمـن دەخرێتـەڕوو پێـی دەناسێنرێت. لە چیرۆكی (بورجی تەڵەتاس)یشدا بەهۆی خۆڕاگری و پێداگیری میللەت لە سەر بەدەستهێنانی مافەكانی دەگاتە كۆتایی كە ڕاپەرینە و سەركەوتنە بەسەر دوژمن. بەواتایـەی كە سڕینەوەی مەرگە، ئەو مەرگەی كە دەسەڵاتی داپلۆسێنەری بەعس وەكو سێبەرێك لە نـاو كۆمەڵدا بە تاكەكانییەوە نووساندبووی، كە ئەو تاكانە هەمیشە لەوە دەترسان لە سـاتێك لـە ساتەكان سێبەرەكان لوولیان بدەن و جەستەیان ببەنە ژێر خاك، لەگـەڵ ئەوەشـدا ئـەو تاكانـە هەمیشە بـە بـاوەڕێكی پۆلاینـەوە ڕووبـەڕووی ئـەو سـێبەرانەی مەرگـەوە بوونـەوە وتـا دوا هەناسەیان شەڕیان لەگەڵدا كرد تا دەرگای ئازادییان كردەوە. بەو واتایەی كە چـیرۆكنووس لـە

ناو جەستەی دەقـدا چـەندین دوانـەی دروسـتکردووە لەوانـە (داگیرکـاری / ڕزگـاربوون) لـەو ڕوئیایەوە داگیرکاری هەر بریتی نییە لە داگیرکردنی خاك، بگرە داگیرکردنـی سـەرجەم کایـەو بوارەکانی ئەو نەتەوەیەیە کە داگیرکراوەو گەیشتن بە پرۆسەی ڕزگاربوونیش لە فەزایەکی پڕ لە یاخیبوون و ڕەتکردنەوە ساز دەبێـت و دێتەکایـەوە. هـەروەها دوانـەی ( سـێبەر / ڕۆژ) بـەو واتایەی سێبەر لە تاریکیدا ڕوونترەو دەکرێت مرۆڤ شـتەکان لەناویـدا ببینێـت و ئاسـۆیەکانی تێدا بخوێنێتەوە، ڕۆژیش وەکو هێمایەك بۆ ڕووناکی و ئاسودەگی و ڕەوینەوەی تـەمومتومانی سێبەرەکان و گەیشتن بە ترۆپکی ڕزگاربوونە. (مەرگ / ئازدای) ئـەم دووانـەی کـە هەمیشـە پێوەستن بەیەکەوەو یەکێکیان ڕێگەخۆشکەرە بۆ ئەوی دیکەیان، مەرگ و پرۆسەی بەمەرگبوون لە پێناو خاك و نەتەوەدا هەمیشە ئامادەکاریی و زەمینەسازییەك دەخوڵقێنێت بۆ بەدیهێنانی ئازادی، ئەو ئازادییەی  کە هەمیشە مرۆڤەکانی سەرقاڵی خۆی کردووە.

بەڕای ئێمە ئەو هزرە نەتەوەییـەی کـە چـیرۆکنووس کـاری لەسـەر کـردووە چ لـە ڕووی دیکۆمێنتەوە و چ لەڕووی ناساندنی دۆزی کورد کارێکی پێویستە، ئەگەر چی لە پێش ڕاپەڕین ڕەنگدانەوەی هزری نەتەوەیی لە چیرۆکی کوردیدا بەمەبەستی بەرزکردنەوەی ورەی جـەماوەر و پەروەردەکردنی گیانی نیشتمانپەروەریی بووە، کەچی لە دوای ڕاپەڕینـەوە بەردەوامیـدان بـەم هزرە نەتەوەییە لەچیرۆکی کوردی لەلایەکەوە زیاتر بەمەبەستی ناساندن و ئاشناکردنی نـەوەی نوێیە بە وردەکارییەکانی ئەو تاوانانەی کە دەرحەق بـە کـورد کـراوە و لەلایـەکی دیکەشـەوە تۆمارکردنی ئەو ڕووداوانەیە کە بەسەر یەکە یەکەی تاکەکانی کـوردا هـاتووە، چـونکە هـیچ تاکێکی کورد نەبووە چیرۆکێکی نالەباری لەگەڵ ڕژێمی بەعسدا نەبووبێ و دواجار تۆمارکردنی ئەم ڕووداوانەیە لە قالبێکی هونەریدا.

لەمبارەیەوە پێویستە ئاماژە بەوەش بدەین کـە لـە قۆناخبەنـدکردنی کـاروانی چـیرۆکی کوردیدا، ڕەخنەگران و لێکۆڵەران ئاماژەیان بەوەداوە کە قۆنـاخی پـێش ڕاپـەڕین، قۆناخێکـە زیاتر کەوتۆتە ژێر کاریگەریی ئایدیۆلۆژیای نەتەوەییەوە، بەڵام لەقۆناخی دوای ڕاپەڕین هەست بەوە دەکەین کە ئەم هزرە نەتەوەییە بەرەو کاڵبوونەوە دەچـێت، کـە ئەمـەش هۆکارگـەلێکی خۆی هەیە کە ئێرە جێگەی باسکردنی نییە، بەڵام بەڕای ئێمـە ئـەم کاڵبوونەوەیـە لـە هـزری نەتەوەیی لە باشووری کوردستان کاریگەرییەکی ڕاستەوخۆی لەسەر چیرۆکی کوردیش دانـاوە و ئەو دەقانەنەی، کە ئێستە لەژێر ڕۆشـنایی هـزری نەتەوەییـەوە دەنووسـرێنەوە ژمارەیـان زۆر

کەمە، ئەمە لەکاتێکدایە کە هێشتا کورد چ لە باشووری کوردستان و چ لە پارچەکانی دیکەدا بەتەواوەتی بە ئازادییەکانی خۆی نەگەیشتووەو هێشتا مەترسییەکان لەسەر کورد هەر ماون، بۆیە بەڕای ئێمە پێویستە ئەم ڕەوتە لەناو چیرۆکی کوردیدا درێژەی پێ بدرێت و با چیرۆکی کوردی ببێتە ئەو پێگەیەی، کە جگە لە خەمەکانی تاك، خەمەکانی دووبارە زیندووکردنەوەی گیانی نەتەوایەتیشی لە ئەستۆ بێت.

## ناونیشان و دەستپێکی دەق:

ناونیشان ڕەگەزێکی گرینگی چیرۆکە و شوناسی دەقە و بەهۆیەوە ناوەرۆکی دەق زیاتر دێتە ناسین، لە ڕاستیدا هەموو شتێك لە گەردووندا خاوەن ناونیشانی خۆیەتی و هەموو بوونەوەرەکان بەمرۆڤیشەوە بەهۆی ناونیشانیانەوە لەیەکتری جودا دەبنەوە، بۆیە گرینگی ناونیشان لە چیرۆکیشدا دەردەکەوێت و بەرهەمی نووسەرێك لە نووسەرێکی دیکەوە بەهۆی ناونیشانەوە لەیەکتری جودادەبنەوە. لەمبارەیەوە (لۆسییە گۆڵدەمان) پێی وایە ناونیشان سوورەیای دەقە و دەتوانێت ڕێگە پێچوو و پەناکانی دەق ڕووناك بکاتەوە ولەسەرەوە تیشك بهاوێژێتە سەر جەستەی دەق [٣] ، بەو واتایەی کە ناونیشانیش خۆی دەقێکی بچووکراوە و چڕکراوەیە، لەگەڵ یەکەم خوێندنەوە سەرنجی خوێنەر بۆ خۆی ڕادەکێشێت و چەند دالێك لەلای خوێنەر دروست دەکات و وای لێ دەکات لەهەناوی دەقدا بەدوای مەدلولولەکاندا بگەڕێت و کۆدەکان بدۆزێتەوە بۆ ئەوەی چێژ و ئێستێتیکایەکی دەست بکەوێت کە بەهۆیەوە مەعریفەیەك بەرهەم بهێنێت کە دواجار لە سوودی تاك و کۆمەڵگە تەواو بێت، واتە ئەو مەعریفەیە لە هەنگاونان لە جەستەی دەقەوە بۆ جەستەی تاك و کۆمەڵگە سەرەتاکەی بە ناونیشان دەست پێدەکات و ڕێڕەوی خۆی دەبڕێت بۆ دروستکردنی ئەو ئێستێتیکایەی کە مەعریفەی لێ دەچۆڕێ. بۆیە ناونیشان کلیلێکە و دەرگاکانی ناو دەقی پێ دەکرێتەوە و لەو دەرگەیانەشەوە خوێنەر دەخرێتە نێو ژوورەکانی دەقەوە. بۆیە ئەگەر سەیری ناونیشانی ئەم چیرۆکانەی (محەمەد ئەمین ئەحمەد) بکەین، ئەوا دەبینین، کە چیرۆکنووس لە دەستنیشانی ناونیشانی چیرۆکەکانیدا وردەکارییەکی بەکارهێناوە و هەوڵیداوە لەرێگەی ناونیشانەوە خوێنەر پەلکێشی خوێندنەوە بکات و دووچاری پرۆسەی کەشفکردنی دالەکانی نێو دەقی بکاتەوە.

ناونیشانی چیرۆکی (کەناری و حەوزەڵی دەرختەکان) ناونیشانێکە جۆرێـك لـە تەمومـژ و نادیاری لەخۆی گرتووە، کە ئەمەش یەکێکە لە خەسڵەتەکانی ناونیشانی سـەرکەتوو، چـونکە پێویستە ناونیشان جۆرێك لە نادیاری و تەمومژ لەخۆ بگرێـت و بـەزوویی خـۆی بەدەسـتەوە نەدات، تاوەکو خوێنەر دووچاری ڕامان و لیٚ وردبوونـەوە بکـەن و ببنـە بەشـێك لـە هەسـتە هەنووکەییەکانی. ئەگـەر لـە ناونیشـانی ئـەم چـیرۆکە وردبینـەوە دەبیـنین کـە چـیرۆکنووس ناونیشانەکەی لە دوو پارچـە پێکهێنـاوە بـەهۆی ئـامرازی بەسـتنەوە، کـە (و)وە بەیەکـدیی لێکێندراون. پارچەی یەکەم ناوی ئەو قوتابییە کچەیە، کـە تـەوەری سـەرەکیی چـیرۆکەی لـە ئەستۆیە و پاڵەوانی سەرەکییە کە بەهۆیەوە تانوپۆی ڕووداوەکانی کردووە. پارچەی دووەمـیش برێتییە لـە وەسـفکردنی شـوێنێك کـە بـەڕای ئێمـە ئـەو شـوێنە بەهەشـتە و لـە ئـەنجامی شەهیدبوونی کارەکتەری سەرەکیی کە کەنارییە دەگاتە ئەویٚ، کە ئەمەش لە وێنەیەکی جواندا نەخشێندراوە بەوەی، کە کەناری وەکو دەرختێك حەوەزڵ دەدات، واتە گەشە دەکات و دەگاتـە جیهانی ئەودیو. ئەو شوێنەش کە لە ناونیشاندا بەکارهاتووە دەتوانین بڵێین لێـرەدا شـوێنێکی زیاتر خەیاڵییە و وشەی حەوزەڵیش لە رووی بەکارهێنانییەوە جۆرێك لە پەنهانی بـەو شـوێنە بەخشیوە. لەگەڵ ئەوەشدا هەرچەندە لەم ناونیشانەدا جۆرە زیندوویەتییـەك بـەدی دەکـەین و ڕووداوێك خۆی لە هەناوی دەقی ناونیشانەکەدا حەشارداوە، بـەڵام بـەڕای ئێمـە ناونیشـانەکە ئەگەر تەنیا (حەوزەڵی دەرختەکان) بوایە زیاتر تەمومژاوی و نادیارتر دەبوو، بەمەش چەندین پرسیار لەمێشکی خوێنەر دروست دەبوو، لەکاتێکـدا لکانـدنی کـەناری بـە ناونیشـانەکەوە، جۆرێك لە کەشفکردنی نـاوەرۆکی چـیرۆکەکە دەردەخـات. بەتایبـەتیش کـەناری کارەکتـەری سەرەکییە و خوێنەر یەکسەر بەهۆی ئەم ناونیشـانەوە ئاشـنای دەبێـت و بەشـێك لـە کـۆدی چیرۆکەکەی بۆ ئاشکرا دەبێت. دەتوانین بڵێین ئەم ناونیشانە درێژەپێدەری ناوەرۆکی دەقەکەیە، چونکە (ناونیشان بە ناوەرۆك و بابەتی دەقەکـەوە پێوەسـتە و گوزارشـتی لـیٚ دەکـات، هـەر بۆیەش پێویستە گوزارشت لە زۆربـەی واتـا و دەلالەتـەکانی دەقەکـە بکـات ئینجـا چ نـاوی شاکەس، یان شوێن، یان پێوەندیی بە دیاردە و لایەنێکی بیرۆکەی دەقەکەوە هەبێت)[٤]. لێرەدا سەرەڕای ئـەوەی کـە نـاوی کارەکتـەر و شـوێن لـە ناونیشـاندا هـەن، لـە هـەمان کاتیشـدا ڕەنگدانەوەیەکی ئاشکرای ڕووداوەکانن و تەواوکەری ناوەرۆکی دەقن.

هەروەها لە چیرۆکی ( بورجی تەڵەتاس)دا، ناونیشان برێتییە لە یەکێك لە دوازدە بورجەکان، کە دیارە بورجیش زیاتر بۆ خوێندنەوەی دوارۆژدا بەکاردێت و لێرەدا ناونیشان زیاتر ئاماژەیەکە بۆ ئایندە و هەوڵ دەدرێت وێنای ئایندە ڕوئیا بکات لە چوارچێوەی فەزای مەینەتی و کارەساتەکاندا. بەکارهێنانی ناوی بورجێك خۆی لە خۆیدا جۆرێك لە تەمتومان لەلای خوێنەر دروست دەکات، چونکە ڕەنگە لێکدانەوەکانی ئەو بورجە باش بێت و ڕەنگە خراپ بێت، بەو واتایەی چەمکەکە دووسەرە و لایەنی باش و خراپ لە هەناوی خۆیدا هەڵگرتووە، بەڵام ئەگەر لە ناوی بورجەکە وردبینەوە (تەڵەتاس)، کە لە ناوچەی گەرمیان ناوی یەکێك لە بورجەکانە و بەو واتایە بەکاردێت، کە شتی خراپ دەبارێنێت و زیاتر بورجێکی خەیاڵییە. کەواتە زیاتر لایەنی خراپە دەگرێتەوە. ئەمەش لەگەڵ ناوەرۆکی دەقدا وێکدێتەوە، کە خراپەکاری و تاوان بەسەر میللەتدا دەبارێت، تا دواجار ڕاپەڕین دەکرێت و سنوورێك بۆ ئەو تاوانانە دادەنرێت. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ناونیشان لەناوەرۆکدا ڕەنگیداوەتەوە و بەقووڵی چۆنە ناو بنج وبناوانی دەقەوە. لێرەدا ناونیشان بەحوکمی ئەوەی کە هەڵگری شتێکە خەیاڵییە و هەروەها لەرووی زمانەوەش دەستەواژەی ناوچەیەکی دیاریکراوی هەڵگرتووە کە ڕەنگە ئەم دەستەواژە بەحوکمی ناوچەیی بوونی جۆرێك لە تەمومژ و نادیاری و پەنهانی وەرگرتووە و یەکڕاست واتایەك بە خوێنەر نابەخشێت، بگرە خوێنەر عەوداڵی گەڕان بە دوای واتای ئەو بورجە و تێگەیشتن لەناواخنەکەی دەکات. ئەمەش جۆرێکە لە کەمەندکێشکردنی خوێنەر کە بەهۆی ناونیشانەوە دەکرێت ئەم ئەرکە ئەنجام بدرێت.

هەروەها لە چیرۆکی ( ناسێتا و دەنکە هەناری عەنەب)شدا، هەمان ئەو تەکنیکەی کە لە چیرۆکی ( کەناری و حەوزەڵی دەرختەکان)دا بەکاری هێناوە، لە ناونیشانی ئەم چیرۆکەشدا بەکاری هێناوەتەوە، بەهەمان شێوە ناونیشان دوو پارچەیە، کە بەهۆی ئامرازی بەستنەوە لەیەکتری لێکێندراون، پارچەی یەکەم ناسێتا کە ناوی کارەکتەرە و بەشێك لە تەوەری ڕووداوەکان پێکدێنێت ودال و کۆدەکانی کەشف دەکات. پارچەی دووەمیش برێتییە لە ناوی شوێن، کە ئەویش ( عەنەب)ــە و دیارە شوێنی ڕوودانی ڕووداوەکانی لە ئەستۆگرتووە. شوێنێکی کەتوارییە و چیرۆکنووس هەڵیبژاردووە بۆ ئەنجامدانی پرۆسەی ڕووداوەکانی دەقەکە. ئەم ناونیشانەش بەهەمان شێوەی ناونیشانی چیرۆکی (کەناری و حەوزەڵی دەرختەکان)دا، جۆرێك لە نادیاری و تەمومژی لەخۆگرتووە، لێرەشدا لە لێگرێدانی ناوی کارەکتەر لەگەڵ

ناونیشاندا سەرکەوتووە بووە، چونکە ئەگەر تەنیا ناوی (دەنکە هەناری عەنەب) بوایە جۆرێك لە کەشفبوون و ئاشکرابوونی پێوە دیار دەبوو، واتە ناونیشانێکی سادە دەردەچوو، کە توانای کەمەندکێشکردنی خوێنەر لاواز دەبوو، بەڵام بە لکاندنی ناوی کارەکتەرەوە جۆرێك لە تەمومژ و تامەزرۆیی خوڵقاندووە. هەروەها ئەم ناونیشانە ڕاستەوخۆ پێوەستە بە ناوەرۆکی دەق و ڕووداوەکان ڕەنگدانەوەیان لەسەر ناونیشانەکەدا هەیە، چونکە کارەکتەری ڕووداوەکان و شوێنی ڕووداوەکان بوونەتە پێکهێنەری ناونیشانی دەق و ڕاستەوخۆ زەیهنی خوێنەر بۆ ئەو دوو ڕەگەزە دەگوازنەوەو قورسایی ڕووداوەکانیان لەسەر ئەو دوو ڕەگەزە لەلای خوێنەر بینا دەکەن.

بەشێوەیەکی گشتیی چیرۆکنووس لە بەکارهێنانی ئەم ناونیشانەدا بۆ چیرۆکەکانی سەرکەوتنی بەدەستهێناوە، کە ئەمەش بۆ خودی چیرۆکنووس دەگەڕێتەوە کە وەکو چیرۆکنووسێکی شارەزا و خاوەن ئەزموونی چیرۆکنووسین لەم بوارەدا دێتە ناسین و بەشێکی زۆری چیرۆکەکانی لەم بوارەدا لەناونیشاندا سەرکەوتوون وەکو (( زیندە بەچاڵکردنی وێنەی مەحاڵ و ئەبێ ونابێ ڕایەکی زمانەوانییە و دەمەقاڵێ دوێنێ ئێوارە)) (ئارام سدیق) لە توێژینەوەکەی خۆیدا (ناونیشان لە چیرۆکی کوردیدا) سەبارەت بە ناونیشان لە دەیەی حەفتاکان و هەشتاکاندا و لەبارەی ناونیشانی ئەم چیرۆکانەوە دەڵێت:( بەکاربردنی نادیاری لە ڕەگەزی ناونیشاندا لە چیرۆکەکانی(محەمەد ئەحمەد ئەمین) دەکرێت وەك نموونەیەکی جوان سەیری بکەین بۆ چیرۆکی حەفتاکان)[٥] ، ئەمەش سەلمێنەری ئەوەیە، کە چیرۆکنووس لەم بوارەدا خاوەن ئەزموونە و شارەزایە. بۆیە هەڵبژاردنی ناونیشانەکانیشی بەشێکن لە پرۆسەی جوانی بەخشین بە ناوەرۆکی دەقەکاندا.

دەستپێکیش دەروازەیەکی دیکەیە کە خوێنەر دەخاتە ئامادەباشییەوە بۆ وەرگرتنی ڕووداوەکان و چوونە ناو ناخی کەشوهەوای چیرۆکەکەوە، دەستپێك بایەخێکی لەرادەبەدەری هەیە، چونکە لەلایەکەوە بەچەند کۆپلەیەکی کورت و چڕ خوێنەر لەناو چوارچێوەی ڕووداوەکاندا قەتیس دەکات و سەرە داوەکانی دەخاتە بەردەستی، لەلایەکی دیکەشەوە زەمینەسازییەك و ڕێگەخۆشکەرێکە بۆ بەرێکردنی ڕەوتی ڕووداوەکان و گەیاندنیان بە لوتکە و کۆتاییەوە. سەرەڕای ئەمانەش لە دەستپێکدا ڕەگەزەکانی چیرۆك لە ڕووداو و کارەکتەر و کات و شوێن و دایەلۆگ.... تاد، کۆدەبنەوە و بەیەکەوە ڕایەڵەکانی چیرۆك دروست دەکەن. لەم ڕوانگەیەوە دەستپێك لەم چیرۆکانەدا بایەخێکی تەواوی پێدراوە و چیرۆکنووس هەوڵیداوە

لەرێگەی دەستپێکەوە خوێنەر ڕاستەوخۆ لەناو  کەشوهەوای چیرۆکەوە دابنێت و بە لایەنەکانی دەقەوە پێوەستیان بکات. لە چیرۆکی (کەناری و حەوزەڵی دەرختەکان)دا چیرۆکنووس لە ڕێگەی وەسفەوە دەروازەی چیرۆکەکەی داڕشتووە و ڕووداو بووەتە چەقی تانوپۆی دەستپێك، واتە یەکێك لە توخمەکانی چیرۆك بووەتە کردنەوەی سەرەتای چیرۆك و ڕاستەوخۆ خوێنەر لەبەردەم تابلۆیەك دادەنرێت کە برێتییە لە ڕووداوی خۆپیشاندانی قوتابیان لەدژی دەسەلات، خستنەڕووی ئەم ڕووداوەش لەرێگەی وەسف بووە. لەگەڵ ئەوەشدا کەسایەتییەکان لە سەرەتاوە خراوەنەتەڕوو:

(بە زۆر ویستیان کالاکانی لە بالایدا دادڕن، خۆی نەدا بەدەستەوە. لەباتی حەوت بەرد حەفتا بەردی ئاسنین و دەیان کوچکی خڕی لەناو کۆشیدا دانابوو، ئەهریمەن بە حەوت بەرد ڕەجم دەکرێت، دەبێ مرۆڤی بەدی زەنیم بە حەفتا بەرد ڕەجم بکرێت).

لەم دەستپێکدا سەرەڕای ئەوەی، کە ڕووداوێکی لەخۆگرتووە، ناڕاستەوخۆش ئاماژە بە کارەکتەر کراوە بێ ئەوەی ناوی بهێنرێت و بە خوێنەر ئاشنا بکرێت. لەهەمان کاتیشدا ئەم دەستپێکە جۆرە تەمومژ و نادیارییەکی لەخۆگرتووە کە خوێنەر دووچاری ڕامان و لێوردبوونەوە دەکەن، چونکە پێویستە دەستپێك( هەر لە چوارچێوەی ئاماژەکردنێکی کورتدا بێت و نەبێتە هۆی ئاشکراکردننی گشت کەلێن و لایەنە شاراوەکانی دەقەکە، چونکە دەستپێکی درێژدادڕ لایەنی تەکنیك و ناوەرۆکی دەق بەتاڵ دەکات  و خوێنەر ئارەزووی ئەوەی نامێنێت، کە بەدوای بەشەکانی تر بکەوێت)[٦] و لایەنە شاراوەکانی دەقە شی بکاتەوە و کۆدەکان ئاشکرا بکات.

دەستپێك لە چیرۆکی ( بورجی تەڵەتاس)دا، بەدایەلۆگێك دەست پێدەکات کە لایەن و جەمسەرەکانی هێشتا بۆ خوێنەر ڕوون  نەبوونەتەوە و نادیارن، دەستپێك لەم چیرۆکەدا بەمشێوەیە دەستپێدەکات:

( چاوی لێکنا. دڵی کەوتە لێدان. پێیان گوت:

ـ" نەترسێی لەخۆمانە")

ئەم دەستپێکە کورتە لەلایەکەوە تانوپۆی ڕووداوێك دەکات کە هێشتا ئێمە نازانین ئەم ڕووداوە جەمسەر و پێکهاتەکانی چین و باس لە چی دەکات، سەرەڕای ئەمەش ڕاستەوخۆ ئاماژە بە کارەکتەرێك کراوە کە هێشتا شێوەو ڕەنگ ودەنگی ئاشکرا نین و نازانین کێیە. ئەم

دەستپێکە بەڕای من جوانترین دەستپێکە لەم سێ چیرۆکەدا، چونکە لەلایەکەوە هەڵگری تەمومژ و نادیارییە، لەلایەکی دیکەشەوە بەهۆی دایەلۆگێك کە جەمسەرەکانی دیارنین، خوێنەر ڕاستەوخۆ هێنراوەتە نێو قووڵایی ڕووداوەکە، ئەو ڕووداوەی کەهێشتا ئەویش دیار نییە چییە، بەڵام بەهۆی دایەلۆگەوە خوێنەر دەرفەتی وەستان یان پاشگەزبوونەوەی پێنەدراوە، چونکە بەهۆی ئەو کورتبڕییەی کە لەدایەلۆگ بەکارهاتووە، زانین و زانیارییەك بەخوێنەر بەخشراوە کە وای لێکردووە بەدواداچوون بۆ ئەو زانین و زانیارییانەی ناواخنی دەق بکات، ئەمە سەرەڕای ئەوەش کە گێڕانەوەی لە خاوبوونەوە پاراستووە و یەکسەر دیمەنی ڕووداوێك و کارەکتەرێك لەبەردەم خوێنەر دانراون ، واتە دەستپێك لە دۆخێکی زۆر سەرنجراکێش دایە.

هەروەها دەستپێك لە چیرۆکی ( ناسێتا و دەنکە هەناری عەنەب)یشدا، بەهەمان شێوە بەدایەلۆگ دەست بە سەرەتای چینینی چیرۆکەکە کراوە:

( ـ بەم بەیانییە زووە، ئێژی لە ماڵ دەرکراوە؟

مام ساڵح کە خدر ئەفەنی بینی واقی وڕما. دەستی لە گسك دان هەڵگرت و لێی هاتەوە پێشەوە)

لەم دەستپێکە کورتەدا و بەدایەلۆگێکی کورت خوێنەر پەلکێشی ناو ڕووداوەکان کراوە، لەهەمان کاتیشدا کارەکتەرەکانیشیان پێناساندووە و بەهۆیەوە خوێنەر هەر لە سەرەتای چیرۆکەدا ئاشنای کارەکتەرەکان دەبێت و ناوەکانیان دەزانێت. بێگومان ناونانیش بەپێی هەر کۆمەڵگەیەك جۆرێك لە پێناسەکردن لەهەناوی خۆیدا هەڵدەگرێت و دەبێتە شوناس. لەم دایەلۆگەدا ئێمە بەهۆی ناوەکانەوە لەوە دەگەین کە مام ساڵح ناوێکە لەناو کۆمەڵگەکەی ئێمەدا بۆ کەسێك بەکاردێت کە بەتەمەنەو ڕەنگە نەخوێندەواریش بێت. لەهەمان کاتیشدا خدر ئەفەنی بەهۆی بەکار هێنانی دەستەواژەی ئەفەنی دەزانین کە ئەو کارەکتەرە مامۆستایە و خاوەن ئاستێکی ڕۆشنبیرییە. بەم پێیە لە دەستپێکدا ڕاستەوخۆ گفتوگۆی ئەو دوو کەسایەتییە خوێنەر دەهێنێتە ناو چەقی ڕووداوەکانەوە و ڕێگەی نادات هیچ جۆرە لێوردبوونەوە و ڕامانێك بگرێتەبەر و ڕاستەوخۆ لەرێگەی دایەلۆگەوە کەسایەتییەك لەبەردەمیدا قسەدەکات. واتە لێرەدا کارەکتەر قورساییەکی توندی بەسەر دەستپێکدا گرتووە و ناواخنی دەستپێکی پێکهێناوە.

بەشێوەیەکی گشتیی دەستپێکەکانی ئەم سێ چیرۆکە خوێنەری دووچاری پابەندبوون بەدەق دەکات و ڕێگەخۆشکەرێکە بۆ ناساندنی ڕووداو و کارەکتەرەکان بە خوێنەر و گەیاندنی بەشێك لە زانین و زانیارییەکانی تایبەت بە دەقەکە پێی.

## پێکهاتەی تەکنیکی چیرۆکەکان:

رووداو لەم چیرۆکانەدا لەسەر تەوزیفکردنی کارەساتەکان بنیاتنراوە، واتە کارەسات ئاستی ژێرەوەی چیرۆکەکان پێکدەهێنێت و بنەمای ئەو زوڵم و زۆردارییەی کە بەسەر میللەتی کوردا هاتووە، چەقی بنیاتی دەقیان دروستکردووە و لەهەناوی خۆشیاندا کۆمەڵێك کۆدیان بۆ خوێنەر بەجێهێشتووە تا بۆ خۆی واتایەکی لێ هەڵکرێنێت، واتایەك کە زیاتر لەگەڵ مرۆڤایەتی مرۆڤ وێك دێتەوە و هەموان دەخاتە ژێر پرسیاری دادگەرییەوە. لەهەمان کاتیشدا ڕووداو لە ئاستی سەرەوەدا هاوکێشەکراوە لەگەڵ ڕووداوێکی دیکەدا بۆ ئەوەی بەهای ڕووداوەکە لە ئاستی ژێرەوەیدا دەربکەوێت و ببێتە بلاژکتۆرێك تاوان و زۆردارییەکان تۆمار بکات. لەم ڕوانگەیەوە ڕووداو لە چیرۆکی ( کەناری و حەوزەڵی دەرختەکان)دا بریتییە لە خۆپیشاندانی قوتابیانی ئامادەیی سلێمانی لەدژی زوڵم و زۆردارییەکان و چۆنییەتی بەرەنگاربوونەوەی پیاوانی بەعسە لە دژی ئەو خۆپیشاندانە، کە بەشێوەیەکی دڵڕەقانە ڕووبەڕوویان دەبنەوە و ڕاپێچی زیندانەکانیان دەکەن. یەکێك لەو قوتابیانەی کەناوی (کەنارییە) دەبێتە سومبولی بەرخۆدان و دواتر بەکاروانی شەهیدان دەگات. لێرەدا ڕووداو ڕووناکی دەخاتەسەر توێژێك لە توێژی کۆمەڵ کە ئەویش قوتابییە و خەباتی ئەوان لە تەك چین وتوێژەکانی دیکەی کۆمەڵ پیشان دەدات، بۆیە چیرۆکنووس سەرەڕای ئەوەی ئەو ڕووداوەی وەکو زنجیرەیەك لە کارەساتەکان پێوەست کردووە بە ئەنفالی گەرمیان و بالیسان و ڕووداوە جەرگبڕەکانی شاری دووزخورماتوو لەساڵی (١٩٦٣)دا، لەهەمان کاتیشدا هەوڵیداوە لە ڕێگەی خولڤاندنی بەهایەك بۆ ئازادی، قوربانیدانی توێژێك لەتەك توێژەکانی دیکەی کۆمەڵ و سێبەرەکانی ئەو مەرگەی کە بەرۆکی ئەوانیشی وەکو توێژێکی کارا گرتووە ڕوون بکاتەوە. ئەم ڕووداوە وەکو هەموو ڕووداو و کارەسات ئامێزەکانی دیکە، پێدەچێ لە کەتواردا ڕوویدا بێت و چیرۆکنووس سوودی لێ بینیبێت.

بەهەمان ڕیتم و شێوە، ڕووداو لە چیرۆکی ( ناسێتا و دەنکە هەناری عەنەب)دا تیشك خستنە سەر کارەساتێکی دیکەیە کە ئەویش بریتییە لە کیمیابارانکردنی هەڵەبجەو دەوروبەرەکەی کە یەکێك لەوانە گوندی عەنەبە کە چەقی ڕووداوەکانی لەوێوە بنیاتنراوە و تێیدا لە ڕێگەی گەڕانەوەی یادەوەری بۆ ساتەکانی پێش کیمیابارانکردنی هەڵەبجە و عەنەب، کارەکتەر هەوڵدەدات قەوارەی ئەو کارەساتەمان بۆ بگێڕێتەوە و ئاسەوارەکانی دیار بخات. ڕووداو بریتییە لەساتێکی دیاریکراو کە کارەکتەر لە مەزارگەی هەڵەبجە لەبەردەم ئەو تابلۆیانەی کە نمایشی کارەساتەکە دەکەن، خەیاڵ دەیباتەوە بۆ بەر لە سەردەمی کیمیا بارانکردنەکە کە ژیان هەرچەندە لەژێر دەسەلاتی داگیرکەردا بووە، بەلام لە ڕیتمێکی ئاسایی خۆیدا بەردەوام بووە، کارەکتەر لەرێگەی یادەوەرییەکانییەوە کە وەکو مامۆستایەکی قوتابخانە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو سەردەم و قوتابخانە دەکاتە شانۆی ڕووداوەکان و لەوێوە قەوارەی ئاسەوارەکانی ئەو کارەساتەمان کە بەسەر میللەتی کوردا هاتووە بۆ ڕوون دەکاتەوە. بۆیە تانوپۆی ڕووداوەکە سێ بەشی باس لە سەردەمی پێش کیمیابارانکردنەکە دەکات. لەوێشەوە چیرۆکنووس مەبەستییەتی باس لە بەرخۆدانی میللەت بکات کە ئەمەش لە ڕێگەی بەدەستهێنانی هۆشیاری و ڕۆشنبیرییەوە دێتەدی، چونکە گەلێکی هۆشیار و ڕۆشنبیر مەحاڵە بتوانرێت داگیربکرێت و ئەگەر لە ڕووی سەربازییەوەش دەستی بەسەرداگیرا، ئەوا لەرووی هۆشیاری و ڕۆشنبیرییەوە قفڵەکانی ئەو داگیرکردنە دەشکێنێت، بۆیە دەبینین لە ڕێگەی گێڕانەوەی ئەو چیرۆکانەی بەر لە کیمیابارانکردن، چیرۆکنووس ڕەخنە لە کۆمەڵگەی کوردی دەگرێت، کە وانە و پەند وەرناگرێت و سوود لە کەلەپوور و شارستانییەتی خۆی بۆ بنیاتنانی دوارۆژی نابینێت، هەروەها داواش لە قوتابییەکانی دەکات خۆڕاگر بن و وەکو ئەو فەلانەی کە لەژێر ئازاری قامچیدا ئامادەنەبوون واز لە کەلەپووری خۆیان بهێنن. تەوەرێکی دیکەی ڕووداوەکان تیشك خستنە سەر مافەکانی ئافرەتە و چیرۆکنووس وای دەبینێت، کە ئەگەر ئافرەت ڕۆشنبیر بێت، واتە نەوەیەکی ڕۆشنبیر پێ ڕادەگات و کۆمەڵگە ڕۆشنبیر دەبێت. چیرۆکنووس هەموو ئەمانە بەچەمکی خوێندنەوە گرێدەدا و بە تاکە ڕێگەی سەرکەوتنی داناوە.

ڕووداو لە چیرۆکی ( بورجی تەڵەتاس)دا، بریتییە لە گەیشتن بەئازادی ئەویش لە ڕێگەی ئەو ڕاپەڕینەی کە دەرگاکانی بەرووی کوردا کردەوە، واتە ڕاپەڕین ڕووداوی سەرەکیی ئەم

چیرۆکە دروست دەکات، کە لێرەدا چیرۆکنووس بە دەرگـا هێمـای بـۆ کـردووە و جۆرێـك لـە ئێستێتیکای بە ڕووداوەکە بەخشیوە. دەرگاش لێرەدا چەندین واتا و ڕاڤەی جیاوازی لەهەناوی خۆیدا هەڵگرتووە.لەلایەکەوە دەروازەیەکە بۆ پەڕینەوە لـە شـوێنکاتێکەوە بـۆ شـوێنکاتێکی دیکە و لەلایـەکی دیکەشـەوە ئەگـەر هاوتـەریبی بکـەین لەگـەڵ مێـژوودا، دەرگـا بـەها و پێگەیەکی باڵای بۆ خۆی دەنەخشێنی و لەباوەڕی ئاینیشدا ئاسمان وەکـو دەرگایـەك وایـە بـۆ گەیشتن بە پلەی حەقیقەت کە خودایە و لەلایەن باوەڕدارانـەوە ئاسمـان لەکۆمەڵـە دەرگایـەك پێکهاتووەو بەهۆیەوە شێوەی چوارگۆشەی وەرگرتووە و واتا ئەو دەرگایانە لە تەنیشت یەکن و نەخشێکی جوانیان بۆ ئاسمان دروستکردووە وبەهۆی ئەو دەرگایانەش مرۆڤ لە سـەر زەمینـەوە دەپەڕێتەوە بۆ ئـەودیو دنیـای جاویـدانی. تەنانـەت لەشارسـتانێتییە دێرینەکانیشـدا دەرگـا بەپیرۆزی سەیرکراوە و هەر دەرگایەك ناوێکی دیاریکراوی بۆ خۆی وەرگرتـووە و شـارەکۆنەکان بەدەرگاکانیان ناسرابوون و هەر دەرگایەك بەپێی هەڵکەوتەی جوگرافیانەی خـۆی نـاوێکی بـۆ دیاریکراوە، لێرەدا چـیرۆکنووس ئامـاژەی بـە دەرگـە ناودارەکـانی شارسـتانییەتی میسـری فیرعەونەکان کردووە، کە یەکێکە لە دەرگەی (ئەبو نووس) و تێهەڵکێشی کردووە لەگەڵ خەم و ئازارەکانی میللەتی کورد:

(لەبەردەم دەرگایەکی ئەبونووسدا وەستا، خـانووە بـێ دەرگاکـانی گـەرمیانی گڕگرتـووی هاتەوە یاد)

لێرەدا چیرۆکنووس ڕاپەڕینی بە یەکێك لەو دەرگا پیرۆزانە سەیرکردووە، کە میللـەتێکی لە شوێنکاتێکەوە بۆ شوێنکاتێکی دیکە گواستووەتەوە، کـە ئـازادی بـۆ فەراهـەم کـردووە و جاویدانی پێ بەخشیووە.

چیرۆکنووس بایەخێکی تەواوی بەکارەکتەرەکانی داوە و قورسایی دەقی لەسـەر ئەسـتۆی ئەوان بنیاتناوە، بەتایبەتیش لە هەردوو چیرۆکی (ناسێتا و دەنکە هەناری عەنەب و کـەناری و حەوزەڵی دەرختەکان)دا، کە جیا لەوەی ناوی کارەکتەری سەرەکیی چیرۆکە لە ناونیشانیشدا سەنگی ئەو کارەکتەر بەدیار دەخات، لەهـەمان کاتیشـدا نـاواخنی چـیرۆکەکان لەسـەر هێـز وتوانای کارەکتەری سەرەکیی بنیاتنراوە و تێیدا کارەکتەری سـەرەکیی هەڵسـوڕێنەری گشـت ڕایەڵەکانی ڕووداوەکانە و لەوێوە کۆدەکانی مەبەسـت و واتاکـان بـە خوێنـەر دەگـات، واتـە کارەکتەر ڕایەڵەکانی ڕووداوەکان کۆدەکاتەوە و شوناسێك بە خـودی ڕووداوەکـە دەبەخشـێت،

بەتایبەتیش لە چیرۆکی (ناسێتا و دەنکە هەناری عەنەب)دا کە تەنیا کارەکتەری سەرەکیی لە چیرۆکەکەدا بوونێکی جەستەیی هەیە و ئەوانی دیکە بەتایبەتیش ناسێتا شەهیدبوونە، لە رێگەی یادەوەری کارەکتەری سەرەکییەوە دووبارە زیندوو دەکرێنەوە و بوونێکی جەستەییان پێ دەبەخشرێت.

شوێن لەم چیرۆکانەدا کاریگەرییان لەسەر پانتایی دەقەکەدا دروستکردووە، بەشێوەیەکی گشتیی شوێنەکان، ئەو شوێنانن کە ڕاستەوخۆ ڕووداوی کارەساتەکانیان تێیدا ڕوویداوە، بەتایبەتیش هەڵەبجە و گەرمیان و دووزخورماتوو و بالیسان و عەنەب...هتد. لەگەڵ ئەمەشدا چیرۆکنووس هەوڵیداوە ڕووداوەکانی دیکەش پێوەست بەم شوێنانە بکات، کە ئەمەش لە یەك خاڵدا کۆدەبێتەوە ئەویش بکەری ئەنجامدانی تاوانەکانە، واتە بکەری ئەو تاوانانەی، کە لە رووداوی ناو ئامادەیی سلێمانی و ڕووداوەکانی دووزخورماتوو و کارەساتی گوندی عەنەبدا ڕوویانداوە، هەمان بکەرە کە تاوانەکانی کیمیابارانکردنی هەڵەبجە و بالیسان و ئەنفالکردنی گەرمیانی ئەنجامداوە، بۆیە هەمیشە چیرۆکنووس هەوڵیداوە ئەو شوێنانە پێوەست بکات بە شوێنی ڕووداوەکانی نێو چیرۆکەکەیەوە و لەوێوە وێنای گەورەیی تاوانەکان لە پانتایی شوێنێکی گەورەتردا بەدیار بخات کە ئەویش کوردستانە و لە چیرۆکی ( بورجی تەڵەتاس)دا زیاتر ئەو شوێنە لەو پانتاییە گەورەیەدا چڕکراوەتەوە و باس لە ڕاپەڕین کراوە کە سەرتاسەری کوردستان لەدژی ئەو دەسەڵاتەدا دیکتاتۆرییەتە دەگرێتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا چیرۆکنووس لە چیرۆکی ( ناسێتا و دەنکە هەناری عەنەب)دا، سنووری کوردستان دەبەزێنێت و ڕووەوە شوێنێکی دیکە هەنگاو دەنێت کە شوێنێکە لە ڕووی ئەنجامدانی تاوانەوە لەگەڵ کوردستاندا نێزیکە و هاوشێوەیە، ئەویش شاری هیرۆشیمای ژاپۆنییە کە بەهەمان شێوەی کوردستان چەکی قەدەخەکراوی ئەتۆمی لە دژی بەکارهات. لێرەشدا چیرۆکنووس هەوڵیداوە هەردوو شوێنی هەڵەبجە و هیرۆشیما پێکەوە گرێ بدات و بەدەستە خۆشکی یەکدیی دایان بنێت، لەم پێناوەشدا دەستەواژەی (حەلەبشیما)ی بەکارهێناوە، کە بەڕای ئێمە دەبوایە ئەم دەستەواژەیە (هەلەبشیما) بوایە، چونکە عارەبەکان بە هەڵەبجە دەڵێن (حلبجە)، واتە دروستکردنی ئەم دەستەواژەیە لەژێر کاریگەریی گوتاری عارەبەکاندا دروستکراوە و دەبوایە ناوەکە وەکو خۆی بە کوردی بەکارهاتبووایە. بە شێوەیەکی گشتیی شوێن لەم چیرۆکانەدا کەتوارین و بەم پێیەش کەتوارگەرێتی شوێن کاریگەریی لەسەر کەتواریی ڕووداوەکانیش داناوە، هەرچەندە شوێنی

کەتواری زیاتر لەم چیرۆکانەدا بەرجەستەکراوە، بەڵام شوێنی خەیاڵیش پەنای بۆ بردراوە، ئەمەش لە چیرۆکی (کەناری و حەوزەڵی دەرختەکان)دا هاتووە کاتێك کەناری شەهید دەبێت دەگاتە ئەو شوێنەی کە دەرختەکان تێیدا گەشە دەکەن کە بەڕای ئێمە بەهەشتە، بەڵام چیرۆکنووس لە چوارچێوەی شوێنێکی خەیاڵیدا هێشتوویەتییەوە و ڕاستەوخۆ ناوی نەبردووە.

کات پێوەستە بەخودی ڕووداوی کارەساتەکانەوە، چونکە خودی ئەو ڕووداوانە لە کات و ساتێکی دیاریکراو ڕوویانداوە کە دەگەڕێنەوە بۆ پێش ڕاپەڕین و سەردەمی دەسەڵاتی داگیرکاری، بۆیە لە چیرۆکەکاندا کات دیاریکراوە کە بەشێك لەکاتی گشتیی ڕووداوی کارەساتەکان دەگرێتەوە، لە چیرۆکی ( بورجی تەڵەتاس)دا کات لە زەمەنی کارەساتەکانەوە هەنگاو دەنێت و دەگاتە کاتی ڕاپەڕین، واتە کاتەکە لە سەردەمی دەسەڵاتی تاوانکارییەوە درێژ دەبێتەوە تا دەگاتە ساتی ڕاپەڕین کە کۆتایی بەو تراژیدیایە دەهێنێت و تاکی کورد بەهای ئازادی وەردەگرێت. دیاریکردنی کاتی نووسینی دەقەکانیش لەلایەن چیرۆکنووسەوە کاریگەرییەکی لەڕادەبەدەری هەبووە لەسەر تێگەیشتن لە مەغزای کاتدا. کاتی نووسینی دەقی چیرۆکی (کەناری و حەوزەڵی دەرختەکان)دا ئابی ساڵی (١٩٨٩) یە، کە دیارە ئەو کاتە هێشتا تراژیدیایەکان بەردەوامبوونە و ساتێکە هێشتا سێبەری مەرگ باڵی بەسەر تاکی کوردا کێشاوە، کاتی نووسینی دەقی ( ناسێتا و دەنکە هەناری عەنەب)دا، ئاداری ساڵی (١٩٩٤) و کاتی نووسینی دەقی چیرۆکی (بورجی تەڵەتاس)یش حوزەیرانی ساڵی (١٩٩٣) یە، کەواتە ئەم دوو چیرۆکەی دواییان لەدوای ڕاپەڕینەوە نووسراون. لێرەشدا ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە، کە هەرچەندە چیرۆکەکان باس لەو کارەساتانە دەکەن کە لەساڵانی هەشتاکاندا بەسەر کوردا هاتووە، بەڵام نووسینی ئەم چیرۆکانە بۆ ساڵانی دوای ڕاپەڕین دەگەڕێنەوە، کە دیارە ئەمەش بەڕای ئێمە لەو ڕوانگەیەوە دێت کە چیرۆکنووس هەوڵدەدات هەمیشە ئەو کارەساتانە لە یادەوەری تاکی کوردا بمێنێتەوە و جۆرێك لە جاویدانی وەربگرێت و لەهەمان کاتیشدا وردەکاری ئەو تاوانانە بە نەوەی نوێ بگەیەنێت و بیانگاتە پەند و وانەیەك لە ژیانیاندا، بەڵگەشمان بۆ ئەمە ئەوەیە کە لەدوای پانزە ساڵدا لە نووسینی ئەم دەقانە، کەچی ئێستە لەو سەردەمەدا دەقەکان ڕووناکیان بینیوە، کە ئەمەش لەسەر ئەوە کاریگەریی هەیە کە ئەگەر لەسات و کاتی خۆی بڵاوبکرابان باشتر دەبوو، بەتایبەتیش لەدوای ڕاپەڕینەوە هێشتا ئەو هزرە نەتەوەییە بەشێوەی ئێستەی کاڵ نەببوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەڕای ئێمە بڵاوکردنەوەی ئەم

دەقانە لە ئێستە زیاتر بۆ ئەوە دەبێت، کە کارەساتەکان لە هۆشمەندی تاکی کوردا بمێنێتـەوە و بەردەوامی بە ژیانیان بدات.

ئەوەی تێبینی دەکرێت لەم چیرۆکانەدا ئەوەیـە کـە دایـەلۆگ وەکـو تـەکنیکێك تـانوپۆی ڕووداوکانی پێکهێناوە و دیارە کاتێك چیرۆکنووس لە ڕێگەی تەکنیکـەکانی دیکـەوە توانـای گەیاندنی زانیارییەکانی نابێت، ئەوا دایەلۆگ وەکو تەکنیکێك خۆی سەپاندووە بۆ گواستنەوەی زانیارییەکانەوە. لە ڕێگەی ئەو دایەلۆگانەوەش ئێمە ڕەهەندەکانی کۆمەڵایـەتیی و سیاسـی و دەروونی کارەکتەرەکانمان بۆ ڕوون دەبێتەوە و ئاشنای چۆنییەتی بیرکردنـەوە و هەڵسـوکەوتیان دەبین، بەتایبەتیش کە دایەلۆگ هەمیشە لە جووڵەدایە و چەسپاو نییـە و لـە پانتـایی دەقـدا بەهۆی گوزارشتکردنی ڕاستەوخۆ لە کارەکتەرەکانـەوە خوێنـەر دووچـاری بێزاربـوون ناکـات، چونکە (گونجاوترین ڕێگەیە بۆ گەیاندنی وەسفی و شیکاری و هەواڵ بۆ دیمەن)[٧] کە پـەرە بـە ڕووداوەکان دەدات و دەیانگەیەنێتە لوتکەی ئامانجەوە، لە زۆرینەی دۆخەکانیشدا چیرۆکنووس بۆ بەکارهێنانی دایەلۆگدا نیشانەی (ـــ) بەکارهێناوە، ئەگەرچی لـە هەنـدێك باریشـدا نـاوی کارەکتەری دایەلۆگەکە دیار نییە، بەڵام لەگەلێك جاراندا ناوی کارەکتەری دایـەلۆگ دیـارە و ئاماژەی بۆ کراوە.

ئەگەر لەرووی ژمارەی وشەکانەوە ئامـارێکی ئـەو چـیرۆکانە بکـەین، ئـەوا دەبیـنین کـە چیرۆکی (کەناری و حەوزەڵی دەرختەکان) لە (٨٤٦) وشە پێکهاتووە، کـە (٨١) وشـە بـۆ دایەلۆگ بەکاربراوەو، و چـیرۆکی ( ناسـێتا و دەنکـە هـەناری عەنـەب) لـە (١٥٠٢) وشـە پێکهاتووە، کە (٤٩٢) وشەی بـۆ دایـەلۆگ بـەکاربراوەو چـیرۆکی ( بـورجی تەڵـەتاس) لـە (٢٤٧)وشە پێکهاتووە، کە (٢٨) وشەی بۆ دایەلۆگ بەکاربراوە.

هەروەها تەکینکی فلاشباکیش وەکو تەکنیکێکی هونەری ئاوڕی لێدراوەتەوە و تـانوپۆی ڕووداوەکانی لەئەستۆ گرتووە، بەتایبەتیش لە چیرۆکی ( ناسێتا و دەنکە هەناری عەنـەب)دا، کەتەواوی ڕووداوەکە لە ڕێگەی گەڕانەوەی یادەوەری کارەکتـەری سـەرەکییەوە ئەنجامـدەدرێت کاتێك بەدیار تابلۆکانی مەزارگەی شەهیدانی هەڵەبجەوە، لە ڕێگەی تەکنیکی فلاشباکەوە بـۆ سەردەمی پێش کیمیابارانکردن دەگەڕێتەوە و ئیـدی سـەرتاپای ڕووداوی چـیرۆك لـەناو ئـەو تەکنیکەدا تانوپۆ کراوە کە بەتەواوەتی قورسایی دەقی لەسـەرە و جۆرێـك لـە نوستالیژیاشـی دروستکردووە و کە کارەکتەر ئارەزوومەندی گەڕانەوەی ئەو ڕۆژگارانەی کردووە، کە هەرچەندە

لەژێر دەسەڵاتی داگیرکاریشدا بوونە، بەڵام بەهۆی ئەوەی کە تەواوی ئـەو ژیانـەش وێرانبـووە وکارەکتەرەکان لەژیاندا نەماون، بۆیە حەز بە گەڕانـەوەیان دەکـات، کـە ئەمـەش لەڕێگـەی فلاشباکەوە دەبێت کە دووبارە بەهۆی گێڕانەوەی ڕابـردووەوە زینـدوویان دەکاتـەوە. هـەروەها لەچیرۆکی (کەناری و حەوزەڵی دەرختەکان)دا، بۆ گێڕانەوەی ڕووداوەکـانی سـاڵی (١٩٦٣) ی شارۆکەی خورماتوو، چیرۆکنووس پەنای بۆ ئەو تەکنیکە بردووە و بەکاریهێناوە.

## سەرچاوەکان


١ـ سابیر ڕەشید، چیرۆکی کـوردی ـ ڕەخنـە و لێکۆڵینـەوە، چـاپخانەی ڕۆشـنبیری، هـەولێر ٢٠٠٥.

٢ـ ئارام سدیق، ناونیشان لە چیرۆکی کوردیدا، چاپخانەی کارۆ، سلێمانی ٢٠٠٩.

٣ـ کارزان موحسین قادر، سیما تازەکانی ڕۆمانی کوردی لەناوان سـاڵانی (١٩٩١ــ ٢٠٠٠) نامەی ماستەر، کۆلێژی زمان ـ زانکۆی سەلاحەدین، ٢٠٠٩.

٤ـ د. نەجم خالید نەجمەدین، تەکنیکی دایەلۆگ لەهەندێ نموونەی هاوچەرخی کورتە چـیرۆکی کوردیدا، گۆڤاری(زانکۆ)، ژمارە(٢٤)، نیسانی ٢٠٠٥.

٥ــ ڕۆلان بـارت، مـدخل الی التحلیـل البنیـوي للقصـص، ت: د. منـذز عیاشـی، الظبعـة الثانیة،مرکز الآنماء الحضاری ـ سوریة ٢٠٠٢.

## حوکمگێڕانی وێنەکان
## لە چیرۆکی(نەفرینی نەوەکان)ی محەمەد ڕەشید فەتاح دا

وێنە ئەو هێزی سیحرەیە کە لە ئەزەلەوە مرۆڤی کەمەندکێشی خۆی کردووە و هەردەم مرۆڤ پێیەوە سەرسام بووە. لەو کاتەوەی کە مرۆڤ وەکو بوونەوەرێکی خودان ئاوەز ڕووی زەوی تەنیوەتەوە، وێنەکان جێگەی سەرنجی بووە، بۆیە کاتێک سەیری ئاسمان و ڕۆژ و مانگ و دیاردەکانی دیکەی سروشتی کردووە، ئەوەندە پێی سەرسام بووە تا گەیشتۆتە ڕادەی ترس، ترسێك کە ڕەنگە مرۆڤ لەناو ببات، ئەمەش بەس بووە بۆ ئەوەی بیر لە پەرستنیان بکاتەوە بە وێنەی بالآی خۆی مەزەندەی بکات. تەنانەت ئەو کاروکردەوەیەشی کە ڕۆژانە بە مەبەستی دابینکردنی پێداویستییە خۆراکییەکانی خۆی ئەنجامی داوە لە قۆناخێك لە قۆناخەکانی ژیانی، دووبارە لە سەر دیواری ئەشکەوتەکاندا وێنەی دەکێشایەوە، ئەم وێنانە ئێستە خاوەنی مێژوویەکی دێرینی مرۆڤایەتین و چیرۆکێکی لەمێژینەی بوونەوەرێك کەناوی مرۆڤە لەسەر زەوی دەگێڕنەوە. سەرەڕای ئەمانەش مرۆڤ هەر لەو سەردەمانەدا و دوای گۆکردنی پیت و وشەو ڕستەکانەوە دەستی کردووە بەگێڕانەوەی ئەو ڕووداوانەی، کە ڕۆژانە بەسەری هاتوونە، لەمەشدا تەنیا و تەنیا پشتی بە وێنە بەستووە کە بە هۆیەوە تانوپۆی ڕووداوەکانی پێ بکات و بەڕێوەیان ببات. دیارە مرۆڤ کاتێك کەوتووەتە ژێر کاریگەریی ئەم وێنانەوە بەهۆی ئەوە بووە کە چاوەکانی وەکو دوو ئامێری کامێرا توانای وێنەگرتن و گەیاندنی ئەو وێنانەیان هەبووە بۆ مێشك تا لەوێوەوە لێکدانەوە و شیکردنەوەیان بۆ بکرێت، بەمەش کاریگەریی ئەم وێنانە بەدیار کەوتووە. ئەگەر نا گیانلەبەرەکانی دیکەش چاوەکانیان توانای بینینی ئەو وێنانەیان هەبووە، بەڵام چونکە خاوەنی ئامێرێکی شیکردنەوەی ئەو وێنانە نین کە ئەقڵە، بۆیە دەرك بە

وێنەكانی مرۆڤ ناكەن و كاریگەریی لەسەریان نییە، تەنیا مرۆڤـە وەكـو بوونـەوەرێك توانـای شیكردنەوەی وێنەكانی هەیەو دواتریش بەهۆی ئەو لێكدانـەوەو شـیكردنەوانە دەكەوێتـە ژێـر كاریگەرییان.

لەگەڵ ئەمەشدا كە مرۆڤ كاریگەر بووە بە وێنە و هـەوڵی شـیكردنەوەو و لێكدانـەوەیانی داوە، بەڵام لەهەمان كاتیشدا بەوە نەوەستاوە، كە خۆی تەنیا وەرگری وێنەكان بێت و تـەنیا و تەنیا وێنەكان بگرێت و بەس، بگرە لە یەكەم كاردانـەوەی لەهەمبـەر سـیحری ئـەم وێنانـەدا هـەوڵی داوە خۆشـی وەكـو كارگەیـەك وێنـە بەرهـەم بێنێـت، بۆیـە لەسـەرەتادا بـەهۆی لاساییكردنەوە وێنەكانی لەسەر دیواری ئەشكەوتەكاندا كێشـاوە و هـەوڵی داوە خـودی خـۆی ببێتە خاوەنی وێنە، دواتر بەهۆی پەیكەرتاشییەوە لە بـەرد و قـوڕدا پەیكـەری ئـەو شـتانەی دروستكردووە، كە وەكو وێنەیەك لە مێشكیدا چەسپاوە، لە پێشكەوتنێكی دیكەشدا بـەهۆی فڵچەو ڕەنگەوە لەسەر كاغەز و قـوڕدا وێنـەكانی كێشـاوە، دواتـر بـەهۆی ئـەو پێشـكەوتنە پیشەسازی و تەكنەلۆژیایەوە، بە ئامێری كامیراوە توانیویەتی دەیان و سەدان جـۆر و دیمـەنی وێنە بێنێتەكایەوە. ئەم سەرەتایەم بۆ ئەوە بوو، تا بەهۆیەوە لـە گرینگـی و بایـەخی پێگـەی وێنە لە ژیانی مرۆڤدا ڕوون بكەمەوە و ڕێگە خۆش بێت تا بەهۆیەوە ئاماژە بـە چـیرۆكێكی (**محەمەد ڕەشید فەتاح**) بكەین كە بەناوی ( نەفرینی نەوەكان)ە، ئەو چیرۆكە لەسەر كاریگەریی وێنە بونیادنراوە، ئەو وێنانەی ئەمرۆ لەلایەك ژیانی مرۆڤ بەڕێوە دەبەن و لەلایەكی دیكەشەوە بە بەكارهێنانێكی خراپ نەوەیەك دژی دەوستننەوە. مەبەست و واتای ئەم چیرۆكە لەوەدایە، كە دەیەوێ پێمان بڵێت ئەمڕۆ وێنەكان ڕووی ڕاستەقینەی خۆیان نین و تەواو پێچەوانەن و هـەردەم لەلایەن زۆردار و دیكتاتۆرەكانەوە وێنەكان تەڵخ كراون و شێوێندراون. وێنەیـەك دروسـتكراوە كە ساختەیە و ڕەنگدانەوەی ناخی مرۆڤەكان و كـەتواری كۆمـەڵگەیەكـە نییـە، وێنەیـەك بـۆ شكۆمەندكردنی ڕابەر و سەركردەكان دروستكراوە، كە وێنەیەكە جوانی و ئێستێتیكای تێدا لە خاڵی سفرە، بۆیە ئەو وێنانەی ئێستە وێنەیەكی ڕەشبینن و هیچ هیوا و ئاواتێكیان بۆ نـەوەی نوێ پێ نییە. وێنەكان لە خاڵێكەوە بونیاد نراون، كە دەبێ هەموو تاكـەكان ملكەچـی بـن و بەهیچ شێوەیەك پابەندی وێنەی دیكە نەبن. بە وتەیەكی دیكە ئەو مرۆڤەی، كە لە سـەرەتادا هەوڵی دا خۆی ببێتە كارگەی بەرهەمهێنانی وێنەكان، كە وێنـەی جیـاوازی تێـدا خـوڵقێنرا، بـەڵام ئێسـتە تاكـە وێنەیـەك، وێنەیـەكی سـەرتاپاگیرە، كـە تـەواوی وێنـەكانی دیكـە

هەڵدەوشێنێتەوە. وێنەیەك تەنیا وێنەی مرۆڤێکە و هیچی دیکە نا، دەبێ هەموو مرۆڤەکانی دیکە ملکەچی ئەو وێنەیە بن و بە هیچ شێوەیەك هەوڵی چێکردنی وێنەکانی خۆیان نەدەن.. ئەم نەریتە لە ناخی مرۆڤی ڕۆژهەڵاتی و لە بونیادی پێکهاتەی کۆنەستی کۆمەڵگەی ڕۆژهەڵاتی ڕەگاژۆ بووە و هەمیشە پێکهاتە و سیستەمی دامودەزگەکانی ڕۆژهەڵات ڕەنگدانەوەی مێژووی ئەو وێنەیەیە. بۆیە ئێستە ئەو وێنەیە کەوتووەتە بەر نەفرینی نەوەکان، ئەم نەوە نوێیانەی توانای وێنەکێشانیان پەیداکردووەتەوە، بە واتایەکی دیکە نەوەیەك دژ بە بڕیاری داخستنی کارگەی بەرهەم هێنانی وێنە وەستاوەتەوە و دووبارە وێنەکان بەرهەم دەهێننەوە. واتە ناونیشانی چیرۆکەکە ڕێك ڕاڤەکردن و شیکردنەوەی ئەو هەوڵەی نەوەی نوێیە، کە بریتییە لە ڕەتکردنەوەی وێنە کۆن و باڵایەکە، ئەو وێنەیەی کە لە ماڵوێرانی و کارەسات هیچی دیکەی بۆ کۆمەڵگەی ڕۆژهەڵاتی پێ نییە. ئەمەش ڕاستەوخۆ دەمانگەیەنێتە سەر دەستپێکی چیرۆکەکە، کە دیارە ئەو دەستپێکە بە گوتاری نووسەر دەستی پێنەکردووە، بگرە چیرۆکنووس بۆ دەستپێك پەنای بۆ وتەیەك بردووە، کە دەتوانین بڵێین ئەو وتەیە لیدی تەواوی چیرۆکەکەیە، واتە کورتە و واتای چیرۆکەکەی لە ئەستۆ گرتووە (کەسێك دەتوانێت گەشبین بێت، کە گەمژە و بێ هەست و نەست، یان ملیۆنێر بێت) مرۆڤی گەمژە و بێ هەست و نەست، توانای بەرهەم هێنانی وێنەی نییە. ئەو مرۆڤە تەنیا خاوەنی یەك وێنەیە و دەیپەرستێ و ناتوانێ بۆ خۆی دوور لەو تاکە وێنەیە بیربکاتەوە و وێنەیەك چێ بکات. بەمەش لە کاریگەرییەکانی وێنەکان بەدوورە و لە ئێش و ئازار و ژانی بیرکردنەوە دوورە، چونکە هەست و نەستەکانی لەژێر یەك وێنەدا قەتیس ماوە، کە ئەو وێنەیەش، وێنەیەکی پیرۆز و چەسپاو و نەگۆڕە. بۆیە ئەم جۆرە کەسانە خۆشبەختن و پەی بە تاریکی و تارماییەکان نابەن. هەمیشە بەختەوەرن و گەشبینن. کەسانی ملیۆنێریش بەهۆی ئەو سەرمایەی کە پێکەوەیان ناوە و بۆ پاراستنی موڵك و ماڵ و بەرژەوەندییەکانی خۆیان پابەندی ئەو تاکە وێنەیە دەبن، هەمیشە هەوڵ دەدەن پێگە و باڵایی ئەو تاکە وێنەیە بپارێزن، چونکە بوونی ملیۆنێری خۆیان بەستراوەتەوە بە بوونی ئەو وێنە پیرۆزەوە، بۆیە بەهەموو شێوەیەك پابەندی ئەو وێنەیەن. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە سەرەڕای بوونی دەسەڵاتێکی فەراهەمی مادی، بەڵام بازرگان و ملیۆنێرەکان هەوڵی دروستکردنی وێنەی جیاواز نادەن، بۆیە ئەوانیش بەختەوەرن و گەشبینن. تەنیا کۆی مرۆڤە، کە میللەتەکان دروست دەکەن و ئەوان لە ژان و

سۆی بیرکردنەوەدا دەژیــن، بــۆ ئــەوەی بتــوانن لــەناو ئــەو تاریــك و ڕەشــبینییەدا، کارگــەی بەرهەمهێنانی وێنەکان بەگەڕ بخەنەوە. ئەم ئەرکەیان لە دوو لاوەیە، لەلایەکەوە هــەوڵی ئــەوە دەدەن لەدەست تاك وێنەیی ڕزگاریان بێت، لەلایەکی دیکەشــەوە هــەوڵی ئــەوە دەدەن وێنــەی ڕاستەقینەی خاوەنی تاك وێنەییەکان ئاشکرا بکەن. بێگومــان ئاشــکراکردنی ئــەم وێنانــەش، خاوەنەکانیان دووچاری شۆك دەکات، ئێمە لە عێراقدا ئــەزموونێکی تاڵمــان بــە دەســت ئــەو وێنانەوە هەیە، سەدام یەکێك بوو لەوانەی زۆر بە زیرەکی سوودی لــە هەڵواســینی وێنــەکانی بینیبوو و تەواوی عێراقی بە وێنەی خۆی داپۆشیبوو، تەنانــەت وێنــەکانی ئــەو پاسەوانیشــی هەبوو، هەر کەسێك وێنەی ئەوی شێواندبووایە، سزایەکەی لە سێدارەدان بوو، ئەم وێنانــە کــە هەمیشە لە حاڵەتی گەشبینیدا گیرابوون و لەبەردەم میللەتدا دانرابوون، وێنــەی ڕاســتەقینەی ئەو نەبوون، وێنەی ڕاستەقینەی ئەو لە هەڵەبجە و ئەنفال و...هتد، بەدیار کــەوت. کــاتێکیش مرۆڤەکان لە دوای بیرکردنەوە و لێکدانەوە و ڕاڤەکردنەوە، هەلی ئەوەیان بۆ ڕەخســا کارگــەی بەرهەمهێنانی وێنەکانیان بەگەڕ بخاتەوە، هەر زوو ڕاپەڕین و کۆتاییان بەو دەســەڵاتە هێنــا. چیرۆکنووس زیرەکانە لە ڕێگەی خولقاندنی کارەکتەرێکەوە، کە هەمیشە هەوڵی ئــەوە دەدات وێنەکانی خۆی بە دیــوارەوە هەڵبواســێت، ڕەخنەیــەکی تونــد ئاراســتەی کۆمەڵگــە و ئــەقڵی کۆمەڵگەی ڕۆژهەڵاتی دەکات، لە هەمانکاتیشدا هەر لە ڕێگەی کارەکتەرەکانەوە وێنەی ئــەو ڕەق و کینەیەمان بۆ دەنەخشێنێت، کە چین و توێژەکانی کۆمەڵگە دەریدەبڕن لە دژی ئەو کــار و کردەوانەی، کە هەمیشە لە سەرووی یاسا و ڕێساکانەوەن و هەمیشە مرۆڤەکان خــەبات بــۆ ئەوە دەکەن وێنەی ڕاستەقینەکان بدۆزنەوە و بیانخەنە ڕوو، ئەمەش زیاتر خۆی لــە بیروبــاوەڕی نەوەی نوێ دەبینێت، کە تەواو لەو تاکە وێنەیە دەربازبووە، ئەمــەش بــە هــۆی تــەکنۆلۆژیای سەردەمەوە، کە خۆی لە ئینتەرنێت و سەتەلایت و مۆبایلەوە بــەرپابووە و بــوارێکی فرەوانــی خولقاندووە بۆ بەگەڕخستنەوەی کارگەی بەرهەمهێنانی وێنــە جیاوازەکــان. چــیرۆکنووس لــەم چیرۆکەیدا لە چەندین ئاماژەوە ئەوەی ڕوونکردووەتەوە، کە ئیتر ئــەم وێنانــە، وێنــەی تــەڵخ و خوێناوین و تەواوی کۆمەڵگە لێیان دەترسێت، یەکەم هەوڵێك بۆ لێکردنەوەیان دەبێت نەفرەت بکرێن و وێنە ڕاستەقینەکەیان ئاشکرا بکرێن.

# پەرتبوونی خود
## لە چیرۆکی (نەگوتراوەکانی بەزمەسات)ی حوسێن شێربەگی دا

رەهەندەکانی خود پاڵنەرێکی سەرەکین بۆ سەرجەم هەڵسوکەوتەکانی مرۆڤ، بێگومان ئەوە خودە کە هەمیشە خەونەکانی مرۆڤی لە باوەش گرتووە و لەوێوە هەوڵ دەدات ئارامییەك و فەرەحنایيەك بە سەرمەدییەکانی ژیانی خۆی ببەخشێت، لێ ئەو خودە بۆ فەراهەمکردنی ئارەزووەکانی گەلێك لەمپەر و کۆسپی لەسەر رێگە دەوەستێت و هەرگیز ئەوەی ئەو لە ژیاندا حەزی لێ دەکات هەمووی بەدی نایەت، ئەستەمە خودێك بدۆزیتەوە گشت ئاواتەکانی لە چوارچێوەی کار و چالاکی و بزاڤە نەپچڕاوەکانی خۆیدا بەدی هاتبێت. ڕەنگە ئەمەش بگەڕێتەوە بۆ ئەو هۆکارە ئەزلییەی، کە دەبێ مرۆڤ کەمێك لە ئارەزوو و حەزەکانی لەگەڵ خۆیدا و لە گەشتەکەی بەرەو ناخی زەویدا ببات و لەژێر گڵدا بیشارێتەوە و لەبەر چاوانی ون بکات. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو لەمپەر و کۆسپانە لەهەموو کات و سەردەمێك و شوێنێکدا لەیەك ئاستی بەهێزیدا نییە و نەبووە، بگرە ئەو پرسە زیاتر کەوتووەتە ژێر گوشارەکانی هزر و مەعریفە و شارستانییەوە، لەم ڕووەوەش هاوکێشەیەکی چێ کردووە، کە تا چەند پلەی شارستانیی سەرووتر بێت، ئەوا لەمپەر و کۆسپەکان ڕەنگ کاڵتر دێنە پێش چاو، تاچەندیش پلەی شارستانیی ڕوو لە خوارەوە بێت، لەمپەرەکانی بەردەم ئارەزووەکانی خود تۆکمەتر و بەهێزتر خۆیان نیشان دەدەن. بەپێی پلەکانی ئەم هاوکێشەیەش لەمپەرەکان بە پێوەری بەهێزی و لاوازییان، کاریگەرییان لەسەر خود و دەربڕینی خود دەبێتەوە. بۆیە لە کۆمەڵگەیەکی ئاست بەرزی شارستانیی شتێك نییە ڕێگری بێت لە دەربڕینی ئارەزوووەکانی خود و گەیاندنی فۆرمەڵەکانی بوونی ئەو خودە، لێ لەو کۆمەڵگەیەنەی، کە هەمیشە کۆتوبەند لەسەر خود دانراوە، ئەوا خود کۆمەڵێك وتەی خۆی هەیە، کە ناتوانێت بیاندرکێنێت، لێرەشدا کێشەی نەگوتراوەکان سەرهەڵدات. نەگوتراوەکانی خود کە دواجار خود لە پەرتبوونێك دابەش دەکات،

کە هەرگیز توانای خۆ گردبوونەوەی نەبێت و نەتوانێت پارچەکانی لەیەك بۆتـەدا کۆبکاتـەوە. نەگوتراوەکان ئەو هێڵە ڕاستانەن، کە دەبێ مرۆڤ لە کۆمەڵگەدا بێ ئاوڕدانەوە و پرسیارکردن و سەرسوڕمان و گومان و...هتد، لەسـەری بـڕوات و هەمیشـە دەروێشـێکی خووگرتـووی ئـەو تاپۆیانە بێت، کە لەسەر ژیانی دانراوە. ئەو تاپۆیانە، کە نەگوتراوەکانیان لـەخۆگرتووە زیـاتر بریتیین لە سیاسەت و سێکس و ئاین. ئەم سێیانە هەمیشە لەسەر سـنگی خـود لەنگـەرییان گرتووە و لێ ناگەڕێن ئەوەی ئەو حەزی لێ دەکات، دەری ببڕێت. ئەو سێیانە وەکو فلتـەرێکن بەسەر خوددەوە و لەوێوە گشت هاتوو و دەرچووەکانی خود دەپشکنرێت و ڕێگەی لێ دەگیرێت. لێرەدا (حوسێن شێربەگی)ی چیرۆکنووس لە چیرۆکەکەیدا (بەزمەسات)، کە لـە ژمـارە (٩٤) گۆڤاری ئایندەدا بڵاوکراوەتەوە، ئاماژە بە یەکێك لـە نـەگوتراوەکان دەکـات لـە کۆمەڵگـەی ڕۆژهەڵاتیدا، ئـەویش سێکسـە و کاریگـەریی ئـەو بـزاڤ و غـەریزە مرۆییـە لەسـەر خـود و دەربڕینەکانیدا. بێگومان ئەو سێ لایەنەی قەدەخەکراوەکانی نێو کۆمەڵگە و بەتایبەتیش لـە کۆمەڵگەکانی ڕۆژهەڵاتدا، هۆکارێکە کاریگەرە لەسەر پەرتبوونی خودی مرۆڤـەکان، چـونکە هەمیشە ئەو سێ لایەنەی سیاسەت و ئاین و سێکس سێکوچـکەی چـالاکییە ڕۆژانەییـەکانی مرۆڤ پێکدەهێنن و بەربەست و کۆت و زنجیرکردنیان، وەستاندنی جووڵە ڕۆحییـەکانی مرۆڤـە، بەمـەش خـود وەکـو ئاراسـتەکەرێکی ڕاسـتەقینەی نـاوەوەی مـرۆڤ دووچـاری پـەرتبوون و پەراوێزبوون دەبێتەوە و ناتوانێت درێژە بـە چـالاکییەکانی خـۆی بـدات و وەکـو بوونـەوەرێك مرۆڤایەتی خۆی مومارەسە بکات.

لە ڕاستیشدا باسکردنی نەگوتراوەکان لە چیرۆکی کوردیدا مێژوویـەکی زۆر دوور و درێـژی نییە، چونکە چیرۆکی کـوردی لـە سـەرەتای سـەرهەڵدانییەوە زیـاتر بایـەخی بـە نـاوەرۆکی کۆمەڵایەتیی و دابونەریتە دواکەوتووەکان داوە، بە نموونە ململانێی چینایەتی نێـوان ئاغـا و دەرەبـەگ لەگـەڵ جووتیـار و هـەژاران، هـەروەها مافـەکانی ئـافرەت و دەرد و بـەڵا کۆمەڵایەتییەکانی دیکە. ئەم ڕەوشە لـە ڕووی ناوەرۆکـەوە تـا سـەرەتای سـاڵانی حـەفتاکان بەردەوام بوو، دواتر چیرۆکی کوردی لە ڕووی نـاوەڕۆك و ڕووخسـارەوە گۆڕانگـاریی بەخۆیـەوە بینی و لەوێوە ئیدی نەگوتراوەکانیش لەلایەن چیرۆکنووسانی کورد ئاوڕی لێدرایەوە و تیشکیان خستەسەر. هەرچەندە ئەم سێ لایەنە سیاسەت و ئاین و سێکس، وەکو سـێ لایـەنی گرینگـی نەگوتراوەکان، لە چیرۆکی کوردیدا بە یەك ئاست باسیان لێوە نەکراوە، بگرە پرسـی سیاسـەت

هەر زوو لە چیرۆکی کوردیدا ڕەنگدانەوەی هەبووە، وەکو لە یەکەمین چیرۆکی کوردیدا (لەخەوما)ی جەمیل سائیبدا، ژانرێکی نوێی ئەدەبی کوردی کە چیرۆکەکە بە سیاسەت دەست پێ دەکات، دیارە ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە کوردستان داگیرکراوە و خاوەن قەوارەیەکی سیاسی نییە، هەروەها دەربڕی پێگەیشتنی ئەقڵی سیاسیشە لەلای کورد، بەڵام دوو لایەنەکەی دیکە ئاین و سێکس بەم شێوەیە لە چیرۆکی کوردیدا لای لێ نەکراوەتەوە، کە سیاسەت پشکی بەرکەوتووە. ئەمەش بۆ هۆکاری کۆمەڵایەتیی و داخراوی کۆمەڵگەی کوردی دەگەڕێتەوە، بەتایبەتیش کە مەسەلەی ئاین، مەسەلەیەکی هەستیارەو تاکی کورد لەبەرانبەر باسکردنی ئەو مەسەلانەدا مەزندەی قبوول کردنی نییە، بەهەمان شێوەش سێکس پابەندە بە لایەنی ئاینی و کۆمەڵایەتی و تا سەردەمانێکی زووش بەهیچ شێوەیەك بواری باسکردنی لە ئەدەبی کوردیدا لە بارێکی ئاساییدا نەبووە، بگرە جێگەی مەترسیش بووە. لەگەڵ ئەوەشدا چیرۆکی کوردی لەگەڵ خۆ نوێکردنەوەیدا بایەخێکی زۆری بەم لایەنانە داوە و ئاوڕی لە نەگوتراوەکانی نێو کۆمەڵگە داوەتەوە، بەتایبەتیش لە دوای ڕاپەڕینەوە، چیرۆکی کوردی دەروازەیەکی والای لەبەردەمدا کرایەوە و گۆڕانکارییی لە رووی ڕوخسار و ناوەرۆکەوە چیرۆکی کوردی گرتەوە، تێبینی ئەوەش دەکەین، کە سێکس وەکو لایەنێکی نەگوتراوەکان پانتاییەکی زۆری لە چیرۆکی دوای ڕاپەڕین گرتووەتەوە. دەتوانین بڵێین ڕەوتێك لەبارەی سێکسەوە لە چیرۆکی کوردی دوای ڕاپەڕین بەدی دەکەین، کە چیرۆکنووسانی کورد چ لە ناوەوە و چ لە دەرەوە هەوڵیان داوە ئەو قالبە بشکێنن و لە چوارچێوە تەسکەکاندا بێنە دەرەوە و باس لەو نەگوتراوانە بکەن، کە لەلایەنی کۆمەڵایەتیی قبوولکراو نییە. دیارە لەمەشدا زەمینەسازییەك هاتووەتە ئاراوە، کە توانای ئەوەی هەبێت بە شێوەیەکی هونەری و لە چوارچێوەی دابێکی پێشکەوتووانەی کۆمەڵگەدا، ئەو بابەت و باس و خواسانە بخرێنەڕوو.

لەم چیرۆکدا، چیرۆکنووس بە وردی هەست و ئارەزووەکانی کارەکتەرەکانی خستووەتەڕوو، بەتایبەتیش گرێی چیرۆکەکە بواری ئەوەی بۆ چیرۆکنووس ڕەخساندووە تا بەتەواوەتی یاری بە دیمەنەکانی جووڵە و بزاڤەکانی کارەکتەرەکانی بکات و بەهۆی زمانی دەقەوە جۆرێك لە تەمومژ و لێڵییەك بخولقێنێت تا بەهۆیەوە گرفتە سەرەکییەکە بخاتەڕوو، کە برێتییە لە پەرتبوونی خودی کارەکتەرەکان و نائارامی ڕۆحی و دەروونییەکان. خود وەکو کێشەیەك لەم چیرۆکەدا لە بوارەکانی ڕۆحی و سێکسی بە تەواوتی خۆی دەخاتە پێشچاو. دیارە ناونیشانی

چیرۆکەکە بەتەواوەتی ڕەنگدانەوەی ئەو نائارامیی و ناروونییەیە کە لەدەقدا بەدی دەکرێت. چیرۆکنووس ئەو حاڵەتانەی بە بەزمەسات ناو دەبات و وەکو ئەوەی کە حاڵەتێکی کۆمیدی پڕ لە واتا و دەلالەتە تراژیدیاکاندا بێت.

لە دەقی ئەم چیرۆکەدا، دۆخە ناوازەکانی سێکس و گریانە خودییەکانی ڕۆحی مرۆڤ بە ئاشکرا تانوپۆی ڕووداوەکەیان گرتووە و کارەکتەرەکان لە سەر ڕەوتی ڕووداوەکاندا باز دەدەن و ڕووداو هێندە پابەندە بە کارەکتەرەکانی، کە دەکەوێتە هێڵەکانی ژێرەوەی کارەکتەرەکانەوە. بەواتایەکی دیکەوە کارەکتەر دەسەڵاتێکی زۆری هەیە بەسەر ڕووداوەکاندا و زیاتر ڕەوتی ڕووداوەکان بەرەو پێش دەبات. بەتایبەتیش فرە دەنگی لەم چیرۆکەدا یارمەتیدەرێکی بەهێزە تا توخمی کارەکتەر زیاتر زاڵ بێت بەسەر توخمەکانی دیکەدا، ئەمەش ڕێگەی خۆشکردووە زیاتر دایەلۆگ وەکو تەکنیکێك جێگەی لە پانتایی دەقدا ببینێتەوە و بەهۆیەوە ڕەوتی ڕووداوەکان بەڕێوە بچێت. ئەم زمانە چڕەی کە چیرۆکنووس بەکاری هێناوە، لە خزمەتی ئەو تەکنیکە دیارە بووە کە جومگەکانی چیرۆکەکەی تێدا داڕێژراوە. دیارە ئەمەش یەکێکە لە سیماکانی چیرۆکی هاوچەرخی کوردی کە تێیدا چیرۆکنووس سوود لەو زمانە چڕکراوە دەبینێت بۆ ئەوەی کۆمەڵێك کۆد و هێما دروست بکات تابەهۆیەوە خوێنەر توانای شیکردنەوە و ڕاڤەکردنی هەبێت و بتوانێت بەشدارییەکی کارا لە دووبارە بەرهەم هێنانەوەی واتادا بکات.

# ڕۆمـانه شیعـری کـوردی
# ـ مێژوو و سەرهەڵدان ـ

ڕۆمانه شیعر پێگەیەکی دیار و بەرچـاوی لـە ئـەدەبی ئـەمڕۆی کوردیـدا هەیـە، وەکـو ژانرێکیش لەلایەن شاعیرە نوێخوازەکانی کوردەوە جێگـەی چـاوتێبڕین و ئاوڕلێدانـەوە بـووە، دیارە ڕۆمانـە شـیعر دەقێکـە لـە خـودی خۆیـدا کۆکـەرەوەی دوو ژانـری گـرینگ و خـودان مێژوویەکن، ئەوانیش شیعر و ڕۆمانن، بۆیە ئاساییە لەسـەر بنچـینە و بنـەماکانی ئەوانـەوە ڕۆمانە شیعر خۆی ڕەنگرێژ بکات و لە شیعردا خەسڵەتەکانی (وێنە، زمانی شـیعری، ڕیـتم و مۆسیقا، کێش و سەروا) خواستبێت، لە ڕۆمانیشدا تەکنیك و توخمەکانی گێڕانـەوە (ڕووداو، کات، شوێن، کارەکتەر، دایەلۆگ، مەنـەلۆگ)ی وەربگرێـت و لەیـەکی بئالێنێـت و دەقێکـی ئاوێت ەو تێکەڵی لێ چێ بکات. بۆیە ئێمە ئەم لێکۆڵینـەوەمان لـەژێر ناونیشـانی (ڕۆمانـە شیعری کوردی ـ مێژوو و سەرهەڵدان) تەرخانکرد بۆ لێکۆڵینەوە لە سەرهەڵدانی ڕۆمانە شیعر لە ئەدەبی جیهانیدا بە شێوەیەکی گشتیی و ئـەدەبی کـوردیش بەشـێوەیەکی تایبـەت، بۆیـە هەوڵمانداوە سنووری ئەو ژانرە نوێیە لەناو ئـەدەبی کوردیـدا بکێشـین و خەسـڵەت و سـیما و تایبەتمەندییە هونەرییەکانی  دیاری بکەین. لەمەشدا پشـتمان بـە دەقێکـی ڕۆمانـە شـیعری (سەباح ڕەنجدەر)ی شـاعیر بەسـتووە بەناونیشـانی (زێـوان)، دیـارە (سـەباح ڕەنجـدەر) وەکـو شاعیرێکی نوێخواز هەردەم خۆی لە قەرەی بابەتی هاوچـەرخ داوە و لـە دەرگـە جیاوازەکـانی ژانرەکانی ئەدەبییەوە بەردەوامی بە ئەزموونی شیعری و جاویدانی خۆی داوە و لە گەلێك بوار و ڕێبازدا توانای خۆی تاقیکردووەتەوە، یەکێك لەم بوارانەش ڕۆمانە شیعرە، شاعیر لە ڕێگەی ڕۆمانە شیعری (زێوان)ـەوە یادەوەری و بیرەوەرییەکانی خۆی بۆمان دەگێڕێتەوە.

هەڵبژاردنی وەها بابەتێك بۆ ئەوەی بیکەینە چەقی لێکۆڵینەوەکـەمان لـەوە سەرچـاوەی گرتووە، کە ڕۆمانە شیعر بابەتێکی نوێیـە لـە ئـەدەبی کوریـدا و تـا ئێسـتە لێکۆڵینـەوە و تۆژینەوەی زانستی و ئەکادیمیانەی پڕ بەپێستی ئەو ژانرە هاوچەرخە لە ئەدەبی کوردی ئـەنجام نەدراوە. ئەوەی جێگەی ئاماژەکردن بێت، ئەو لێکۆڵینەوەیە، کە (ئەردەلان شوکر سابیر) وەکو نامەیەکی ماستەر بەناونیشانی (تەکنیکی گێڕانەوە لە ڕۆمانە شیعرەکانی (شێرکۆ بێکەس)دا

پێشکەشی کردووە، بەشێوەیەکی زانستییانە سەرهەڵدان و گەشەسەندنی ڕۆمانە شیعری کوردی باسکردووە، ئەم نامەیە وەکو یەکەمین لێکۆڵینەوەی زانستی و ئەکادیمی لەمبارەیەوە تەماشا دەکرێت، لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە چەند تێبینییەکمان لەبارەیەوە هەیە، لەوانە هەرچەندە لێتوێژ بەشی یەکەمی تەرخانکردووە بۆ باسکردنی مێژووی سەرهەڵدانی ڕۆمانە شیعر لە ئەدەبی جیهانی و ئەدەبی کوردیدا، بەڵام بە بەراورد لەگەڵ بەشەکانی دیکە، زۆر بەخێرایی ئەو بەشەی باسکردووە، وەکو ئاماژەدانێکی کورت کۆتایی بە زانیارییەکانی ناوی هێناوە و زۆرینەی نامەکەی تەرخانکردووە بۆ باسکردنی تەکنیك و توخمەکانی گێڕانەوە لەرۆمانەشیعرەکانی شێرکۆ بێکەسدا. هەروەها لە باسکردنی ڕۆمانە شیعر لە ئەدەبی کوردیشدا ئەگەرچی یەك بەیەکەی دەقەکانی بەسەر کردووەتەوە و تۆماریکردوون، بەڵام دەقی ڕۆمانە شیعری (زێوان)ی فەرامۆشکردووە و باسی نەکردووە. بۆیە ئێمە بە باشمان زانی لەم لێکۆڵینەوەیەدا وەکو تەواوکەرێکی ئەو نامە ئەکادیمییە شیکردنەوە و ڕوونکردنەوەی تەواوی لایەنەکانی ڕۆمانە شیعر لە ئەستۆ بگرین و باس بکەین. لەمبارەیەشەوە ڕووبەڕووی گرفتێك بووینەوە، کە ئەویش کەمی سەرچاوەی زانستی بوو سەبارەت بە ڕۆمانە شیعر و بابەتێك یاخود پەڕتووکێکی سەربەخۆ چ بەزمانی کوردی و چ بەزواتانی دیکە لەبەر دەستدا نەبوو، بگرە لە ڕێگەی سەرچاوەی ئینتەرنێت و چەند بەش و بڕگەیەك لە بابەتگەلی دیکەدا دەستمان پێی ڕاگەیشتووە.

ئەو ڕێبازەی کە لە لێکۆڵینەوەکەماندا پێڕەوکراوە، ڕێبازی (مێژوویی ـ شیکاریی)یە، لەمبارەیەشەوە بەپێی ئەم ڕێبازە هەوڵمانداوە پێکهاتەو بونیادی ڕۆمانە شیعر وەکو ژانرێکی سەربەخۆ لەناو ژانرەکانی دیکە، هەروەها خەسڵەت و بنەما و مێژووی لە ئەدەبی جیهانی و لە ئەدەبی کوردیدا دیاری بکەین و تەکنیك و توخمەکان بە شێوەیەکی پراکتیکی شی بکەینەوە.

ئەم لێکۆڵینەوەیە لە پێشەکییەك و سێ بەشی سەرەکیی پێکهاتووە، لە بەشی یەکەمدا کە بەناونیشانی(ڕۆمانە شیعر، چەمك و مێژوو)، باس لە چەمك و دەستپێکی مێژوویی و پێگەی لەناو ژانرە ئەدەبییەکاندا کراوە. ئەم بەشە لەسێ باس پێکدێت:

باسی یەکەم: پێگەی ڕۆمانە شیعر لەناو ژانرە ئەدەبییەکان و بیروڕای جیاواز و لایەن و ڕەهەندەکانی شی دەکاتەوە.

باسی دووەم: لە رووی زمان و زاراوە و چەمکەوە ڕۆمانە شیعر دەخاتە نێو چوارچێوەی پێناسەوە و ناسینەوە.

باسی سێیەم: مێژووی سەرهەڵدان و هۆکارەکانی و تایبەمەندییە هونەرییەکانی دەخاتە بەرباس و لێکۆڵینەوە.

لە بەشی دووەمدا، کە بەناونیشانی (پێگە و ئەدگاری ڕۆمانە شیعری کوردی)یە، باس لە ڕەگورِیشاڵی ئەو فۆرمە نوێیە و هۆکارەکانی سەرهەڵدانی هونەری و گەشەسەندی لە ئەدەبی کوردیدا کراوە. ئەم بەشە لە دوو باس پێکدێت:

باسی یەکەم: بنەما و ڕەگورِیشاڵی ڕۆمانە شیعر لە بیر و باوەڕی ئاینی و ئەدەبی فولکلۆری و ئەدەبی کۆنی کوردیدا باس دەکات.

باسی دووەم: هۆکارەکانی سەرهەڵدان و گەشەکردنی ڕۆمانە شیعر و قۆناخەکانی لە ئەدەبی کوردیدا ڕوون دەکاتەوە.

لە بەشی سێیەمدا کە بەناونیشانی (تەکنیك و توخمەکانی گێڕانەوە لە ڕۆمانە شیعری "زێوان"دا)یە و باس لە چۆنییەتی بەکارهێنانی تەکنیك و توخمەکانی گێڕانەوە لە ڕۆمانە شیعری کوردی دەکات و لەمبارەیەشەوە دەقی ڕۆمانە شیعری (زێوان) کراوەتە بواری پراکتیکی ئەم بابەتە.

لە کۆتایشدا ئەنجامەکانی ئەم لێکۆڵینەوەیە بەچەند خاڵێك و لیستی سەرچاوەکان خراوەتە ڕوو.

# بەشی یەکەم
# ڕۆمانە شیعر، چەمك و مێژوو

## باسی یەکەم: ڕۆمانە شیعر لە چوارچێوەی ژانرە ئەدەبییەکاندا

ئەدەبیش وەکو هەموو بوارەکانی دیکەی ژیان تەنیا لە پارچەیەك ڕاوبۆچوون پێك نایەت، بگرە لە چەندین پارچەی جۆراجۆری ڕاوبۆچوونی جیاواز پێکهاتووە، ئەمەش بە دەوری خۆی وای کردووە، کە هەر پارچەیەك لەم پارچانە خاوەن سیفات و خەسڵەت و تایبەتمەندیی دیاریکراوی خۆیان بن. دیارە چەمکی ئەدەبیش وەکو هەموو چەمکەکانی دیکەی ژیان جیا لەوەی پێناسە و ناسینی جودا جودا لە هەناوی خۆیدا هەڵدەگرێت، لەهەمان کاتیشدا بە درێژایی ڕۆژگاریش گۆڕانی بەسەردا هاتووە و هەمیشە لە نێو گۆڕانەکانیشدا بەدوای فۆرم و قالبی تازەدا گەڕاوە و بەپێی بارودۆخەکە، دۆخگۆڕین ڕووی لە ئەدەب کردووە.

ئەدەبیش وەکو بوارەکانی دیکە لە چەندین پارچەو یەکە پێکهاتووە، هەر یەکەیەکیش لەسەرێکەوە پێوەندییان بە ئەوانی دیکەوە هەیە و خاڵی هاوبەش کۆیان دەکاتەوە و لەسەرێکی دیکەشەوە خاوەن تایبەتمەندیی خۆیانن و لە ئەوانی دیکەدا جیان و خاڵی جیاواز لێکیان دادەبڕێت. بەم پێیەش ئەم یەکانە، کە ئێمە وشەی ژانری بۆ بەکاردەهێنین، بەپێی پێداویستییەکانی کۆمەڵگە و شارستانیی و مرۆڤایەتی لە کەمبوون و زیادبووندان و دووچاری مردن و لەناوچوون و دووبارە لە دایکبوونەوە دەبنەوە، هەمیشە بە دووی فۆرم و قالبی نوێدا وێڵن و هەوڵ دەدەن لەگەڵ بارودۆخی ئابووری و سیاسی و کۆمەڵایەتیی و ئاینی و شارستانی کۆمەڵگەی مرۆیی خۆیان نویێ بکەنەوە و هەڵبکەن. لەم چوارچێوەیەدا میخائیل باختین لەبارەی ژانرە ئەدەبییەکانەوە دەڵێت: (بیرخەرەوەی داهێنانە لە پرۆسەی گۆڕانی ئەدەبدا)) [1]، بەو واتایەی کە هەر گۆڕانێك لە ئەدەبدا ڕوودا جۆرێك لە داهێنان دێنێتە کایەوە، کە ئەو

١ـ پیتەر هاڵبێرك و دانەرانی تر، تیۆری ئەدەبی و شێوازناسی، و: ئەنوەر قادر محەمەد، مەڵبەندی کوردۆلۆجی، ٢٠١٠، ل٥٥.

داهێنانەش پێویستی بەوەیە ناوێکی لێ بنرێت، جیا بێت لەو ناوەی، کە پێشتر هەبووە، تا بەهۆیەوە بتوانێت هەم خۆی جیا بکاتەوە و پێی بناسرێت، هەمیش پەسن و خەسڵەتەکانی خۆی لەو داهێنانەدا بخاتەڕوو. یاخود وەکو ج. کوللر پێناسەی دەکات کە ((ژانرە ئەدەبییەکان بۆ خوێنەران کۆمەڵێك داب و نەریت و پێشبینکردنن)) [1]، لێرەدا کوللر دابەشکردنی جۆرەکانی ئەدەبی بەستۆتەوە بە خودی خوێنەرانەوە و لە رێگەی ئەو داب و نەریت و پێشبینیکردنەی کە خوێنەر لە دەقەکاندا دەیدۆزێتەوە جۆرەکەی دیاری دەکرێت.

لە رووی زاراوەوە ژانرە ئەدەبییەکان لە وشەی لاتینی Genusوەرگیراوە، کە ڕەگەکەی برێتییە لە Genre و Gignere کە بە واتای لەدایکبوون و لە دۆخی نادیاریشدا بە واتای لە دایك ببێت دێت، کە ئەمەش ئاماژەیەکە بۆ جۆر یاخود کاروکردەوەیەکی تاکڕەهەندی یاخود کۆمەڵی. لێرەشدا لەدایکبوون بەواتای لەدایکبوونی کائینێك کە لە ڕەنگ و ڕووخسارو کاروکردەوەدا خاوەن کەسایەتیی سەربەخۆی خۆی بێت، واتە جیا بێت لە وانەی پێشتر لە دایکبوونە، ئەم کردەوەیەش دیارە واتای دابەشکردن و پۆلێنکردنی گەیاندووە، هەرچەندە پۆلێنکردن واتای ئەوەش دەبەخشێت کە جۆرێك بەسەر جۆرەکانی دیکەشدا زاڵ ببێت، بەحوکمی ئەوەی کە نوێیە و تازە سەریهەڵداوە[2].

ئەمەش سروشتی کاری ژانرە ئەدەبییەکانمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە لە پانتایی ئەدەبیاتدا هەمیشە لە جوڵە و بزاڤێکی بەردەوام و نەچەسپاودان و هەمیشە لە گۆڕانێکی بێ وێنەی نەگۆڕدا خۆیان دەنوێنن و لە بەردەم سێبەری گەشەکردنی بوارەکانی هزری و فەلسەفی و ئایدیۆلۆژییەتدا و لەژێر ڕۆشنایی پێشکەوتنەکانی مرۆیدا لە بوارەکانی ئابووری و سیاسی و کۆمەڵایەتیی و ئاینی و...هتد خۆیان ڕێکدەخەنەوە و دووبارەو سێبارە هەوڵی خۆگۆڕین دەدەن و پێ بەپێی پێداویستییە هەنووکەییەکانی مرۆڤایەتی ڕێدەگرن و بەمەبەستی هێنانە ئارای جۆرێکی دیکەی نوێی دەق کە لە ڕەنگ و لە ڕووخسار جیاواز بێت فۆرمی نوێ لە بەرخۆیان دەکەن، بۆیە ( ژانرە ئەدەبییەکان پرەنسیپێکی ڕێکخراو و پێوانەیی پۆلێنکراون بۆ دەق و

---

١- ج. كوللر، ما النظرية الأدبية، ترجمة: هدى الكيلاني، اتحاد الكتاب العرب، سوريا ـ دمشق، ٢٠٠٩، ل٨٦.

٢- تودروف كنت واخرون، القصة الرواية المؤلف ـ دراسة في نظرية الانواع الأدبية المماصرة، ترجمة: د.خيري دومة، دار الشرقيات للنشر و التوزيع، مصر ـ القاهرة، ١٩٩٧. ص٢٥.

دەزگەیەکی تیۆری چەسپاون کە شەوخونی بۆ ڕێکخستنی دەق و دیاریکردنی خەسڵەت و سیفاتەکان و دانانی بونیاتی واتا و هونەری و وەزیفی لە ڕێگەی پرەنسیپی چەسپاو ونەگۆردا دەکەن) [1].هەر ئەمەشە وای کردووە کە ژانرە ئەدەبییەکان ((وەکو فەرمانێکی دەستووری لە قەڵەم بدرێت کە نووسەر مولزەم بکات و ئەویش بەدەوری خۆی لەهەمان کاتدا بە فەرمانە دەستوورییە ئیلتیزام بکات)) [2] واتە ژانرە ئەدەبییەکان لە یەك کاتدا دوو ڕۆڵ دەگێڕن، لەلایەکەوە نووسەر پێوەستی فەرمانەکانیان دەکەن و لەلایەکی دیکەشەوە نووسەران خۆیان پابەند بەو فەرمانانە دەکەن، کە ژانرێکی دیاریکراو وەکو پێڕەو ڕێباز و دەستوورێك لە کارەکانیدا پیادەی دەکات.

بێگومان ژانرە ئەدەبییەکان وەکو بوونەوەرێکی زیندوو وادەی لەدایکبوونیان هەیە و بەم پێیەش وادەی مردن و لەناوچوون و سڕینەوەشیان دروست دەبێ. بەواتایەکی دیکە بەپێی بارودۆخی ژیاری کۆمەڵگە و مرۆڤایەتی، ئەو ژانرە ئەدەبییانە سەرهەڵدەدەن و لەگەڵ نەمانی ئەو دیاردە و بارودۆخانەش ژانرە ئەدەبییەکانیش لەناو دەچن، واتە بوونی لەدایکبوون و مەرگ ژیاننامەی ئەو ژانرە ئەدەبییانە لەخۆدەگرێ، بەڵام دەبێ ئەوە بزانین ئەو لەدایکبوون و مردنە، لەدایکبوون و مردنێکی ئاسایی و جەستەیی نییە، بگرە زیاتر مەعنەوییە و کاریگەرییەکانی ئەو ژانرە ئەدەبییەی، کە لەناو دەچێ هەر دەمێنێ و دەگوازرێتەوەو بۆ ناو ژانرە ئەدەبییەکانی دیکە. بەو واتایەی کە ژانری ئەدەبی بەشێك لە خەسڵەت و پەسنەکانی پێکهاتەکەی وەکو ناوکێك کە هەرگیز لەناو ناچێ دەمێنێتەوە و دەچێتە قالبی ژانرێکی دیکەی ئەدەبی، کە بەهۆی بارودۆخێکی دیاریکراوەوە دروست بووە. بێگومان دروستبوونی ئەو ژانرە ئەدەبییە نوێیەش لە سەر بناخە و بنچینەی ژانرەکەی پێشە خۆی بووە و سوودی لە هەلومەرجی بنیاتنان و پێکهاتەی تەکنیکی ژانرە ئەدەبییەکانی پێشەخۆی وەردەگرێت و سەر لەنوێ بەپێی پێداویستییە هەنووکەییەکان لە شێوازێکی نوێ و فۆرمێکی تازەدا خۆی ڕادەگەیەنێت، کە ئەو ڕاگەیاندنە بەشێك لە کەلێن و بۆشاییەکانی گۆڕەپانی ئەوکاتەی ئەدەبی پڕ دەکاتەوە.

---

١- د. جميل حمداوي، إشكالية الجنس الأدبي، www.dahsha.com

٢- رِينية ويليك و اوستن وارين، نظرية الأدب، ترجمة: محيي الدين صبحي، المؤسسة العربية للدراسات والنشر، لبنان ـ بيروت، ١٩٨٧، ص٢٣٧.

لەگەڵ ئەوەشدا کە ژانرە ئەدەبییەکان خەسڵەت و سیفەتەکانیان دەگوازرێنەوە بۆ یەکتری و لەگەڵ یەکدیدا هەڵدەکەن و تەبان، لەهەمانکاتیشدا هەر یەکێکیان خاوەن کەسایەتیی سەربەخۆی خۆیەتی و تایبەتمەندییەکی دیاریکراو و دەستنیشانکراوی خۆی هەیە و لە ئەوانی دیکەی جیای دەکاتەوە. هەر ژانرێك لەو ژانرانە سەرەڕای ئەوەی کە قابیلی توانەوەو لەناوچوونەو هەروەها قابیلی گواستنەوەی خەسڵەتەکانیشیەتی، خاوەنی ئەدگارو سیفاتی تایبەتی خۆشیەتی و پێی جودا دەبێتەوەو بەهۆیەوەش لەناو ژانرە ئەدەبییەکانی دیکەدا دەناسرێتەوە.

بۆیە ژانرە ئەدەبییەکان لە یەککاتدا دوو دیاردەی هاودژ کۆیان دەکاتەوە، یەکێکیان لەدایکبوون و لەناوچوونە، کە بەهۆیەوە خەسڵەت و سیفات و ئەدگارەکانیان دەبنە بنچینەو بناخەی سەرهەڵدانی ژانری دیکەی ئەدەبی و مردن پەی پێیان نابات و هەمیشە بە نەمری دەمێننەوە. لەهەمان کاتیشدا لەهەناوی خۆیاندا کۆمەڵێك تایبەتمەندی و دیاریکراوییان هەڵگرتووە، کە کەسایەتییەکی سەربەخۆی خۆی لە ڕوخسار و ناوەڕۆکدا پێ بەخشییوە و لە تەواوی ژانرەکانی دیکەدا جیای کردووەتەوە. ئەو دوو دیاردە هاودژەش پێناسەی ژانرە ئەدەبییەکانیان لەخۆدا حەشارداوە بەوەی کە هەمیشە ژانرە ئەدەبییەکان لەژێر ڕۆشنایی خەسڵەت و سیفات و گوتارەکانی ئەو ژانرە دیاریکراوەدا پێناسەیەکی دەستنیشانکراویش هەڵدەگرن.

## ژانرە ئەدەبییەکان و مێژووی ئەدەب:

لێرەدا دەکرێت ئەو پرسیارە بێتە ئاراوە، کە بۆچی ژانرە ئەدەبییەکان، وەکو بەشێك لە مێژووی ئەدەبی داهێنرا؟ بێگومان ژانرە ئەدەبییەکان لە سەرەتادا وا دیار کەوت، کە ئەدەب دابەش دەکات بەسەر کۆمەڵێك پارچە و هەر پارچەیەکیش ناوێکی بۆ دەدۆزێتەوە. بەڵام ئایا ئەم کارەی لەپێناو چی ئەنجام دا؟ بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە دەبێ ئاوڕێك لە ئەدەب خۆی بدەینەوە، کە بەدرێژایی مێژوو هەوڵی پێناسەکردنی دراوە و هەمیشە لە سەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکی تر و لە قۆناخێکەوە بۆ قۆناخێکی دیکە گۆڕانکاری لەسەر ئەو پێناسانە و ناسینی خودی ئەدەب هاتووەتە کایەوە و هەر زانایەك لەڕوانگەیەك لە ڕوانگەکانی ژیانەوە لێی ڕوانیوە و هەر زانایەکیش لە پێناو مەبەستێك لە مەبەستەکانی ژیان خۆی، پەنای بۆ ئەدەب بردووە و بەمەبەستی پڕکردنەوەی ئەو پێداویستییەی، کە زەروورەتی هەنووکەیی

دەستینشانی کردووە ڕایەڵەی بۆچوونەکاتی  تێدا بیناکردووە. ئەو پێناسانەی ئەدەب کە هەمەلایەن و جۆراجۆرن هەوڵێك بوونە بۆ ناساندنی ئەدەب خۆی و دۆزینەوەی ڕێگەیەك بۆ تێگەیشتن لێی، بەو واتایەی هاتنە کایەی ژانرە ئەدەبییەکانیش خۆی لە خۆیدا جۆرێکە لە ناسینی خودی ئەدەب و هەوڵێکە بۆ شیکردنەوەی واتای ئەدەب و ڕێگەکانی تێگەیشتن لەو چەمکەی کە سەرتاپای ژیانی مرۆڤایەتی بە بیروبۆچوونی جیا جیاوە نەخشاندووە، لەلایەکی دیکەوەش بەهۆی زۆری بەرهەم و بابەتی ئەدەب خۆیەوە، زانایان و فەیلەسووفان ناچار بوون ئەدەب دابەشی چەند ژانرێك بکەن و لەوێوە نەخشەرێگایەك دیاری بکەن بۆ ئەوەی بتوانن ئەو بەش و پارچانە لەیەکتر جیا بکەنەوە. کەواتە (ژانرە ئەدەبییەکان تەنیا وشەو پۆلێنکردنێکی هەرمەکین، کە ڕەخنە لە پێناو دڵنەوایی خۆی و هەروەها بۆ دۆزینەوەی خودی خۆی و ناساندنی لەنێو ئەو هەمووە بەرهەمە جوارجۆرەدا دایدەهێنیێ)[1]. کەواتە دەتوانین بڵێین هۆکارگەلێکی زۆر هەبوونە کە ڕۆڵیان لە سەرهەڵدانی ژانرە ئەدەبیەکان وەکو بەشێك لە بەشەکانی مێژووی ئەدەبیدا هەبووە، بەڵام دەکرێت  هۆکارە سەرەکییەکانی هاتنە کایەی ژانرە ئەدەبییەکان لە مێژووی ئەدەبدا بۆ پێنج هۆکاری سەرەکیی بگەڕێنینەوە کە ڕاستەوخۆ کاریگەریی لەسەر بوونی پێویستی زانستێکی وەکو زانستی ژانرە ئەدەبییەکان هەبووە:

١ـ ناساندن و پێناسەکردنی خودی ئەدەب، کە بە هۆی زۆر گۆشەنیگا و ڕێباز و ڕوانگە جیاجیاکانەوە و تا ئێستەش ئەو پێناسەکردنە جۆرێك لە شمولییەت و گشتگیری بەخۆیەوە بینیوە، ژانرە ئەدەبییەکان لەم ڕوانگەیەوە کە ئەدەب دابەشی سەر چەند پارچەیەکی دیاریکراو دەکرێت و هەر پارچەیەك سیفات و خەسڵەتەکانی دەستنیشان دەکرێت، جۆرێك لە ڕێکخستن و ڕێکوپێکی بە هەوڵەکانی ئەو پێناسەکردنە دەدات.

٢ـ زۆری بەرهەمە ئەدەبییەکان  بەڕادەیەك کە جیاکردنەوە و ناسینیان لە نێو خودی گۆڕەپانی ئەدەبیدا ناهەموار و سەخت ببوو، لەم چوارچێوەیەدا ژانرە ئەدەبیەکان هەوڵێك بوون بۆ لەیەکتر جوداکردنەوەی ئەو بەرهەمانە و دابەشکردنیان بەپێی لەیەکتر نێزیکی سیفات و خەسڵەتەکانیان و دیاریکردنی ڕێگەو شێوازەکانیان، ئەمەش هەوڵێك بوو بۆ زاڵبوون بەسەر بەرهەمە ئەدەبییەکان و پۆلێنکردنیان. بۆیە( لەکەتواردا هەر تیۆرێك بۆ ژانرەکان، دەبێ

---

١- ماری شیفیر، ما الجنس الأدبی، ترجمة: د. غسان السید، اتحاد الکتاب العرب، سوریا ـ دمشق، ١٩٩٧، ص٤٠.

تیۆرێك بێت بۆ ناسنامەی کاری ئەدەبی، بەشێوەیەکی فرەوانتر، بۆ کاری نووسین، چونکە کاری ئەدەبی، وەکو هەموو کردەیەکی گوتار، ڕاستییەکی ئاماژەداری ئالۆزە و فرە ڕەهەندە)) [1] بۆیە جیاکردنەوەی ئەو بەرهەم و کارە ئەدەبییانە لەیەکتر بەشێك لە ئامانج و کاری ژانرە ئەدەبییەکان پێکدەهێنن.

٣ـ ئەم زاڵبوونەی ژانرە ئەدەبییەکان بەسەر بەرهەمە ئەدەبییەکان، یارمەتیدانێکی باش بوو بۆ زانستێك کە ئەویش ڕەخنەی ئەدەبی بوو بۆ ئەوەی ئەویش بتوانێت بە ئاسانی مامەڵەی ئیستاتیکی و هونەری لەگەڵ خودی ئەم بەرهەمە ئەدەبییانەدا بکات.

٤ـ کارەکانی ژانرە ئەدەبییەکان لە پۆلێنکردنی ئەدەبدا، یارمەتیدەرێکی سەرەکیی بوو بۆ مێژووی ئەدەبی تا بەهۆیەوە بتوانێت تەواوی مێژووی ئەدەبی لەرێگەی تۆمارکردنی مێژووی ئەو ژانرانەوە بەوردی و دیقەتەوە بنووسێتەوەو بەسەر ئەو زۆری و فرەوانییەی بەرهەمە ئەدەبییەکاندا زاڵ ببێت.

٥ـ لەهەمان کاتیشدا یارمەتیدرێکی سەرەکیی بیبلۆگرافیای ئەدەبیش بوو، کە بەهۆیەوە توانرا تەواوی بەرهەمە ئەدەبییەکان و زانیارییەکانیان لەژێر پۆلێنکردنی ئەو ژانرانەدا تۆمار بکرێن.

ئەم کارە سەرەکییانەی ژانرە ئەدەبییەکان وای کرد بەردەوام سنوورەکانی ئەم زانستە لە هەڵکشان و داکشان دابێت و هەمیشە بەپێی گۆڕانکارییەکانی ژیان و کۆمەڵگە گۆڕانکاری بەخۆیەوە ببینێت و هەرگیز شێوەیەکی دیاریکراو بەخۆیەوە نەبینێت.

هاتنەکایەی خودی ژانرە ئەدەبییەکانیش پێوەستە بەو پێشکەوتنەی کە لەبوارەکانی ژیانی مرۆڤدا هاتە کایەوە (کاتێك لە سەردەمانی کۆندا هێشتا کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی دابەشکردنی کار نەناسیبوو، چونکە هەموو کارەکان سەبارەت بە هەر ئەندامێك لە ئەندامانی کۆمەڵگە کارا بووە، ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە هەر کارێك هێشتا لە سادەترین وێنە و فۆرمیدا بوو و بۆ ئەو کەسەی، کە ئەنجامی دەدا زیاتر پێداویستی بوو نەك پیشەو ڕۆشنبیری، لەبەرئەوەش بوو کە کار کۆمەڵی بوو یاخود چالاکییەکی کۆمەڵی بوو) [2] و هەموو خەڵك لەکارو کردەوەکاندا

---

١- هەمان سەرچاوە، ل٦٢.

٢- احمد عبد المعطى حجازى، القصيدة النثر أو القصيدة الخرساء، الطبعة الأولي، الأمارات ـ دبي،٢٠٠٨، ص٦٢.

بەشدارییان دەکرد، بەڵام پێشکەوتنی کۆمەڵگە وای کرد کە دابەشکردنی کار و کردەوەکان بێتە ئاراوەو لەمەشدا کەڵەکەبوونی شارەزایی و وردبینی ڕۆڵی خۆیان بینی. لەم نێوەشدا کارە هونەرییەکان لە کارە کردەییەکان جیا کرایەوە، هەر هونەرێك بۆ خۆی بوو بە شێك و هەر بەشێکیش دابەشی چەند یەکەیەك کرا. واتە پۆلێنکردن بوو بە ئامرازێك بۆ ڕێکخستنی کارو کردەوەو زانستەکان ((ئامانجی سروشتی هەر زانستێك لە جیهاندا پۆلێنکردنە، لە چوارچێوەی سیستەمێکدا کە لە سیستەمی سروشت دەچێت)) [1]، ئەدەبیش وەکو زانستێك لە زانستەکان پێویستی بە پۆلێنکردن هەبوو، بۆ ئەوەی ڕێکبخرێت و پێناسە بکرێت. لێرەوە گرینگی و بایەخی زانستی ژانرە ئەدەبییەکان بەدیار کەوت، چونکە ئەو ژانرانە لەرێگای جیاوازییەکانیانەوە پێشکەوتن و گەشەکردن بە ئەدەب دەبەخشن، ئەو پێشکەوتن و پەرەسەندنەش بەپێی یاسایەك دەبێ کە پێوەندیی نێوان ئەو ژانرانە ڕێکدەخات. واتە یاسایەك بۆ پێشکەوتنی ئەدەبی هەیە، بەڵام ئەم یاسایە بە پرەنسیپێك کورتکراوەتەوە کە جیاوازی خەسڵەتەکانە، واتە گواستنەوە لە گونجانی نێوان ژانرەکان بۆ جیاوازیی نێوانیان[2]. هەروەکو جوناسان کولەر باس لەو یاسا و پێشبینیانە دەکات، کە ژانرەکان لەخۆیان دەگرن و دەڵێت: ((ژانرەکان تەنیا چینێك نین بۆ پۆلێنکردن، بگرە کۆمەڵێك یاسا و پێشبینیکردنن کە یارمەتی خوێنەر دەدەن وەزیفەی ڕەگەزە جۆراجۆرەکانی کاری ئەدەبی دیاری بکەن)) [3] و بەپێی ئەو کۆمەڵە یاسا و پێشبینکردنە بواری پێشکەوتنی ئەدەبی بهێننە کایەوە. بێگومان ئەو جیاوازییەش لەنێوان ژانرەکان جۆرێك لە زیندوویەتی و بزاڤ بە ئەدەب دەبەخشن و لە کەتواری ژیانی مرۆڤ نێزیکی دەکەنەوە، بەوپێیەی کە ژیانی مرۆڤیش جۆراجۆر و هەمە ڕەنگە. هەر ئەمەش وا دەکات دۆخگۆڕین لە ژانرە ئەدەبییەکان بێتە کایەوە، واتە ژانرەکان بەپێی ئەو ململانێیەی کە لەپێناو مانەوەی خۆیاندا ئەنجامی دەدەن و بەپێی کات و شوێنێکی دیاریکراودا، لەدۆخێکەوە دەچنە دۆخێکی دیکەوە، بەمەش ژانرە ئەدەبییەکان هەمیشە لەگۆڕان و جووڵەدان، بەڵام نامرن. مەبەستمان لە مردن ئەو مردنە فیزیکی و بایۆلۆجییەی،

١- ماری شیفیر، ما الجنس الأدبی، ترجمة: د. غسان السید، ص٤٢.

٢- هەمان سەرچاوە، ص٤٤.

٣- تودروف کنت واخرون، القصة الرواية المؤلف ـ دراسة في نظرية الانواع الأدبية المماصرة، ترجمة: د.خيری دومة، ص٥٧.

کە بۆ نموونە مرۆڤ ڕووبەڕووی دەبێتەوە نییە، بگرە بەشێك لە خەسڵەتە و سیفاتەکانیان دەگوزانەوە بۆ ئەو ژانرە نوێیەی کە تازە هاتووەتە نێو ژیانەوە، واتە دۆنادۆن بوونی سیفەتی ژانرەکانە لەنێو خۆیاندا.

## یاسا و ڕێساکانی ژانرە ئەدەبییەکان:

ژانرە ئەدەبییەکان بەپێی مێژووی خۆی ئەویش پێوەست کراوە  بە گەلێك یاسا و پێڕەو ڕێبازدا، کە بەپێی دەوروبەری کۆمەڵایەتیی و سیاسی و ئابووری و ڕۆشنبیری لە دۆخێکەوە بۆ دۆخێکی دیکە گۆڕاوە، دیارە لە سەرەتادا ژانرە ئەدەبییەکان بەهیچ شێوەیەك تێکەڵبوون و ئاوێتەبوونی نێوان ژانرەکانی پێ قبوڵ نەکراوە.

لەمبارەیەوە دەکرێت ئاماژە بە یۆنانییەکان بکەین، کە یەکەم کەسانێك بوون توانیان تیۆری ژانرە ئەدەبییەکان بهێننەکایەوە. لەم ڕووەوە ئەفلاتوون هەرچەندە ئەدەبی دابەشی سەر داستان و تراژیدیا و کۆمیدیا کرد، لەهەمان کاتیشدا ڕۆڵی دەربڕینی شاعیرەکانی کردووەتە سەنگی مەحەك بۆ جیاکردنەوەی جۆرەکانی ئەدەبی، ئەویش بەوەی کە شاعیران یان بەشێوەی گێڕانەوە یاخود بەشێوەی لاساییکردنەوە، یان بە تێکەڵکردنی هەردوو شێوازەکە بەرهەمەکانیان دادەڕێژن[1].لە بەرامبەردا ئەرستۆ کە بە ((دانەری ئەو بنچینانە دادەنرێت کە تیۆری جۆرە ئەدەبییەکانی لەسەر بنیات دەنرێت، لە پەڕتووکەکەیدا ( هونەری شیعر) ئەدەبی دابەشکردووە بۆ سێ جۆر (تراژیدیا، کۆمیدیا، داستان) و خەسڵەتەکانی هەریەك لە تراژیدیا و داستان لە رووی بابەت و ناوەڕۆك و ئەو ئەرکەی دەیبینێ دیار کردووە، ئەرستۆ سوور بووە لەسەر ئەوەی، کە دەری بخات هەر جۆرێکی ئەدەبی جیاوازە لە جۆرەکەی دیکە لە رووی بەها و نرخەوە، بۆیە دەبێت بە جیا بمێنێتەوە)) [2] ئەمەش واتای ئەوە دەگەیەنێت کە نابێت بە هیچ شێوەیەك جۆرەکانی ئەدەبی تێکەڵی یەکدی بکرێن، چونکە ((تیۆری کلاسیك باوەڕی تەنیا بەوە نییە کە جۆرێك لە جۆرێکی دیکە لەڕووی سروشت و بەها جیاوازە، بگرە باوەڕی بەوەش هەیە کە ئەم جۆرانە دەبێت بە سەربەخۆ بمێننەوە و تێکەڵی یەکتر نەبن، ئەمەش ئەو ڕێبازە

---

١- ماری شیفیر، ما الجنس الأدبی، ترجمة: د. غسان السید، ص١٦ .

٢- د. شکری عزیز الماضي، تیۆری ئەدەب، و: پ.ی.د.سەردار ئەحمەد گەردی، چاپخانەی ماردین، هەولێر، ٢٠١٠، ل٩٤-٩٥.

بەناوبانگەیە، کە بە (پاکی جۆرەکان)ەوە ناسراوە)) [1]. ئەم بیروباوەڕەش تا سەدەی بیست بەردەوامبوو، بەڵام دوای ئەم سەدەیە ئیتر جۆرەکان تێکەڵ و ئاوێتەی یەکتری کران و ئەو سنوورە پیرۆزەی کە لەنێوان ژانرەکان کێشرابوو تێکشێندرا و ژانرەکان توانیان بەشێك لە هەوا و ئاوی یەکتر هەڵمژن و بخۆنەوە.

بە درێژایی مێژووی جۆرەکانی ئەدەبی لەلایەن زانا و هزرڤان و ڕەخنەگرانەوە هەوڵی زۆر دراوە بۆ دابەشکردن و پۆلێنکردنی ئەدەب. هەر یەکێکیان لەسەر بنچینە و بناخەیەکەوە بیروڕاکانیان دەربڕیوە و هەوڵیان داوە ئەو بیروباوەڕەیان لە گۆڕەپانی ئەدەبیدا بچەسپێنن.بێگومان ئەو بنچینە و بناخانەش بەپێی بیروبۆچوونی خودی نووسەر و ڕەخنەگران، هەروەها بارودۆخی سەردەمەکەی گۆڕاو و جیاواز بوونە. لەم ڕوانگەیەوە ئەگەر سەیری یەکەمین ئەو هەوڵانە بکەین کە ئەرستۆ ئەنجامی دا، دەبینین ئەرستۆ ئەدەبیاتی لەسەر بنچینەی ئەو بەرهەمانەی، کە لەسەردەمەکەیدا بەرهەمی نایاب و پڕ جەماوەر بوون دارشتووە، بەو واتایەی ئەرستۆ لە دەربڕینی بیروڕاکانیدا پابەندی بنەکانی ئەو دەقانە بووە ((ئەرستۆ لە نووسینەکانیدا، نەیتوانیوەپێش ( هۆمیرۆس و هسیود و ئەسخیلۆس و سۆفۆکلیس) بکەوێ، بە پێچەوانەوە بنچینە تیۆرییەکانی ئێستەتیکای لە پەرتووکەکانی ئەوانەوە، هەڵهێنجاوە)) [2]. بەو واتایەی خودی بەرهەمەکان بنەمایەك بوونە بۆ دانانی تیۆرەکان. ئەم بیروڕایەی ئەرستۆ تا سەدەکانی ناوەڕاست کاری لەسەر کرا، بەڵام دواتر لەسەر بنەما و بنچینەی دیکەوە کار لەسەر ژانرە ئەدەبییەکان کرا، لەوانە هیدسۆن لەسەر بنەمای دەروون شیکاریدا کاری کرد و وای بینی، کە ژانرە ئەدەبییەکان بەپێی پێویستییە دەروونییەکانی مرۆڤ هاتووەتەکایەوە و بەشێك لە پێداویستییە خودییەکانی مرۆڤ تێر دەکات، لەم چوارچێوەیەدا ئەدەبی بۆ چوار بەش دابەشکرد:

١ـ ئارەزووی مرۆڤ بۆ گوزارشتکردن لەخود، شیعر تێدا هاتە کایەوە.

٢ـ گرینگیدان بە خەڵك و کارو کردەوەیان، کە دراما بۆ ئەم مەبەستە هاتەکایەوە.

---

١- رِينية ويليك و اوستن وارين، نظرية الأدب، ترجمة: محيي الدين صبحي، ص٢٤٦.

٢- مەجید مەحموود، شیعر و فەلسەفە، و: فوئاد مەجید میسری، دەزگای چاپ و پەخشی حەمدی، چاپی دووەم، ٢٠٠٨، ل ٤٠

٣ـ بایەخدان بە ژیانی کەتواری کە تێیدا دەژین، هەروەها جیهانی خەیاڵی کەهەستی پێ دەکەین، بۆ ئەم مەبەستەش چیرۆك هاتە کایەوە.

٤ـ خۆشەویستیمان بۆ وێنە وەك ئەوەی کە وێنەیە (کیانێك بۆ ئەدەب هاتە ئاراوە کە لەسەرخودی خۆیا بنیات نراوە، باڵای کردووە، هەڵچووە) [1].

هەندێکی دیکە لە زانایان سەرهەڵدانی ژانرەکان بۆ بارودۆخی سیستەمی کۆمەڵایەتیی دەگەڕێننەوە و پێیان وایە سیستەمی کۆمەڵایەتیی ژانری ئەدەبی گونجاو بۆ پلەی ڕۆشنبیرییەکە و پێشکەوتنی ڕایەڵە کۆمەڵایەتییەکەی دەسەپێنێت، لەم ڕووەوەش ئاماژە بەوە دەکەن، کە لە کۆنەوە ئەم سیستەمە کۆمەڵایەتییە ژانرە ئەدەبییەکانی لەیەکتر جودا کردووەتەوە، داستان و تراژیدیا کێشەکانی چینی سەرەوەی کۆمەڵ لە پاشا و میر و دەرەبەگ و خانەدانەکان و کۆمیدیاش کێشەکانی چینی خوارەوەی کۆمەڵیان دەربڕیوە[2]. بەهەمان شێوەش لەسەردەمی هاوچەرخدا (( هەرگیز ڕۆمان لە کۆمەڵگەیەکی بەدەوی بیابان نەدەهاتە ئاراوە، بگرە دەرکەوتنی پێویستی بە پێوەندیی کۆمەڵایەتیی چڕ(شار) و دەرکەوتنی چاپخانە و خوێنەر و ئاستێك لە فێربوون و ڕۆژنامەگەری و پەرتووکخانە و...هتد، هەیە)) [3]، ئەمەش واتای ئەوە دەگەیەنێت کە بەرهەمی ئەدەبی کردار و چالاکییەکی کۆمەڵایەتییە و پێوەستە بە پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و لەچوارچێوەی پێوەندییکردنی نووسەر بە جەماوەر بۆ خزمەتکردنی مەبەستێکی کۆمەڵایەتیی دێتەکایەوە.

هەندێك زانای دیکە سەرهەڵدانی ژانرە ئەدەبییەکانیان بە جۆری خوێنەر و ئاست و تێگەیشتنی لەبەرهەمە ئەدەبییەکاندا بەستۆتەوە، ئەمە تیۆرەش زیاتر پاش هاتنەئارای بیروڕایەکانی ڕۆلان بارت سەریهەڵدا پاش ئەوەی کە مەرگی نووسەری دەقی ڕاگەیاند، بەمەش تەواوی کردار و چالاکییە ئەدەبییەکان کەوتە سەر خوێنەرەوە. تێگەیشتنی خوێنەر بە بەرهەمێهێنانەوەی دووەمی دەق لەقەڵەم درا، لێرەشدا بایەخ زیاتر بە کردەی پێوەندییکردن بە خوێنەر درا، لەمبارەیەوە هیرش دەڵێت: (تواناکانمان بۆ تێگەیشتنی دەقێك لە دەقەکان ڕاستەوخۆ پێوەستە بە وەرگرتنمان لەبارەی ژانرەکەوە، چۆن دەخوێنینەوە و چیی لەبارەوە

١- د. شکری عزیز الماضي، تیۆری ئەدەب، و: پ.ی.د.سەردار ئەحمەد گەردی،، ل٩٦.

٢- رِينية ويليك و اوستن وارين، نظرية الأدب، ترجمة: محيي الدين صبحي، ص٢٤٦.

٣- د. شکری عزیز الماضي، تیۆری ئەدەب، و: پ.ی.د.سەردار ئەحمەد گەردی،، ل٩٨.

فێردەبن کە ئەمەش پێوەستە بە چۆنییەتی وەرگرتنمان بۆی لە چامە یاخود ڕۆمان یاخود وتار لە ڕۆژنامەیەکدا)) [1] ئەم جۆرەیان ڕاستەوخۆ پێوەستە بە نەریتەکانی خوێندنەوە و دووبارە بەرهەمهێنانەوەی دەق لەلایەن خوێنەرەوە، لێرەشدا دیارە هەر خوێنەرێك ئاستی تێگەیشتنی جیاوازە لەوی دیکە، بۆیە جۆری خوێندنەوەکانیش دەگۆڕێت و بەمەش ڕەنگە هەر خوێنەرێك بە جۆرێك لە ژانرە ئەدەبییەکان بگات و داهێنانی تێیدا ئەنجام بدات.

هەندێکی دیکە لە گۆشەنیگایەکی بایۆلۆژییەوە ڕوانیبیانە ژانرەکانەوە، لەمبارەیەوە سیمۆند وای دەبینێ کە ژانرە ئەدەبییەکان بەهەندێك قۆناخدا ڕەت دەبن، کە لە قۆناخەکانی گەشەکردنی مرۆڤ لە پێگەیشتن و گەشەکردن و تێکچوون و لەناوچوون نێزیکە[2]. هەرچەندە لەم ڕوانگەیەوە برۆنتێر پێی وایە کە ئەم حاڵەتە، حاڵەتێکی بایۆلۆژییە و ژانرەکان دروست دەبن و گەشەدەکەن و لەناودەچن، بەڵام لەناوچوونەکەیان وەك لە ناوچوونی زیندەوەرەکانی دیکە نییە، بگرە بەشێك لە سیما و خەسڵەتەکانی بۆ ژانرێکی دیکەی ئەدەبی دەگوزارێتەوەوبەردەوام دەبێت[3].

هیگڵ ئەدەبی بۆ سەر دوو بەش دابەش دەکات، داستانی و لیریکی، بە تێکەڵبوونی ئەم دوو جۆرە، ژانری سێیەم دێتە کایەوە کە درامایە[4].

ت. س. ئیلیۆت ئەدەب بەسەر سێ بەش دابەش دەکات، لیریك و داستانی و درامی و پێی وایە، کە لەم ڕوانگەیەوە سێ جۆرە دەنگ دەبیستین، دەنگی یەکەم لەوکاتەدایە، کە شاعیر دەقی شیعرەکە بۆ خۆی دادەنێت و لەگەڵ خۆیدا دەئاخڤیت کە ئەمەشیان لیریکە. دەنگی دووەمیش کاتێکە کە شاعیر بۆ کەسێکی دیکە شیعر دادەنێت کە ئەمەیان داستانە. دەنگی

---

١- تودروف كنت واخرون، القصة الرواية المؤلف ـ دراسة في نظرية الانواع الأدبية المعاصرة، ترجمة: د.خيرى دومة، ص٥٨.

٢- د. شكری عزيز الماضي، تيۆری ئەدەب، و: پ.ی.د.سەردار ئەحمەد گەردی،، ل٩٦.

٣- د. عبدالمنعم تليمة، مقدمة في نظرية الأدب، دار الثقافة للطباعة والنشر، قاهيرة،١٩٧٦،ص١٣٥.

٤- د. شكری عزيز الماضي، تيۆری ئەدەب، و: پ.ی.د.سەردار ئەحمەد گەردی، ل٩٧.

سێیەمیش کاتێکە کە شاعیر لەشیعرەکەیدا مەبەستەکانی دەردەبڕێت و هەڵوێستی کەسانی دیکە دەگۆڕێت کە ئەمەشیان درامایە.[1].

بەشێوەیەکی گشتیی زانایان و هزرڤانان ڕێککەوتنێکی گشتیان لەنێواندا هەیە لەبارەی ئەوەی کە ئەدەب دابەشی سەر دوو بەشی سەرەکیی دەبێت ئەوانیش شیعرو پەخشانن. دیارە گۆڕەپانی فرەوانی ئەدەب بەر شیعر کەوتووە و قورساییەکی زۆری لەسەر ئەدەب بەجێهێشتووە، ئەمەش بەحوکمی ئەوەی کە لەسەرەتادا مرۆڤ زووتر ئاشنای فۆرمی شیعر بووە و گشت بۆنە و پەرستن و نزا و پاڕانەوە و ئاهەنگەکانی بە شیعر دەربڕیوە، دیارە ئەم پەنابردنەی مرۆڤ بۆ فۆرمێکی وەکو شیعر زیاتر لەبەرئەوە بووە، کە شیعر کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر هەست و نەست و سۆزی دروست کردووە بە حوکمی ئەوەی، کە وشەو ڕستە و دەستەواژەکانی کورت و پوخت و خاوەن ڕیتم و مۆسیقا و هارمۆنییەت بووە، کە جۆرە زاڵبوونێکی بەسەر هەست و سۆزی مرۆڤدا هێناوەتە ئاراوەو سیحرئاسا مرۆڤ کەمندکێشی بووە. ئەمانە گشتیان بواریان ڕەخساندووە بۆ شیعر کە باڵادەست بێت و تەنانەت ژانرەکانی دیکەش پەنا بۆ زمانی شیعر ببەن لە خستنەڕووی ڕووداوەکانیان وەکو داستان و دراما، لەگەڵ ئەوەشدا بەپێی پێشکەوتنی بوارەکانی ژیان بەرە بەرە پەخشانیش هاتەئاراوە و شوێنپێی لە نێو گۆڕەپانی ئەدەبیدا بۆ خۆی کردەوە. دیارە شیعر وەکو بەشێکی گرینگی ئەدەب تەنیا جۆرەکانی شیعری لە خۆیەوە گرتووە، بەڵام پەخشان کە ژانرەکانی وەکو ( چیرۆك و ڕۆمان و شانۆ و.... هتد) لەخۆ گرتووە و ئینجا بە پلەی دووەم جۆرەکانی هەر یەك لەم ژانرانەش دێن و دەخرێنەڕوو.

### شێوەکانی ژانرە ئەدەبییەکان:

هەرچەندە شیعر و پەخشان لە چەند خەسڵەت و سیمایەك لە یەکدی جیا ببنەوە، ئەوا لە چەند خەسڵەت و سیمایەکی دیکەش لەیەکدی نێزیك دەبنەوە، دیارە ئەمەش بەدەوری خۆی تێکەڵاوی و چوونە ناو یەکی خوڵقاندووە، هەر ئەمەش وای لە هەندێك نووسەرو ڕەخنەگری ئەم سەردەمە کردووە کە زاراوەی دەق بۆ ئەم جۆرە تێکەڵاوی و چوونە ناو یەکدییە بەکاربهێنن، کە

---

١- د. علی الزبیدی، الشعر و المسرح، الشعر و الفنون ـ مختارات من الأبحاث المقدمة لمهرجان المربد الثالث ١٩٧٤، بغداد ـ العراق، ص ٤١.

جیا لە شیعر و پەخشان بە جۆری سێیەمی ئەدەبی لە قەڵەمی بدەن، بەو پێیەی کە ((دەق فەزایەکی فرە ڕەهەندە، تیایدا نووسینی جۆراجۆر ئاوێتەی یەکدی دەبن و لەگەڵ یەکدا هاودژ دەبن، بەبێ ئەوەی هیچ یەکێك لەو نووسینانە لەوانی تر ڕەسەنتر بێ، دەق پێکهاتەیەکە لە وەرگرتن، اقتباسات ـ لە کۆمەڵێك سەرچاوەی ڕۆشنبیری جیا جیاوە))[1]، دیارە ئەمەش دەق دەکاتە زاراوەیەکی سەربەخۆ و دوور لە پۆلێنکردن، چونکە بەلای ئەوانەوە ((دەقی ئەدەبی جەستەیەکی مەعریفییە لەڕووی ڕەگەزی ئەدەبییەوە خاوەن سەربەخۆیی خۆیەتی، هەروەها هەڵگری چەندین بنەمای تایبەتمەندی هونەری خۆیەتی)) [2] ئەمەش وای لە نووسەران کردووە لەسەر بەرهەمەکانیان وشەی دەق یان تێکست بەکاربهێنن، چونکە بەهۆیەوە خۆیان لە دیاریکردنی ناسنامەی بەرهەکەیان دەپارێزن و جۆرێك لە تەمومژ و قووڵاییەکی هزری بۆ بەرهەمەکەیان دەسازێنن. ئەم ئاوێتەبوون و تێکەڵاوبوون و چوونە ناویەکی ژانرە ئەدەبییەکان لە چەند شێوەیەکدا خۆی دەنوێنێت:

١ـ ژانرێك بەپێی چوارچێوەی کاتی و شوێنییەکەی و بواری سیاسی و کۆمەڵایەتیی و ڕۆشنبیری و ئابوورییەوە، جێگەی خۆی بۆ لە دایکبوونی ژانرێکی دیکە خۆش دەکات و کۆتایی بە بوونی فیسەلۆژی خۆی دەهێنێ و ئەو خەسڵەت و سیما و سیفاتانەی خۆی بە ژانرە نوێیەکە دەبەخشێت. بەو واتایەی دەقێك دەقێکی دیکە بەرهەم دەهێنت و ژانرێك بۆ درێژە دان بە ڕەوتی خۆی، خەسڵەتەکانی لە چوارچێوەی ژانرێکی نوێی دیکە کە دەربڕی بارودۆخەکەیە، دادرێژێتەوە. دیارە ئەم گۆڕانە تەنیا گواستنەوەی خەسڵەت و سیفاتەکان نییە، بگرە برێتییە لە گۆڕینی ناویش و ناوەکەش بەپێی شێوە و پێڕەوی ژانرە نوێیە دادەرێژرێتەوە و مەرجیش نییە لە ناوی ژانری پێشوو نێزیك بێت. بۆ نمونە داستان کە بەشیعر دەهۆنرایەوە گۆڕا بۆ ڕۆمان کە زمانی پەخشان بوو ((داستان لەدەستی بۆرژوازییەکان گۆڕا بۆ ڕۆمان، چونکە لە سەردەمی شۆڕشی پیشەسازیدا شیعر ناتوانێت لەگەڵ ئەو ڕەوتە خێرایەی، کە

---

١- نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد، ئەزموونی خوێندنەوە ـ چەند لاپەڕەیەکی ڕەخنەیی، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی ٢٠٠٦، ل٦٤.

٢- د. عادل گەرمیانی،چەند وانەیەکی بەراوردی ئەدەبی، گۆڤاری ( ڕامان)، ژمارە (١٧١) ئابی ٢٠١١، ل ٥٦.

بورژوازییەکان ئارەزووویان لێی هەبوو هەنگاو بهاوێت. بۆیە پەخشان ئاسانترە و گونجـاوترە بـۆ دەربڕین لەو ژیانەی بۆرژوازییەی کە خێرا و ئالۆزە)) [1].

١- ژانرێك بەمەبەستی دەوڵەمەندکردنی بابەتەکەی و سەرنجراکێشانی خوێنەر، سـوود لـە ژانرەکانی دیکە وەردەگرێت و لەنێو دێرەکانی خۆیدا جێگەیان دەکاتەوە. لێرەدا ناوی ژانرەکـە ناگۆڕێت و هیچ زیادەیەکیش ناخرێتە سەر ناوەکەی، بگـرە هـەر وەکـو خـۆی بەسـەربەخۆیی دەمێنێتەوە هەڵگری ناسنامەی خۆی دەبێت و ئەو دەقانەی کە وەریشگیراوە ئەوانیش هەر بـە چەمك و یاسا و پێڕەوی خۆیان لە بەشێك لە پانتایی ژانرەکەی دیکەدا بەشداری دەکەن. لێرەدا هەموو ژانرەکان بە بێ جیاوازی سوود لە یەکتر وەردەگرن و لە ئاووهەوای یەکـدی هەڵدەمـژن. ئەم پرۆسەیە زیاتر بە دەقئاوێزان ناسراوە، واتە تێکهەڵکێشکردنی نێوان دەقـەکان و تێکـەڵاو بوون و ئاوێتەبوونیان،دیارە ئەمەش لەسەر بنچینەی ئەوەوە هاتووەتە کایـەوە کـە ((مـومکین نییە هیچ دەقێك بێلایەن و پاك بێت، چونکە دەق لە ماهییەتـدا چـەند دەقێکـی پێشـووتری لەخۆگرتووە)) [2] هەروەکو جۆلیا کریستیڤا وای دەبـینێ کـە(( هـەموو دەقێـك برێتییـە لـە تابلۆیەکی زەخرەفەیی ـ فسیفسائی ـ پڕ لە وەرگرتن و هەموو دەقێك گۆاستنەوەی دەقـەکانی دی تێدایە)) [3] بەو واتایەی گشت ژانرە ئەدەبییەکان لـەژێر سـایەی دەقێکـدا کۆبکرێنـەوە. وەکو سوود وەرگرتنی شیعر لە توخمەکانی گێڕانەوە کە لە چیرۆك و ڕۆمانـدا هەیـە، هـەروەها سوود وەرگرتنی شیعر لە ڕەگەزەکانی شانۆ، سوودوەرگرتنی ڕۆمـان و چـیرۆك لـە شـیعر کـە بەشیعرییەتی دەقی ڕۆمان و چیرۆك ناسراوە و.....هتد.

٢ـ ژانرەکان لە ڕێگەی تێکەهەڵکیش و چوونە پاڵ یەکدییەوە، ژانری نوێتر چێ دەکەن، کە هەڵگری یاسا و ڕێسای تایبـەتی خـۆی دەبێـت، لێرەشـدا ژانرەکـان بەشـێك لـە خەسـڵەت و پەسنەکانیان واز لێ دەهێنن، هەروەها بەشێکیش لەو خەسڵەت و پەسنانەیان بۆ ژانرە نوێیەکە دەگوازنەوە، بەو واتایەی ژانرە نوێیەکە بەشێویەکی یەکسان هـەڵگری خەسـڵەت و سـیماکانی ئەو ژانرانە دەبێت، کە دەبنە بنچینەی پێکهێنانی. لێرەشدا ناوەکەش بەهەمان شێوی یەکسان

---

١- حەننا عەبود، لەبارەی مێژووی ڕۆمانەوە، و: عەبدوڵلا ڕەحمان، چاپخانەی منارە، هەولێر،٢٠١٠، ل٢٩،

٢- نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد، ئەزموونی خوێندنەوە ـ چەند لاپەڕەیەکی ڕەخنەیی، ل٦٣.

٣- هەمان سەرچاوە، ل٦٣.

دەبێت و لە ناوی هەردوو ژانرەکە پێکدێت. بۆ نموونە ( ڕۆمانە شیعر، چیرۆکە شیعر، پەخشانە شیعر..... تاد).

٤- سەرەڕای ئەمانەش پێشکەوتنی تەکنەلۆژیا لەبواری گەیاندن و پێوەندییکردن و زانیارییەکانەوە، کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر ئەدەب بەجێهێشتووە. ئەو کاریگەرییە بەشێوەیەکە ڕاستەوخۆ ڕۆڵی لە پۆلێنکردنەوەی ژانرە ئەدەبییەکان و فۆرمە شیعرییەکانیشدا هەبووە، لێرەشدا ناوی ئەو ئامێرە پێشکەوتووەی تەکنەلۆژیایە ڕاستەوخۆ بەشدار دەبێت لەسەر دروستبوون و هاتنەکایەی فۆرمی شیعری نوێ، وەکو (مۆبایلە شیعر) کە دیارە ئامێرێکی تەکنۆلۆژیای پێشکەوتووە توانیویەتی جۆرێك لە شیعر بەرهەم بهێنێت، کە هەڵگری پەسن و خەسڵەتی تایبەتی خۆی بێت، کە (دیارترین و سەرەکیترین ئەدگاری هونەرییانەی (مۆبایلە شیعر) وەك فۆرمێکی شیعری، چڕی و کورتییەکەیەتی))[1]، لە ڕێگەی کورتە نامەیەك بەهۆی مۆبایلەوە لە نێوان تاکەکانی کۆمەڵگە ئاڵوگۆڕ دەکرێن و هەر بەم ناوەش، ناونراوەتەوە.

هەموو ئەوانەی کە باسمانکردن دەربڕی ئەوەن ئەدەب دیاردەیەکی وەستاو نەگۆڕ نییە، بگرە هەمیشە لە گۆڕان و جووڵەدایە. ئەوەی ئێمە لەم لێکۆڵینەوەیەدا مەبەستمانە باسی لێوەبکەین، جۆری سێیەمی شێوەکانی ژانرە ئەدەبییەکانە و لەناو ئەویشدا ڕۆمانە شیعرە.

## باسی دووەم: ڕۆمانە شیعر، چەمك و زاراوە و مەبەست:

ڕۆمانە شیعر ڕاستەوخۆ لە زاراوە ئینگلیزییەکەوە ( Verse Novel)[2] ـەوە وەرگیراوە و برێتییە لە ژانرێك، کە ڕاستەوخۆ واتا بەدەستەوە دەدات و جۆرێك لە جۆرەکانی دەق دەخاتەڕوو و فۆرمێکی دارشتنی هاوچەرخە لەبەردەم نووسەر بۆ ئەوەی بیروڕایەکانی تێدا چڕ بکاتەوە و دەریان ببڕێت و تێیدا چێژێکی دیکە بۆ خوێنەران ئامادەبکات و لە ڕێگەی ئەوە دەقە ئەدەبییەوە پێشکەشیان بکەت.

---

١- د. فوئاد ڕەشید، دەقی ئەدەبی ئەدگار. چێژ. بەها، چاپی یەکەم، چاپخانەی دەزگای ئاراس، هەولێر ٢٠٠٧، ل٧١.

2- Verse novel: From wikipedia. The free encyclopedia. www. En. Wikipedia.org.

**لەڕووی زمانەوانییەوە** ڕۆمانە شیعر وشەیەکی لێکدراوە و لەدوو وشەی سادەی (ڕۆمان ) و (شیعر) پێکهاتووە و بەهۆی مۆرفیمی ناوبەندی(ە) خرانەتە پاڵ یەکتر و بەیەکەوە واتایەکیان دروستکردووە. شیعر ناوە و کۆنترین و دێـرینترین دەربڕینـە، کـە مـرۆڤ پـەنای بـۆ بـردووە و بەمەش شیعر بوو بە ((هونەرێکی جوان کە تـەنیا بـۆ مەبەسـتەکانی ژیـانی ئاسـایی بـەکار نـەدەهات، بگـرە بەشـێوازێکی تایبـەتی و ئامـانجێکی تایبـەتی دەهۆنرایـەوە کـە بـوو بـە کەلەپوورێکی ئەدەبی زیندوو )) [1] ،کە بە درێژایی ڕۆژگار وەکو زمانحاڵێك دەربڕی مەبەست و خولیا و ئارەزووەکانی مرۆڤ بووە لەگشت بوارەکانەوە و ئەم ئەرکەی شـیعریش بارەکـەی بـە شێوەیەك خستووەتەوە، کە لە هەر قۆناخ و سەردەمێکدا لە گۆشەنیگا و ڕوانگەیەکەوە بڕواننە شیعر و بەپێی بارودۆخەکە شیعر بناسێنن، بەمەش دیار دەکەوێت کە مرۆڤ ((پێش پەخشانیش شیعری دەربڕیوە)) [2] و ناسیووە.

ڕۆمانیش دیارە یەکێکە لەو ژانرانەی دەچێتە خانەی پەخشانەوە و لەڕووی سەرهەڵدانییەوە دوای شیعر دێت و هونەرێکی نوێیە و لەجیهانی ئەمڕۆشماندا لە فروانبـوون و تەنینـەوە دایـە. ڕۆمان یەکێکە لە هونەرەکانی گێڕانەوەو لە فەرهەنگی ئۆکسفۆرد بەمشێوەیە پێناسـە کـراوە (گێڕانەوەیەکی پەخشانی خەیاڵ ئامێزە، یان چیرۆکێکە، درێژییەکی دیاریکراوی هەیە، لەوێـدا کەسایەتییەکان و کردەوەکان بەرجەستە دەکرێن، کەوا دەربڕی ژیانی ڕاستەقینەی پێشینە، یان ئێستەیە لەتانوپۆیەکی نیمچە چڕدا دادەڕێژێ) [3]. دیارە خۆبەسـتنەوەمان بـە پێناسـەکردنی ڕۆمان لە چەند دێرێکدا کارێکی نیمچە قورس و زەحمەتە، چونکە ڕۆمان هونەرێکی فرەلایەن و کراوەیە و مامەڵە لەگەڵ زۆربەی ژانـرو هونـەرەکان دەکـات. بۆیـە دەڵـێین ڕۆمـان بـەپێی سەرهەڵدان و ڕۆڵییەوە هونەرێکی سەردەمی و جیهانی ئەمڕۆیە و چێوەیەکی جیوەیی هەیە کە لەگەڵ زۆربەی ژانرەکانی دیکە هەڵ دەکات.

---

١- د. محمد مندور، الأدب و فنونة، الطبعة السابعة، شركة نهضة مصر للطباعة والنشر والتوزيع، قاهرة ـ مصر،٢٠٠٩، ص١١.

٢- ئەحمەد سالار، هونەر و ژیان، چاپی یەکەم، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی ٢٠٠٥، ل١٧٦-١٧٧.

٣- عەبدوڵلا سەڕاج، بەرەو ئاستانەی ڕۆمان و گۆشەنیگاکان، لەبلاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بەخشی سەردەم،٢٠٠٧،، ل.١٠

بەم پێیە زاراوەی ڕۆمانە شیعر دوو هونەری لە قالبێکدا کۆکردووەتەوە و سوودی لە ڕەگەز و بنەما و خەسڵەتەکانی هەردووکیان وەرگرتووە بۆ دروستکردنی هونەرێکی دیکەی نوێ.

**لەرووی زاراوەوە** بۆ ناونانی زاراوەکە و جێگیرکردنی وەکو زاراوەیەکی ئەدەبی، زاراوەی ڕۆمانە شیعر سوودی لە ناوی هەردوو ژانر شیعرو ڕۆمان وەرگرتووە و هەردووکیان لە زاراوەکەدا بەکارهێناوە. دیارە ناونانی دەقێك و کردنی بە زاراوەیەك بۆ جیاکردنەوەی لە دەقەکانی دیکە، پرۆسەیەکە جێگیر و چەسپاوی بەخۆیەوە وەرناگرێت، چونکە ((زاراوەی ژانرەکان لە بارودۆخێکی تێکەڵ دان و تەنیا زاراوەیەك نین بۆ شیکردنەوەیەکی تەواو کە لەدەرەوە ڕا بەسەر مێژووی دەق جێبەجێ بکرێن)) [1]، بگرە ئەم زاراوە هەڵبژێردراوە بەشێك لە سیما و ناسنامەی دەقەکە بەخوێنەران دەناسێنێ و کە ئەمەش خۆی لەخۆیدا ڕەنگدانەوەی لەسەر ناوەرۆکی دەقەکەدا دروست دەکات، واتە زاراوە لەژێر کاریگەریی ناوەرۆکی دەق دێتەئاراوە و لەهەمان کاتدا ناوەرۆکی دەقیش بەدەوری خۆی کاریگەریی لە دانان و هێنانەئارای ئەم زاراوەیە دەگێڕێت. لەڕووی مێژوویشەوە ئەم زاراوەیە بۆ یەکەمینجار ((لە سالآنی سییەکانی ئەم سەدەیەدا لەلایەن ڤەرجینیا وۆلڤ ئاماژەیەکی بۆ کرا، دواتر لە سالآنی شەستەکاندا بەتەواوەتی ئەم زاراوەیە ناسراو چەسپا، کاتێك لە ساڵی (١٩٦٣) ڕەخنەگری ئەمەریکایی ڕالڤ فریدمان پەڕتووکە بەناوبانگەکەی خۆی (The lgrical Novel) بلآوکردەوە)) [2].

دیارە پێشکەوتنی کۆمەڵگە و بوارەکانی ژیان بەتایبەتیش لە ڕووی مەعریفی و ڕۆشنبیرییەوە، ڕۆڵی خۆیان دەگێڕن لە هێنانەئارای زاراوەکانەوە، چونکە زاراوە ئامرازێکە لە ئامرازەکانی بیرکردنەوە و هۆکارێکە بۆ پێشکەوتنی زانستی و ئەدەبی، سەرەڕای هەموو ئەوانەش زاراوە زمانێکی هاوبەشە کە بەهۆیەوە تەواوی خەڵکان لەیەکدی دەگەن، بەتایبەتیش لەنێوان چینێکی دیاریکراو لە بوارێك لەبوارەکانی ژیاندا، کە ئەمەش یەکێکە لە وەزیفەکانی زاراوە خۆی، کە هاوبەشییەك لە تێگەیشتن لەنێوان زمانەکان دێنێتەکایەوە و پردێکی شارستانی لەنێوان زمانەکان دروست دەکات، لەهەمان کاتیشدا وەزیفەی بەردەوامبوون و

---

١- ماری شیفیر، ما الجنس الأدبی، ترجمة: د. غسان السید، ص٥٣ .

٢- محمد عبدالحليم غنيم، الفن القصصی عند فاروق خورشيد، رِسالة دكتوراة، جامعة المنصورة ـ كلية الأداب، قسم اللغة العربية، مصر ٢٠٠١، ص١٤٤.

گەیاندنیش لەنێوان تاکەکانی کۆمەڵ دەگەیەنێت[1]. دیارە لەم ڕوانگەیەوە کە زاراوەکانیش هەڵگری کۆمەڵێك بەها و زانیاریی ڕێکخراو و شارەزاین، هەمیشە پێویستییان بە نوێکردنەوە و پێشخستن هەیە، چونکە پێوەستن بەکەتواری کۆمەڵایەتیی و ڕۆشنبیری و هونەرییەوە، بۆیە دەزگەی زاراوەیی بەپێی ئەم گۆڕانکارییانەی سەرەوە و لەژێر بەرهەمهێنانی دەقە ئەدەبییەکە خۆیدا، زاراوەی نوێ و تازە دادەهێنێت و هەوڵدەدات بەرەو ڕووی جیهانیان بکاتەوە[2].

لەم ڕوانگەیەوە ئێمە وای دەبینین، کە زاراوەی ڕۆمانە شیعر جیا لەوەی بەهۆی پێشکەوتنی بوارەکانی ژیان و کۆمەڵگە هاتووەتە ئاراوە، لە دارشتنی زاراوەکەشدا ڕەنگدانەوەی تەواوی دەقەکەی لەسەرە و لەژێر کاریگەرییەکانی ناوەرۆکی دەقەکەدا ئەم زاراوەیە لەلایەن ڕەخنەگران و نووسەرانەوە هەڵبژێردراوە، چونکە ڕەخنەگران و نووسەران نەیانتوانیوە خۆیان لەوە دەرباز بکەن، کە دەقێکە بەشێك لە خەسڵەتەکانی هەردوو ژانری شیعر و ڕۆمان لەخۆ هەڵدەگرێت، ئەم لەخۆهەڵگرتنەش بەشێوەیەکە دیار و لەبەر چاوانە و یەك ئەوی دیکە تەواو دەکات، چونکە دەق یاساکانی لەزاتیەتی خۆیدا بەرهەم دەهێنێت، نەك لە چەسپاو، یان لە یاساکانی دەرەوە جیهانی دەقەوە. لەژێر کاریگەری ئەمەشدا زاراوەی ڕۆمانە شیعر، کە زاراوەیەکە بەهەمان شێوەی ناوەرۆکی دەقەکە، هەردوو زاراوەی ژانرەکەی لەخۆدا هەڵگرتووە و یاساکانی لەهەناوی تۆخمە پێکهێنەرەکانی ئەم دوو ژانرە داڕێژتووەتەوە.

لەهەمان کاتیشدا خوێنەر کاتێك ڕووبەڕووی ئەم زاراوەیە دەبێتەوە سەرەتا یەکسەر هزری بۆ لای هەردوو زاراوەی شیعر و ڕۆمان دەچێت، نەك زاراوەیەك کە دەقێکی دیاریکراو سکێچ بکات، بەو واتایەی خوێنەر لەگەڵ بینیی ئەم زاراوەیە، هەردوو زاراوەی شیعر و ڕۆمان لە مێشکی ڕەنگدەدەنەوە و لەوێوە هەوڵدەدات سکێچێك لەبارەیانەوە بەرهەم بهێنێت و چوارچێوەیەك بۆ ئەو ژانرە نوێ وتازەیە دابڕێژێت. لەمبارەیەوە د. بوشرا ئەلبوستانی وای دەبینێت، کە زاراوەی ڕۆمانە شیعر کاتێك بەمەبەستی شەرعییەت پێدانی بۆ لێکدانەوە دەخرێتە بەردەم خوێنەرانەوە، خوێنەری ئاسایی لەبەرامبەریدا جۆرێك لە ئیشکالییەت بەرهەم دەهێنێت، سەبارەت بە خوێنەری داهێنەریش زیاتر ئاماژەدانە و بۆ خوێنەری جادیش وەکو

---

١- د.يوسف وغليسى، أشكالية المصطلح، دار العربية اللعلوم ناشرون، بيروت ـ لبنان، ٢٠٠٨، ص ٤٢-٤٤.

٢- أ.د. بشر ى البستانى، الرواية الشعرية و اشكالية التجنيس، www.alnked-aliraqi.net.

هاندەرێك و دنەدانێك دێتە بەرچاو[1] .ئەمەش واتای ئەوە دەگەیەنێت، کە زاراوەکە ڕێگرییەك لەبەردەم خوێنەر دروست دەکات، بەتایبەتیش خوێنەری ئاسایی کە لەسەرەتادا شێوەیەك، فۆرمێك، شێوازێکی دیاریکراو ناتوانێ لە مێشکی خۆی لەبەرامبەر ئەو دەقەی کە لەبەردەمیدایە بکێشێ و ئەو ڕێگرییە خودی زاراوەکە لێی بەرپرسیارە، چونکە زاراوەیەکە دوو ژانری لە یەك زاراوەدا کۆکردووەتەوە، کە هەر یەکێکیان خاوەن پەسن و خەسڵەت و کەسایەتیی سەربەخۆی خۆیەتی، بۆیە کاتێك ئەم جۆرە زاراوانە ڕووبەڕووی خوێنەرێك دەکرێنەوە، زەحمەتە لە چەند چرکەیەکی دیاریکراودا هەموو ئەو ڕەگەزو سیفاتانەی ئەو دوو ژانرە کۆبکاتەوە و لەقالبێکدا لەتەك یەکیان دابنێت و شێوەیەك و فۆرمێکی نوێ لێ بەدی بکات، بگرە لەمبارەدا پێویستی بە کاتێك هەیە تاوەکو مەتنی ئەو دەقە ئەدەبییە نوێیە بخوێنێتەوە، ئینجا بڕیار لەسەر وەرگرتنی شێواز و فۆرمە نوێیەکە بدات.

لێرەشدا لە دانانی زاراوەکە بە بەراورد لەگەڵ زاراوەکانی دیکەی وەکو (شیعر، ڕۆمان، چیرۆك و....هتد) کێشەیەك بەدی دەکرێت، ئەم کێشەیە زیاتر لەوەدایە کە ((زاراوەی ڕۆمانە شیعر بەسروشتی خۆی لە ڕەگەزە ئاساییەکانی شیعر دوور دەکەوێتەوە، چونکە بۆ پێکهێنانی گێڕانەوەیەکی تایبەت بە ڕۆمان، ڕێگەیەك بۆ نوێخوازی شیعر نابڕێت، هەر بۆیە ئەمە کارێکی ئاسۆیی ناخاتەڕوو، بگرە ئەمە کار دەکات بۆ تێکهەڵکێش کردنی هونەرێکی ئاوێتەیی لە شیعر بە هونەرێکی دیکە کە بێبەش نییە لە ئاسۆیی بوونی پێکهێنەر و ڕەگەزو گۆشەنیگاکانی کە ئەویش ڕۆمانە)) [2] بەو واتایەی کێشەکە زیاتر پێوەستە بە کۆکردنەوەی ناوی دوو ژانر لە بۆتەی زاراوەیەکدا کە بۆ ژانرێکی دیکە تەرخان کراوە و خەسڵەت و سیمای پێ بەخشیوە. هەر بۆیەش ڕەخنەگران و لێکۆڵەران بۆ چارەسەرکردنی ئەم ئیشکالە هەوڵیانداوە زاراوەیەك دابهێنن لەم تەمومژ و ئاڵۆزییە بەدوور بێت. لەوانە هەندێکیان زاراوەی (یەکگرتنی دەقەکان) یاخود (کۆکەرەوەی دەق)یان داهێناوە، کە بریتییە لەو دەقانەی زیاتر لە ژانرێك ناوەرۆکەکەی پێکدەهێنێت و لەئەنجامی نەمانی سنووری نێوان ژانرەکانەوە هاتووەتەکایەوە[3] .

---

١- هەمان سەرچاوە.

٢- هەمان سەرچاوە.

٣- محمد علي يوسفى، السرد يتكلم شعرا، www.nizwe.com

هەندێکی دیکـە لـەم ڕەخنـەگرو لێکۆڵەرانـە زاراوەی (نووسـین لەرێگـەی ژانرەکان)یـان دیاریکردووە، بەواتایەی کە لەرێگای ژانری جۆراجۆر و جیاوازەوە، نووسـینێك دێتـەبوون کـە تەواو جیاوازە لەگەڵ خودی ژانرەکان خۆیان[1]. ئەم نووسینەش دەتوانێ خۆی یاسا و پـەیرەوە تایبەتییەکانی خۆی دابرێژێت و لە یاسا و پێڕەوەکانی دیکەی ئەو ژانرانەی کە بوونەتە بنەمای نووسینەکە، جیا بێتەوە و ڕەنگ و شەقڵ و سیما و کەسایەتیی سەربەخۆی خـۆی وەربگرێـت. هەرچەندە ئەم زاراوانە لە چاو زاراوەی ڕۆمانە شـیعر و تـەواوی زاراوەکـانی دیکـەی وەکـو ( چیرۆکە شیعر و پەخشانە شیعر و......) جێگەی خۆیان نەگرت و زیاتر ئەم زاراوانە چەسـپان و ناسران. دیارە لێرەشدا پێویست دەکات ئاماژە بە زاراوەیـەك بـدەین، کـە لەڕواڵەتـدا زۆر لـە زاراوەی ڕۆمانە شیعر نێزیکە، ئەویش زاراوەی ( ڕۆمانی شاعیری)ە. ئەم زاراوەیـە هەرچـەندە لەڕواڵەتدا لە زاراوەی ڕۆمانە شیعر نێزیکە، بەڵام لەناوەرۆکدا جیاوازن، ڕۆمانی شـاعیری بـە زمانی پەخشان دەنووسرێت، کە شیعرییەتی لێ دەچۆڕێتەوە، بەتایبەتیش لەرووی بەکارهێنانی ڕەگەزەکانی شیعری وەکو لێکچوون و خواستن و وێنەی شیعری و...هتد، بەڵام ڕۆمانـە شـیعر گێرانەوەیەکە بەزمانی شیعری دەنووسرێت و جیا لەوەی کە توخمەکانی گێڕانەوەی لەخۆگرتووە و بەزمانێکی شیعریش نووسراوەتەوە[2].

لە ئەدبیاتی ڕۆژهەڵاتدا زاراوەی ڕۆمانە شیعر پایەی خۆی چەسـپاندووە و لای عەرەبـەکان زاراوەی (الروایە الشعریە[3]، القصـە الشـعریە[4]، الروایـە الغنائیـە[5]، قصـیدە الروایـە[6]) بەکاردێت. لە ئەدەبی کوردیشدا زیاتر ڕۆمانە شیعر وەکو زاراوەیـەك چەسـپاوە و ناسـنامە و تایبەتمەندی خۆی وەرگرتووە.

---

١- ريم العيساوى، الشعرية في رِواية كريم معتوق ( حدث في اسطنبول)، www.asdaqa.com

٢- محمد معتصم، الرواية الشعرية، www.alnked-aliraqi.net.

٣- محمد عبدالحليم غنيم، الفن القصصى عند فاروق خورشيد، رِسالة دكتوراة، ص١٤٤.

٤- هەمان سەرچاوە. ص ١٤٤.

٥- د. صلاح الفضل، أساليب السرد في الرواية العربية، مركز الأنماء الحضارى، سوريا ـ دمشق، ٢٠٠٩، ص٩٣.

٦- ئەردەلان شوکر سابیر، تەکنیکی گێڕانەوە لە ڕۆمانە شیعرەکانی (شێرکۆ بێکەس)دا، نامەی ماستەر، زانکۆی سەلاحەدین، کۆلێژی زمان، بەشی زمانی کوردی، هەولێر ٢٠٠٩، ل ١١.

## لەرووی چەمکەوە:

ڕۆمانە شیعر وەکو ژانرێك پێکهاتەیەکی ئاوێتەیی هەیە و لەیەك کاتدا سوود لە بەشە پێکهێنەرەکانی دوو ژانری جیاواز وەردەگرێت. ئەم دوو ژانرە ئەگەرچی لە دابەشکردنی ئەدەبدا سەر بە دوو دنیای جیان، کە ئەوانیش شیعر و پەخشانن و هەر یەکێکیان خاوەن کەسایەتیی و ئەدگار و سیمای خۆیەتی و سنوورێکی تۆخی جیاکەرەوەشیان لە نێوانیاندا هەیە، بەلاّم لەگەلّ ئەوەشدا هەر یەکێك لەمانە بۆ درێژەپێدان بە ژیانی خۆی و ڕێککەوتن و گونجان لەگەلّ گۆڕانکارییەکاندا، دەرگای والاّکردوو بۆ هاتنی بەشێك لە خەسلّەت و مەبەستەکانی ژانری دیکە. بەواتایەکی دیکە پرۆسەی داهێنان لە ئاستی پراکتیکیدا ئاوێتەبوون و تێکەلاّوبوونی ئەم دوو بەشەی سەلماندووە و هەر ژانرێك لەو جوغزە چووتە دەرەوە، کە تەنیا بە ڕەگەز و توخمەکانی خۆیەوە درێژە بە ژیانی بدات، بگرە بۆ ئەم مەبەستە باوەشیان بۆ ڕەگەز و توخمی ژانرەکانی دیکەش کردووەتەوە. بۆیە ((لەو کاتەوەی کە بانگەوازی ئەوە دەکرا کە شیعر و پەخشان لەیەکدی جودا بکرێتەوە، چەند جۆرە ژانرێکی دیکەی فەرعی هاتە کایەوە کە بەشێك خەسلّەتی لە شیعر و بەشێکی خەسلّەتی دیکەشی لە پەخشان وەردەگرێت)) [1] و سنوورەکانی خۆیان دەبەزێنن و پەنا بۆ ناوچەکانی یەکتر دەبەن و جۆرە تێکەلاّوییەك دەهێنە کایەوە. ئەم ئاوێتەبوونەی نێوان ژانرەکانیش((دەقگەلێك بەرهەم دەهێنن کە ئالۆزترین شتە لە ئەدەبدا ناسراو بێت، چونکە هەولّدەدات توانایی لە شیعر و بەردەوامی و درێژەدان لە چیرۆك لەگەلّ یەکتردا کۆبکاتەوە)) [2].

لەم ڕوانگەیەوە شیعر وەکو بەشێکی سەرەکیی لە ئەدەبیاتدا، سنوورەکانی جیاکەرەوەی خۆی تێکشاندوە و بەکارایی بەشداری لەگەلّ هونەرەکانی پەخشاندا کردووە و چەندین فۆرمی تازەی هێناوەتە بەرهەم. لەوانەش سوود وەرگرتن لە ژانری ڕۆمان و کارکردن لەنێو ئەو فەزایەدا، شیعری وا لێکردووە لەگەلّ ڕۆماندا جۆرێك لە نوێگەری و نوێخوازی بەرهەم بهێنێت و دەقێکی دیکە بێنێتەئاراوە کە لە یەکگرتنی هەردوو بەشە سەرەکییەکەی ئەدەبدا پێوەست کرابێت. ڕەنگە شیعر بۆ گەیشتن بەم مەرامەی جگە لە بەرهەمهێنانی ڕۆمانە شیعر بەشێوازی دیکەش لە نێو فەزای ڕۆماندا خۆی بنێوێنێت لەوانەش دەکرێ دەقی شیعری ((تەنیا دەقێك

---

١- محمد معتصم، الرواية الشعرية، www.alnked-aliraqi.net.

٢- أ.د. بشر ى البستاني، الرواية الشعرية و اشكالية التجنيس، www.alnked-aliraqi.net.

بێت  كە پێداویستییەك هێنابێتییە ئاراوە بۆ دەربڕین لـە كـاری  كەسـایەتییەكی ڕۆمانێـك، یاخود وەستانێكە بۆ پشوودان پـێش بەردەوامیـدان بـە گێڕانـەوە، یـاخود گواسـتنەوەیە بـۆ ئاستێكی دیكەی گێڕانەوە و لەوانەشە تەنیا بۆ جوانكاریكردنی فـەزای ڕۆمـان بێـت، ڕەنگـە ببێتە بەشێكی سەرەكیش لە بونیادی گێڕانەوەی ڕۆمان)) [1]، بەو واتایەی كە دەكرێ دەقێكی شیعری لەنێو خودی ڕۆماندا بەدی بكەین، بەڵام ڕۆمانـە شـیعر نـەبێت. لەهـەمان كاتیشـدا ڕۆمانیش بەرۆڵی خۆی وەكو ژانرێك بریتییە لەو دەقە كراوەیەی كـە ژانرەكـانی دیكـەی تێـدا جێدەبێتەوە و ((سوود لە ژانرەكانی دیكەی ئەدەب وەردەگرێ و شێوەیەكی بزۆكی لە هەڵمژینی پێكهاتەی ژانرەكانی دیكەی هەیە)) [2]، واتە ڕۆمان  پرۆسـەیەكە هەمیشـە لـە گۆڕاندایـە و خۆی لەقەرەی ژانرەكان دەدات و هەوڵ دەدات خەسڵەتەكانیان هەڵمـژێت و لـە بۆتـەی خۆیـدا بیانتاوێنێتەوە.  هەر ئەمەشە وای لە میخائیل باختین كردووە ڕۆمان بە كۆرپەلەیەك دابنێـت، كە وەكو ژانرێكی ئەدەبی هێشتا تەواو پێنەگەیشتووە[3].

ئەمەش وای كردووە ڕۆمان هەمیشە ئەو پانتاییە بێت كە ژانرەكانی دیكەی بـە ئاسـانی جێی پێی خۆیانیان تێدا بكەنەوە و لەوێوە سوود لە ژانری ڕۆمان وەربگـرن و لەگەڵیـدا وەكـو هاوبەشێك درێژە بە كارو چالاكییەكانیان بدەن  ( ئەمەش تـەفزیلكردنی ڕۆمـان نییـە بەسـەر ژانرەكانی دیكەی ئەدەبیدا، بەپێچەوانەوە، بگرە كارایی ئەو ژانرە بۆ خودی ڕۆمان و چۆنییەتی ئـەو یاریكردنـەی كارەكتـەرەكانی ڕۆمـان دەگەڕێتـەوە كـە دەتـوانێ پـڕ بەپێسـتی دیـاردەو كارەساتەكان دەربڕینیان لێ بكات و بەو ئاقارانەیشی دا ببـات كـە هـەموو تاكێـك دەتـوانێ پانتایی شوێن پێی خۆی لەو هەنگاوانە دیاری بكات كە دەتوانێ بەردێ بخاتە سەر تەلارێك كە ڕۆمان وەكو ئەرك دەیخـات ڕوو) [4]. هـەر لەبـەر ئەمەشـە لـەبارەی ڕۆمـان وتـراوە (ڕۆمـان

---

١- رِيم العيساوي، الشعرية في رِواية كريم معتوق ( حدث في اسطنبول)،  www.asdaqa.com

٢- هێمن عومەر خۆشناو، شیعرییەتی دەقی چیرۆكی كوردی، چاپخانەی ڕۆشنبیری، هەولێر ٢٠١٠، ل٥٣.

٣- العربي بنجلون، اشكالية التجنيس الروائي عند باختين، www. Alrewaia.com.

٤- شوكر سلێمان حەمەد، پاڵەوان لە ڕۆمانی ئێستای كوردیدا،  گۆڤاری كاروان، ژمارە (١٧٢) نیسانی ٢٠٠٣. ل ٢٢.

توورەکەیەکی فووداره هەموو شتێك لەخۆ دەگرێت)[1]، چونکە ڕۆمان هەموو دیاردە و ڕووداوە جۆراجۆرەکان لەباوەشی خۆیدا کۆدەکاتەوە و لێیان دەدوێت. ئەم خەسڵەتەش بـۆ شـیعر لەبـەر سنوورداربوونی پانتاییەکەی و کورتبوونی سەختە، بۆیە پەنای بۆ توخم و ڕەگـەزەکانی ڕۆمـان بردووە. ئەم دەرگە کرانەوەی ڕۆمانیش وەکو ژانرێکی زیاتر لەگەڵ ئـەو سـتراتیژییەتەی شـیعر لەمێژوودا وەکو یەکەم ژانرێك کە کاریگەرییەکی بێ وێنەی لەسەر مرۆڤ دروستکردووە، و بـۆ بەردەوامیدان بە سیحر و ورووژاندنەکانیدا یەکانگیر بووە. لەم ڕووە ئاساییە ئەم دوو ژانرە لەم ئاستەدا لەهێڵێك لە هێڵەکاندا یەکبگرن و ژانرێکی دیکـە بهێننـە کایـەوە، کـە بنـەماکانی لەسەر بنچینەی خەسڵەتەکانی خۆیان بۆ دیـاری کردبێـت. دیـارە ئـەم تێکچـراژانە و ئاوێتـە بوونەی نێوان ڕۆمان و شیعر لە دوو ئاستدا یەکیان گرت[2]:

ئاستی یەکەم: ئاستی ئاوێتەبوونی نێوان دەقەکان لەیەك ژانری ئەدەبیـدا، کـە ئەمەشـیان زیاتر دەچێتە دەق ئاوێزانەوە، واتە دەقێك سوود لە تێکهەڵکێشکردنی دەقی دیکـەی ببینێـت بۆ دەوڵەمەندکردنی دەقە سەرەکییە، کە هیچ لە پێکهاتە و پەسن و خەسڵەتەکانی ناگۆڕێت و تەنیا وەکو بەشدارێك، بەشداری لە داڕشتنی دەقەکەدا دەکات.

ئاستی دووەم: ئاوێتەبوونی نێوان ژانرە جیاوازەکانەوە، ئەمەش زیاتر لەگەڵ مەبەستی ئێمە دێتەوە و برێتییە لە یەکگرتن و تێکچراژانی نێوان ژانرەکـان و هێنانـە ئـارای دەقـی نـوێتر و ژانری نوێتر بە سوود وەرگرتن لە خودی خەسڵەت و سیمایەکانی ئەو ژانرانەی کـە ڕۆڵیـان لـە دروستکردنیدا هەیە.

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە شیعر و ڕۆمان لەو بەشدارییەیانەدا، بەدوو جۆر کارو چالاکی دەنوێنن، جۆرێکیان ناوخۆییە و هەر یەکێکیان بەبێ ئەوەی ناسنامەی خۆی تێدا بزر بکـات و هێڵە گشتییەکانی خۆی بشێوێنێت، سوود لە بەشێك لـە خەسـڵەتەکانی ژانـری ئـەوی دیکـە وەردەگرێت و لەنێو مەتنی دەقەکەیدا بەکاری دەهێنێـت. جۆرەکـەی دیکەشـیان دەرەکییـە و هەردووکیان کار لەیەکتری دەکەن و بەشێك لە خەسڵەتەکانیان بۆ دروستکردنی دەقێکی دیکـە

---

١- عەلی لفتە سەعید، بنەماکانی پێکهاتەی ڕۆمان لەنێوان تازەگەری و لاساییکردنەوەدا، و: محەمەد کەساس، گۆڤاری ڕامان، خولی دووەم، ساڵی دووەم، ژمارە (٩٩) ئابی ٢٠٠٥. ل ١٢٤.

٢- د. مصطفی الضبع، تداخل العالم / تداخل النصوص، www. Alrewaia.com.

بەکار دەخەن و لەم پێناوەشدا ناو و زاراوەی خۆشیان ڕەنگە ڕووبەڕووی گۆڕان ببێتەوە. وەکو لە ڕۆمانە شیعردا بەرچاو دەکەوێت.

ئەم بارودۆخەش کاریگەرییەکی زۆری لەسەر خودی ژانری ڕۆمانە شیعر دروست کردووە و لەلایەن پێکۆڵ و ڕەخنەگرانەوە، لەبارەی چەمکی ئەم ژانرەوە گەلێك ڕاوبۆچوونی جیاواز هاتووەتەکایەوە، د. بوشرا ئەلبوستانی لە لێکۆڵینەوەکەیدا بەناونیشانی (ڕۆمانە شیعر و ئیشکالییەتی بە ژانرکردن)دا لەشێوەی پرسیارکردندا ئەم کێشەیە دەورووژێنێت و دەڵێت ((ئایا ڕۆمانە شیعر ژانرێکی ئەدەبی نوێیە یاخود ڕەنگێکە یان جۆرێکە لە بازنەی بە ژانرکردنی ڕۆمان دەخولێتەوە)) [1]. لەم ڕووەوەش هەندێك لەم ڕەخنەگر و لێتۆژانە ڕۆمانە شیعر وەکو بەشێك لە شیعر تەماشا دەکەن و بە جۆرێك لە جۆرەکانی شیعری دەخوێننەوە و هەندێکیشیان لەخانەی ڕۆماندا جێگەی دەکەنەوە و وەکو جۆرێك لە جۆرەکانی ڕۆمان لەقەڵەمی دەدەن، هەندێکی دیکەشیان وەکو ژانرێکی سەربەخۆ ساتوسەودایی لەگەڵ دا دەکەن.

لەم ڕوانگەیەوە میخائیل باختین وەکو جۆرێك لە جۆرەکانی ڕۆمان مامەڵەی لەتەکدا کردووە و بەلای ئەوەوە ئەم فۆرمە ((بۆ دینامیکییەتی ڕۆمان دەگەڕێتەوە، چونکە لەلایەکەوە ژانرێکی سەربەخۆی پەخشانە، لەلایەکی دیکەشەوە هەندێك دەقی ڕۆمانە شیعریش دەبینین، کە خاوەن چەند ئاستێکی جۆراجۆرن و خاوەن دیدگای جیاوازن لە خستنەڕووی بابەتەکانیان و هەروەها لە فۆرمە هونەرییەکەشیان)) [2]. لێرەدا باختین جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە ڕۆمان لە چەند ئاستێکی جۆراجۆر فۆرمی هونەری جۆراجۆرەوەش بابەتەکانی دەخاتەڕوو، کە ڕۆمانە شیعریش یەکێکە لەم ئاستە جۆراجۆرانە.

محەمەد عەبدولحەلیم غونیم ئەوە ڕەت دەکاتەوە، کە ڕۆمانە شیعر ژانرێکی سەربەخۆ بێت و بە فۆرمێك لە فۆرمەکانی ڕۆمان لە قەڵەمی دەدات و دەڵێت:(( ڕۆمانە شیعر لەخۆیدا ژانرێکی سەربەخۆ نییە، بگرە فۆرمێکە لە فۆرمەکانی ڕۆمانی هاوچەرخ و پێوەستە بە نوێخوازی ڕۆمانەوە)) [3]. بەمەش نووسەر ڕۆمانە شیعر بەتەواوەتی لە قالبی ئاوێتەیی شیعر

---

١- أ.د. بشر ى البستاني، الرواية الشعرية و اشكالية التجنيس، www.alnked-aliraqi.net.

٢- العربى بنجلون، اشكالية التجنيس الروائي عند باختين، www. Alrewaia.com.

٣- محمد عبدالحليم غنيم، الفن القصصى عند فاروق خورشيد، رِسالة دكتوراة، ص١٤٤.

و ڕۆمان دوور دەخاتەوە و تەنیا لە یەك حاڵەتدا ڕۆمانە شیعر پێوەست بە شیعر دەكاتەوە، كە ئەویش بەكارهێنانی زمانی شیعری و تۆپۆگرافیای شیعرییە لە ڕۆمانەكەدا.

هەروەها (د.عەبدوڵا ئەلفیفی)یش ڕۆمانە شیعر بۆ ڕۆمان دەگەڕێنێتەوە و پێی وایە كە ڕۆمانە شیعر ((خاوەن ناسنامەیەكی تەواوی ڕۆمانە و تەنیا ئەوەیە كە شیعری بۆ مەبەستەكانی ڕۆمان بەكارهێناوە)) [1]. هەر لەم ڕوانگەیەشەوە د. عەبدوڵا ئەلفیفی زاراوەی ڕۆمانە شیعر بە هەوڵێكی جوداكردنەوە لە ڕۆمانی پەخشانی ئاسایی لەقەڵەم دەدات و پێی وایە كە ئەم زاراوەیە هیچ جیاوازییەكی نییە لەگەڵ جۆرەكانی دیكەی ڕۆمان وەكو ( ڕۆمانی پۆلیسی، ڕۆمانی سەركێشی و...هتد) [2].

لەبەرامبەردا لێكۆڵەری عەرەب عەبدوڵڵا شریق بەتوندی ڕۆمانە شیعر و پەخشانە شیعر ڕەت دەكاتەوە، بەو پێیەی كە ئەمانە دوو ژانری دژ بەیەك لە بۆتەیەكدا كۆدەكەنەوە، بۆیە دژی ئەوە ڕادەوستێت كە ئەم ئەزموونانە لە خانەی ڕۆمان لە قەڵەم بدرێن و پێی وایە ئەم ئەزموونانە گۆڕانێكن لە گۆڕانەكانی شیعری عەرەبی هاوچەرخ. هەر لەم چوارچێوەیەشدا زاراوەی (ئەزموونی تازەی شیعری) لەجیاتی زاراوەی ڕۆمانە شیعر و پەخشانە شیعر بەكاردەهێنێت، هەر بۆیە ڕەخنەگر ((لە ناوەوەی ژانری شیعریدا جووڵە دەكات و پێی وایە، كە ئەم بەرهەمە تازەیە جۆرێكە لە جۆرەكانی شیعر و یەكێكە لە گۆڕانەكانی ))[3]. بەواتایەی كە ئەم ئەزموونە بەشێكی دانەبڕاون لە ئەزموونی خودی شیعر بەگشتیی و وەكو ئاستێك لە ئاستەكانی شیعری مامەڵەی لەتەكدا دەكات.

لەگەڵ ئەوەشدا هەندێك لەشاعیران و ڕۆماننوس و ڕەخنەگران هەرچەندە ڕۆمانە شیعر لە خانەی ڕۆمان دادەنێن، بەڵام كاریگەریی شیعریشی لەسەری ڕەتناكەنەوە، لەوانە شاعیری عەرەبی نزار قەبانی وا دەبینێت كە ڕۆمانە شیعر ((ڕۆمانێكە بە بارانی شیعر شوراوەتەوە))[4]، بەو واتایەی كە ڕۆمانە شیعر ڕۆمانە، بەڵام كەوتۆتە ژێر كاریگەریی خەسڵەتەكانی شیعرەوە. هەروەها د.مەحمود ئەلزەبع ڕای وایە، كە ڕۆمانە شیعر بۆ خودی

١- د. عبداللة الفيفي، تداخل الأجناس في بلاغيات النص المعاصر، www.faifi.ws.com

٢- هەمان سەرچاوە.

٣- د.جميل حمداوي، قصيدة النثر أو شعر الانكسار، www.ofouq.com

٤- ريم العيساوى، الشعرية في رِواية كريم معتوق ( حدث في اسطنبول)، www.asdaqa.com

ڕۆمان دەگەڕێتەوە، بەڵام نەك بەگوێرەی پێکهاتەی گێڕانەوەی ڕووت، بگرە بە شیعر بارگاوی کراوە و بەشێوەیەك تێکەڵی یەکدی بوونە کە لێککردنەوەیان سەختە[1].

هەر لەم چوارچێوەیەشدا هەندێکی دیکە ڕۆمانە شیعر بە جۆری سێیەمی ئەدەبی لەقەڵەم دەدەن، بەو پێیەی کە ئەدەب لە دوو بەشی سەرەکیی پێکدێت ئەوانیش شیعر و پەخشانن، لەمبارەیەوە ئیبراهیم یوسف دەڵێت: ((ئەگەر ئەدەب دابەش کرابێت بۆ شیعر و پەخشان و تێیدا شیعر مەرجی خۆی هەبێت و پەخشانیش هەروەها، ئەوا ژانرێکی ئەدەبی سێیەم هەیە کە نە شیعرەو نە پەخشان، بگرە لەیەك کاتدا بەشێوەیەکی ئەندازەییی و خۆشی دەستەواژە و پەخشکردنی خەیاڵ و جوانی وێنە هەردووکیان کۆدەکاتەوە، بەمەش کۆمەڵێك مەرجی بۆ دێتەئاراوە کە بەیەکجار لە ژانرێکی ئەدەبی کۆنابێتەوە)) [2]، لێرەدا نووسەر پێی وایە ڕۆمانە شیعر خۆی لە خۆیدا لادانێکە لەو دابەشکردنەی ئەدەب و ژانرێکی سەربەخۆیەو خاوەن کەسایەتیی و تایبەتمەندی خۆیەتی و جیاوازە لە ژانرەکانی دیکەوە.

لەهەمان کاتدا محەمەد جابر ڕای وایە ئەم جۆرە ئەزموونانە دەچنە خانەی (ناژانریی) واتە لە سنووری ژانر دەچنە دەرەوە و بازنەی پێناسەی جۆرەکانی ئەدەبی دەبەزێنن و زیاتر لە چوارچێوەی (دەق) وەکو کائینێکی سەربەخۆ خۆیان دەنوێنن ((زاراوەی ناژانری هەموو بەرهەمێك دەگرێتەوە کە ئارەزووی گۆڕان و تێپەڕاندن و دزەکردنێکی بەردەوام دەکەن بۆ هەر هەوڵێك کەدەیەوێت دەق لە ئاستی (فۆرم ـ بابەت) بەهێڵێتەوە، چونکە لەوانەیە بابەت لەگەڵ فۆرم بەریەك بکەون و کاری لێدەکات و هزری نوێ دەخوڵقێنێت، بۆیە فۆرمی نوێ فۆرمی کۆن تێکدەشکێنێت و تێیدەپەڕێنێت یاخود ئاوێتەیەك لەنێوان فۆرمەکان ( دوو فۆرم یاخود زیاتر) دێنێتەکایەوە)) [3]. بەم پێیەش ڕۆمانە شیعر لە خانەی ژانری ئەدەبی دەهێنرێتە دەرەوە و دەکرێتە دەقێك کە کۆکەرەوەی ژانرەکانی دیکە بێت.

---

١- د. محمود الضبع، تشكلات الشعرية الروائية، www.alrewaia.com

٢- ابراهيم اليوسف، الجنس الأدبی الثالث، www.Ar.soparo.com

٣- محمد جابر، نصوص بشار عبداللة قراءة تأويلية في نسق الرواية الشعرية، www.pulpit.alwatanvoice.com

شایانی باسە لە ڕۆژئاوا ڕۆمانە شیعر لە دایکبووە و هەر لەوێش گەشەی کردووە و یاسا و ڕێساکانی داڕێژراوە، بۆیە لای ئەوان ڕۆمانە شیعر بە ژانرێکی سەربەخۆ داندراوە و پێوەندیی نێوان ڕۆمان و شیعریش ڕێکخراوە و لەچوار ئاراستەی سەرەکیدا کۆکراوەتەوە[1]:

١ـ ئاراستەی مێژوویی بۆ قۆناخەکانی ڕۆمانی هاوچەرخ کە ئەلبرێس ڕیتی ماریل نوێنەرایەتی دەکات.

٢ـ ئاراستەی جۆرایەتی لە پێوەندیی نێوان شیعر و ڕۆمان و لایەنە هاوبەش و ناکۆکەکانی نێوانیان، ئەم ئاراستەیەش هنری بونای نوێنەرایەتی دەکات.

٣ـ ئاراستەی ڕەشبینی، بەو پێیەی کە ڕۆمان لە کەتواریەتەوە بۆ گۆڕانی ئامێز گۆڕاوە کە میشال ڕیمۆن نوێنەرایەتی دەکات.

٤ـ ئاراستەی هونەری، کە لە پێکهاتەی ڕۆمانە شیعردا لە شێواز و بونیادا خۆی دەبینێتەوە کە جۆن ئیڤ تادییە نوێنەرایەتی دەکات.

لەم ڕووەوە لە چوارەم ئاراستە، کە ئاراستەی هونەرییە پتر کار لەسەر ڕۆمانە شیعر کراوە و لەلایەن جۆن ئیڤ تادییە ڕێسا و یاساکانی بۆ دیاریکراوە و سەربەخۆیی بۆ ئەم ژانرە دەستەبەر کردووە، ئەوەشی ڕوون کردووەتەوە، کە ڕۆمانە شیعر لایەنی چیرۆکی لە ڕۆماندا لەخۆگرتووە وەکو ئەو کەسایەتییانەی کە ڕووداوەکان لە شوێنێك لە شوێنەکان و لە کاتێك لە کاتەکاندا بەڕێوە دەبەن، لەهەمان کاتیشدا ڕێوشوێنی شیعریش لە زمان و شێوازەکانیدا دەگرێتە بەر [2]. بەمەش ئەو فۆرمە جۆرێك لە تایبەتمەندی لەخۆ دەگرێت و پێی دەناسرێتەوە، بۆیە بەڕای ئێمەش ئەم فۆرمە ژانرێکی سەربەخۆیە و سیما و تایبەتمەندی دیاریکراوی خۆی هەیە و بەشێك لە ئەدەبی گەلان پێکدەهێنێت، چونکە هەر فۆرمێکی ئەدەبی خاوەن کەسایەتی و تایبەتمەندی خۆی دەبێت، بەتایبەتیش گەر ئەو فۆرمە تازەییەك لەخۆیدا بنوێنێت، کەدیارە بەگوێرەی ئەو تازەییە خەسڵەت و سیمای تایبەتی دیاریکراوی خۆی دەبێت، چونکە(( تێکەڵکردنی دوو ژانری ئەدەبی، یان زیاتر کار دەکاتە سەر بونیادی پێکهاتەی دەقەکە و بەجۆرێك لە ڕێڕەو و بارە ئاساییەکەی خۆیان دەردەچن و لە تێکەڵ بوون و ئاوێتە بوونەکەدا، شێوازێکی جودا دێتەکایەوە، کە بەشێك لە پێکهاتەکانیان لەنێو دەچن و هەندێ پێکهاتەی

١- ریم العیساوی، مفهوم الشعریة في النص الروائي، www.alexandrie.yoo7.com

٢- هەمان سەرچاوە.

تازە دروست دەبنەوە))[1] و ئەم پێکهاتە تازانەش کرۆکی سیما و خەسڵەتەکانیانن و هەوێنی دروستکردنی ناسنامەی تایبەتی ئەو فۆرمە تازەیە پێکدەهێنێت.

## باسی سێیەم: مێژوو و خەسڵەت و جۆرەکانی ڕۆمانە شیعر

ڕۆمانە شیعر بەگوێرەی سەرهەڵدان و گەشەکردنییەوە، وەکو ژانرێکی گرینگی ئەدەبی لەلایەن ڕەخنەگر و توێژەرانەوە خراوەتە بەر نەشتەرگەری و شرۆڤەکردنەوە و هەوڵیانداوە مێژووی سەرهەڵدان و هۆکار و بارودۆخەکەی ڕوون بکەنەوە و هەروەها پێکهاتە هونەرییەکەی شەن و کەو بکەن و لەوێشەوە هەوڵیانداوە خەسڵەت و جۆرەکانی تێدا ڕوون بکەنەوە، لەم تۆژینەوەیەدا ئێمە هەوڵ دەدین تیشك بخەینە سەر مێژوو و خەسڵەت و جۆرەکانی ڕۆمانە شیعر و لە چوارچێوەی زانستیدا ڕوونیان بکەینەوە.

**مێژووی ڕۆمانە شیعر:** ڕۆمانە شیعر وەکو پێکهاتە، کۆکەرەوەی دوو ژانری سەرەکییە ئەوانیش شیعر و ڕۆمانن، ئەگەر چی ماوەی سەرهەڵدانی نێوان ئەم دوو ژانرش زۆر لەیەکدی دوورن، بەڵام بەهۆی خەسڵەت و سیماکانیان پێوەندییان دروستکردووە وبەیەکەوە قالبێکیان بۆ ئەو پێوەندییە دۆزیوەتەوە و تێیدا ژانرێکی تازەیان ڕاگەیاندووە. دەستنیشانکردنی مێژووی ئەو ژانرە نوێیەش ڕاستەوخۆ بۆ سەدەی نۆزدەهەم دەگەڕێتەوە کاتێك نووسەری گەورەی ڕووسیا (ئەلیکساندەر پۆشکین) ڕۆمانە شیعری یەڤگینی ئۆنیگن (Eugene Onegin 1823-1831) نووسی کە ئەم بەرهەمەش (( ڕۆمانە شیعرێکی کەتوارییە و لوتکەی بەرهەمە ئەدەبییەکانی پۆشکینە و ماوەی نووسینی هەشت ساڵی پێچووە ))[2]، دیارە ئەمە لەرووی مێژووییەوە بەیەکەم ڕۆمانە شیعر دەدانرێت و دەچێتە خانەی ڕۆمانە شیعری کلاسیکی، بێگومان ئەو هەوڵەی پۆشکین دواتر ڕێچکەی گرت و بە ژانرێکی نوێ هاتە ناسین. پۆشکین جگە لە نووسینی شیعر، شانۆنامە و ڕۆمانیشی نووسیوە و هەر بۆیە بە یەکێك لە شاعیرە گەورەکانی ڕووسیا لەقەڵەم دەدرێت و هەر لەسەر دەستی ئەویش ڕۆمانە شیعر وەکو ڕێباز و ژانرێکی تازە دێتە ئاراوە. ڕۆمانە شیعری یەڤگینی ئۆنیگن کە پۆشکین ماوەی هەشت ساڵ خەریکی نووسینی بووە و سەرەتا (( بە زنجیرە لەنێوان ساڵانی ١٨٢٥ -١٨٣٢ لەگۆڤارەکاندا بلاوکراوەتەوە، وەکو

١- هێمن عومەر خۆشناو، شیعرییەتی دەقی چیرۆکی کوردی، ل٥٤.

٢- سالم سیف الجابر، امیر شعراو ورسیا: الکسندر بوشکین، www.alsakher.com .

پـەڕتووکێکی سـەربەخۆش لـە سـاڵی ١٨٣٣ چـاپکراوە)) [١] و ئـەم ڕۆمانـە لـە چـەند کەسایەتییەکی سەرەکیی پێکهاتووە لەوانە یەڤگینی ئۆنیگن کە لاوێکـە بایـەخ بـە ژیـانی کۆمەڵایەتی دەدات و هەروەها ڤلادیمێر لانسکی کە شاعیرێکی ڕۆمانسییە، هـەردوو خوشـك تاتیانا و ئۆلگا لارین، لەگەڵ کەسایەتییەکی شاراوە و ئامادە کە ئەویش کەسایەتیی نووسـەر خۆیـەتی. ئـەم ڕۆمانـە شـیعرە بـاس لـە کەسـایەتیی یـەڤگینی ئـۆنیگن دەکـات کـە بـە پەروەردەیەکی فەرنسییەوە گەورەکراوە وکەسـایەتییەکی بـەگومان و تـەماعکار و یـاخی لـە ژیانی کۆمەڵگەیەکەیەتی، کاتێك لەناکاو دەوڵەمەند دەبێت و میراتی مامی بۆ دەمێنێتـەوە، ناچار دەکرێ کە سان بێترسپۆرك بەجێ بهێڵێت و بچێتە گوند بژیت و لەوێش لانسـکی شـاعیر دەناسێت و بەیەکەوە هاتوچۆنی ماڵە خەزوورانی لانسکی لارین دەکـەن کـە دوو کچـی هەیـە تاتیانا کەکچێکی ڕۆمانسی ڕەشبینە و ئۆلگا کە دەستگیرانی لانسکی شاعیرە. لـە ئـەنجامی ئەو یەکترناسین و هاتوچۆکردنە تاتیانا دڵگیری یەڤگینی دەبێت،بەڵام ئەو ئـەم خۆشەویسـتییە ڕەتدەکاتەوە وداوای لێ دەکات بەدوای ئارەزووەکانی نەکەوێت و لەهەمان کاتیشـدا یـەڤگینی خۆی ئارەزووی لە ئۆڵگایە و بەدواویەتی و کاتێك لانسکی بەمە دەزانێت، بـەرگری دەکـات و زۆرانبازی لەگەڵـدا دەکـات و لەئەنجامـدا یـەڤگینی لانسـکی شـاعیر دەکوژێـت، دوای ئـەم تراژیدیایە یەڤگینی سەری خۆی هەڵدەگرێت و لەشاران و وڵاتان دەگەڕێت ودوای چەند سـاڵێك دەگەڕێتەوە سان پترسپۆرگ و تاتیانا دەبینێتەوە کە شووی بە ژەنەراڵێك کـردووە، ئـەو کاتـە هەستی بە خۆشەویستی بەرامبەری کرد، هەرچەندە تاتیاناش ئەوەی نەشـاردەوە، کـە هێشـتا خۆشی دەوێت، بەڵام پێشی ڕاگەیاند کە ناتوانێت خیانەت لـە مێردەکـەی بکـات و گـوێ بـە دەنگی سۆزی نادات[٢]. لێرەدا پۆشکین دەیەوێت ئەوەمان پێ بڵێـت کـە یـەڤگینی گەنجێکـە خـاوەن ڕۆشـنبیرییەکی بـەرزە، بـەڵام ناتوانێـت بـەو ڕۆشـنبیرییە پێگەیـەك بـۆ خـۆی لـە کۆمەڵگەیەکەی بەدەست بهێنێت، بگرە بۆ بەدەستهێنانی ئەم پێگەیە پـەنا بـۆ بـەکارهێنانی هێز دەبات. لێرەدا پۆشکین وێنەی بارودۆخی ژیانی ئەوسای کۆمەڵگەی ڕوسیمان بۆ دەکێشێت و لایەنە سیاسـی و کۆمەڵایـەتیی و کلتورییـەکانی ئـەو کۆمەڵگەیـەمان بـۆ بـاس دەکـات. بیلنسکی لەبارەی ئەم ڕۆمانەوە دەڵێت ((ڕۆمانە شیعری یڤگینی ئۆنیکن بـە بـێ خەوشـترین

---

١- ئەردەلان شوکر سابیر، تەکنیکی گێڕانەوە لە ڕۆمانە شیعرەکانی (شێرکۆ بێکەس)دا، نامەی ماستەر،ل٨.

٢- جبور عبدالنور، المعجم الأدبی، دار العلم للملایین، بیروت ـ لبنان، ٢٠٠٥، ص٤٠٥-٤٠٦.

کارەکانی پۆشکین و بە ئازیزترین ڕۆڵەکانی خەیاڵی لای دڵی دادەنرێ، پۆشکین سەرانسەری ژیان و گیان و، خۆشەویستی خۆی خستۆتە چوارچێوەی ئەم ڕۆمانەوە و، هەموو هەست و، بۆچوون و، ئایدیای خۆی تێدا داناوە)) [1]، هەروەها بێلنسکی ئەم ڕۆمانەی بە ((ئینسکلۆپیدیای ژیانی ڕووس دادەنێت)) [2]. دیارە هەر ئەم بایەخ و گرینگییەی ئەم ڕۆمانە شیعرەش وای لەگەڵێك لە دەرهێنەر و شانۆنامەنووس کردووە کە سوودی لێ وەربگرن و بیگۆڕن بۆ فیلم و شانۆ، لەوانە (مارتا فاینس)ی دەرهێنەر ئەم ڕۆمانە شیعرەی بۆ فیلمێك بە زمانی ئینگلیزی گۆڕیوە و برایەکەی (ریف فاینس) ڕۆڵی سەرەکیی لەم فیلمەدا گێڕاوە. هەروەها لەلایەن خۆیەوە(جایکۆفسکی)یش ئەم ڕۆمانە شیعرە دەکاتە ئۆپێرایەکی گرینگ و پڕ بایەخ[3]. پۆشکین جگە لەم بەرهەمەی، دوو بەرهەمی دیکەی ڕۆمانە شیعریشی نووسیوە ئەوانیش (قەرەج) لەساڵی (١٨٢٤)دا کە ماوەی دووساڵ خەریکی نووسینی بووە و بەرگریکردنێکی بێ وێنەیە لە ژیانی ئازاد و باس لە نێزیکایەتی مرۆڤ لە سروشت دەکات، بەو پێیەی کە تاکە ڕێگەی ڕزگاربوونیەتی. ڕۆمانە شیعرەکەی دیکەشی بریتییە لە (سوارچاکی برۆنزی) کە لەساڵی (١٨٣٣)دا نووسیویەتی و پۆشکین بیرۆکەی ئەم ڕۆمانە شیعرەی لە پەیکەری پوترسی گەورە کە لە گۆڕەپانی ئەنجومەنی پیران لە پێترسپۆرگ داندرابوو وەرگرتووە، چونکە پۆشکین زۆر بەم قەیسەرە سەرسام بووە. ئەم بەرهەمەشی بەیەکێك لە پڕ بایەخترین ڕۆمانە شیعری لەقەڵەم دەدرێت و تێیدا تیشك دەخاتە سەر کاروکردەوەکانی پەتروسی گەورە کە هەوڵیدەدا ژیانی شارستانی و مەدەنی ڕۆژئاوا لە ڕووسیادا جێگیر بکات. نووسەر لەم ڕۆمانە شیعرەدا کاریگەرییەکانی ئەم هەوڵەی لەسەر هاوڵاتیانی ڕووس و ئەنجامە باش و تراژیدیاکانی لەسەر کۆمەڵگەی ڕووسی شیکردووەتەوە[4].

لە دوای پۆشکین، نیکۆلای گۆگۆڵی گەورە شاعیری ڕووسیا بە ڕۆمانە شیعر دەست بە ژیانی ئەدەبی خۆی دەکات، کاتێك لە ساڵی ( ١٨٢٧) یەکەم بەرهەمی خۆی کە ڕۆمانە شیعرێکە

---

١- س. م. پێترۆڤ، ئەلێکساندەر سێرگێییێفیچ پۆشکین (( ژیان و بەرهەمی شاکاری))، وەرگێڕانی: محەمەدی مەلا کەریم، چاپخانەی (الحوادث)، بەغدا ١٩٨٣، ل١٠٢.

٢- سالم سیف الجابر، امیر شعراو ورسیا: الکسندر بوشکین، www.alsakher.com

٣- هەمان سەرچاوە.

٤- هەمان سەرچاوە.

بەناوی (هانس کیوهیل هارتن) دەنووسێت  و لەساڵی (١٨٢٩) چاپ و بڵاوی دەکاتەوە، بەڵام ئەم ڕۆمانە شیعرە هیچ  دەنگدانەوەیەکی لەلایەن خوێنەرانەوە نەبووە، بگرە بە پێچەوانەوە گۆگۆڵ کەوتە بەر هەڵمەتی تانە و تەشەر، هەر بۆیە گۆگۆڵ هەموو دانەی پەرتووکەکەی کڕیوەوە و سووتاندویەتی[١].  لەگەڵ ئەوەشدا گۆگۆڵ ڕۆمانە شیعرێکی دیکەی نووسی بەناوی (دەروونە مردووەکان) کە لەسێ بەش پێکهاتبوو و  ماوەی (١٥)ساڵ خەریکی نووسینی بوو، بەشی یەکەمی لەساڵی (١٨٤٢) بڵاوکردەوە و لەدوای چەند ساڵێکی دواتریش  بەشی دووەمی بڵاوکردەوە، کە تەواو نەکرابوو، هەرچی بەشی سێیەمیشە، دوای ئەوەی کە گۆگۆڵ دووچاری نەخۆشی عەسەبی و دەروونی بوویەوە، سوتاندی. گۆگۆڵ لەم بەرهەمەیدا هەوڵیداوە وێنەی کۆمەڵگەی ڕوسیای بکێشێت و کەسایەتیی هاوڵاتیی ڕووسی لەو بەهرەیەی کە هەیەتی و هەروەها لەو خراپەو کەموکورپیانەی، کە لە خەڵکانی دیکەی جیای دەکاتەوە ئاشکرا بکات. هەرچەندە نووسەر لەم ڕۆمانە شیعرەدا زیاتر پێداگیری لەسەر پیشاندانی لایەنی خراپە و کەموکوڕییەکان دەکات، بەتایبەتیش لەبەشی دووەمیدا، کە وێنەی یەکێك لە دەرەبەگە بچووکەکان دەکێشێت بەوەی کە دەیەوێت بە زووترین کات و بەهەر ڕێگەیەك بێت  دەوڵەمەند ببێت و لەم پێناوەشدا ناسنامەی ئەو جوتیارانە دەکڕێتەوە کە خاوەن زەوین و مردوون، ئینجا بەناوی ئەوەی کە ئەوان هێشتا زیندوون پێشکەشی دەوڵەتی دەکات و داوا دەکات زەوی پێبدەن بۆ ئەوەی کار بۆ ئەم جوتیارانە بدۆزێتەوە و بەهۆیەشەوە ڕووبەرێکی زۆری زەوی و سەرمایەی لە بانکی دەوڵەت دەست دەکەوێت و بەمەش دەبێتە دەرەبەگێکی دەوڵەمەند و خەڵکیش هەر لە هەژاری و نەهامەتی دەمێننەوە. لەم بەرهەمەی گۆگۆڵدا  ژیانی گوندەکانی ڕووسیا و پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و هەژاری گوندنشینەکان و دەسەڵاتی زۆرداری ئاغا و دەرەبەگەکان بەوردی دەخرێتەڕوو[٢].

هەروەها ژنە شاعیری ئینگلیزی ( ئیلیزابیس بارێت براوینگ ١٨٠٦-١٨٦١ ـ Elizabeth Barrett Browning) ڕۆمانە شیعرێکی بەناونیشانی (ئۆرۆرا لای– Aurora Leigh) لە ساڵی (١٨٥٧)دا بڵاوکردووەتەوە، ئەم بەرهەمەی نووسەر  کەبە درێژترین کار دادەنرێت ((بۆ بەرگریکردن لە مافی ئافرەت لە ئازادی بیرکردنەوە و دەربڕین لە خەمەکانی

---

١- د. أبراهيم استنبولی، نيقولای فاسيلييفيتش گوگول فی القدس، www.arabic. rt.com

٢- جبور عبدالنور، المعجم الأدبی، ص٤٠٦-٤٠٨.

ئافرەتی ئەدیب و هونەرمەند تەرخانکراوە)) [1]. ئەم ڕۆمانە شیعر بەناوبانگترین ڕۆمانە شیعری ئینگلیزییە و (( لە یانزە هەزار (١١٠٠٠) دێڕە شیعری ئازاد پێکهاتووە و بەسەر نۆ پەڕتووك دابەشبووە، و باس لە ژیانی ئەو ژنە شاعیرە دەکات کە هەوڵ دەدات وەکو نووسەرێکی ژن سەربەخۆیی خۆی لەبەرامبەر جیهانی پیاواندا بچەسپێنێت. هەروەها ئەم ڕۆمانە شیعرە ڕووداوی لاوەکی لەخۆگرتووە کە باس لە جیاوازی و ململانێی چینایەتی لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمی ئینگلیزی دەکات)) [2]. هەروەها ئەلیزابیس ڕۆمانە شیعرێکی دیکەی هەیە بەناونیشانی ( بەزەیی) کە بە(١٠) ساڵ ئەم بەرهەمەی تەواو کرد و تێیدا شاعیر بە شێوازێکی ڕادیکالی باس لە هەژاری و ئافرەت لە کۆمەڵگە و بەهای هونەر دەکات[3]. هەروەها لەساڵی(١٨٦٠) ڕۆمانە شیعری (سیل) لەلایەن نووسەری ئینگلیزی (ئۆین میریدیس) بڵاوکرایەوە و لە ساڵی (١٨٦٨)یشدا لەلایەن ( ڕۆبەرت براونگ) ڕۆمانە شیعری (ئەنگوستیلە و پەڕتووك) بڵاوکرایەوە[4].

لە ئەدەبی فەرەنسیش بایەخ بە ڕۆمانە شیعر دراوە و لەم ڕووەوە (( ڕۆمانە شیعرەکەی ( ڕایمۆند ڕاسیل ـ Raymond Russel) بەناونیشانی ( La Doublure) نموونەیەکی ڕۆمانە شیعری فەرەنسییە)) [5].

ڕۆمانە شیعر لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا و لەگەڵ بڵاوبوونەوەی شەپۆلی ڕێبازی مۆدێرنیزمدا ڕووە کزی و سستی هات و لە گۆڕەپانی ئەدەبیدا ون بوو، تا لەناوەڕاستی سەدەکە و بەتایبەتیش لەدوای ساڵی (١٩٦٠) ەوە وردە وردە گەشایەوە و لەلایەن شاعیرانەوە ئاوڕی لێدرایەوە، ئەمەش لەکاتێکدا بوو، کە هەر لەو ساڵەدا لەلایەن (جۆن بیجامین) ڕۆمانە شیعری (زەنگەکان) بڵاوکرایەوە. هەروەها لەساڵی (١٩٧٣) ڕۆمانە شیعری (ژیانێکی دیکە) لەلایەن (واڵکۆت)ەوە بڵاوکرایەوە، هەروەها لەساڵی (١٩٨٢) لەلایەن (جیمس میریل لایت)

---

١- د. ماجد حیدر، العالم في عین امرأة ـ الیزابیث باریت براوننغ، www.jozoor.net .

2- The penguin dictionary of Literary Terms And Literary Theory,J.A.CUDDON, p966 .

٣- مایکل رِوبرت، کبار الروایات الشعریة، www.guardian.co.ukreddit .

4- Verse novel: From wikipedia. The free encyclopedia. www. En. Wikipedia.org.

٥- ئەردەڵان شوکر سابیر، تەکنیکی گێڕانەوە لە ڕۆمانە شیعرەکانی ( شێرکۆ بێکەس)دا، نامەی ماستەر،ل٩.

ڕۆمانە شیعری (گۆڕان) بڵاوکرایەوە[1]. سەرکەوتنی ئەم ڕۆمانە شیعرانە لەو سەردەمەدا زیاتر بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە چەقی ڕووداوی ڕۆمانە شیعرەکە بریتی بوو لە یادەوەری و بیۆگرافیای خودی شاعیران خۆیان، ئەمەش هۆکارێك بوو کە خوێنەرێکی زۆری لە دەوری ئەو ڕۆمانە شیعرانە کۆکردەوە و بووە زەمینیەکی لەبار بۆ دووبارە گەشانەوەی ئەم ژانرە و بایەخ پێدانی لە لایەن شاعیر و نووسەر و ڕەخنەگرانەوە.

دیارترین و بەرچاوترین بەرهەمی ڕۆمانە شیعر لەو سەردەمەدا کە دەنگدانەوەیەکی بەرچاوی بەخۆیەوە بینی، ڕۆمانە شیعری ( دەروازە زێڕینەکە) بوو، کە لەلایەن (ڤیگرام سێس) بڵاوکرایەوە و پڕ فرۆشترین پەڕتووکی ئەو ساڵە بوو. هەروەها ڕۆمانە شیعری (ئۆمیرۆس) کە لەلایەن (دیریك والکۆت)ـەوە لەساڵی (١٩٩٠) نووسرا و سەرکەوتنێکی بێ وێنەی بەدەست هێنا و گەلێك ڕەخنە و لێکۆڵینەوەی لەسەر بڵاوکرایەوە[2].

هەروەها ڕۆمانە شیعری (لەناو دوو کەوانەدا)، کە لەلایەن (دەیڤید جۆنز) بە یەکێك لە بەرهەمە نایابەکانی سەدەی بیستەم لە قەڵەم دەدرێت، ئەم نووسەرە سوودی لە ئەزموونی تایبەتی خۆی وەکو سەربازێکی بەشداربوو لە جەنگی یەکەمی جیهانیدا بینیوە و توانیویەتی ڕووداوەکانی ئەو جەنگە بکاتە چەقی بەرهەمەکەی و تێکەڵی مێژوو و ئەفسانەی بکات[3].

لەلایەن خۆیەوە (ئەنتۆنی بۆرخیس) لەساڵی (١٩٩٥)دا ڕۆمانە شیعری (بایرن)ی بڵاوکردەوە و تێیدا لە شیعرەکانیدا سوودی لە سەروا و کۆپلەی شیعری وەرگرت. هەروەها شاعیری ئوسترالی (مۆرای لی) ڕۆمانە شیعرێکی بەناونیشانی (فرێدی نبتۆن) بڵاوکردەوە و تێیدا فرێدی کە کارەکتەری سەرەکیی ڕۆمانە شیعرەکەیە دووچاری شۆك دەبێتەوە کاتێك ناتوانێت ڕێگری بکات لەو قەسابخانەیەی کە بۆ مرۆڤەکان دانراوە و لەئەنجامیشدا هەستەکانی لەدەست دەدات. هەروەها ڕۆمانە شیعری (ئارەزووی شیرین)ی نووسەر (ماکسویل گلین) کە توانیویەتی لە چوارچێوەی شیعر و خەیاڵدا دوو ڕووداو بکاتە بابەتی سەرەکیی ڕۆمانە شیعرەکەی، ڕووداوی یەکەم باس لەکارو کردەوەکانی گرووپێك دەکات، لە شاری نیویۆرك پێش ڕووداوەکانی (١١)ی سپتێمبەر لە ئەمەریکا و ڕووداوی دووەمیش باس لە

---

1- Verse novel: From wikipedia. The free encyclopedia. www. En. Wikipedia.org.

٢- هەمان سەرچاوە.

٣- مایکل ڕِوبرت، کبار الروایات الشعریة، www.guardian.co.ukreddit .

بارودۆخی شاری لەندەن دەکات لە کاتی دووەمین جەنگی جیهانیـدا. ماکسـویل لـەم ڕۆمانـە شیعریدا لەگێڕانەوەی ڕووداوەکاندا سوودی لە تەکنیکی فرەدەنگی وەرگرتووە[1].

لە ئەدەبی عارەبیشدا، شاعیرانی سەردەمی پێش ئیسـلام و دوای ئـەویش، ئـەو شـەڕ و جەنگانەی لە پێناو خێڵەکەی یاخود دیاردە کۆمەڵایەتییەکانی نێو کۆمەڵگەکەیان لە ڕێگـەی شیعرەوە وەکو حیکایەتێك باسکردووە و گێڕاوەتـەوەو بەمشـێوەیە شـیعر بووەتـە سەرچـاوەی سەرەکیی هەموو گێڕانەوەکان، بەڵام بەشێوەیەکی هونـەری سـەرهەڵدانی ڕۆمانـە شـیعرە لـە ئەدەبیاتی عارەبیدا بۆ سەرەتای سـەدەی بیسـتەم دەگەڕێتـەوە. لێرەشـدا پێویسـتە بـاس لـە پرۆسەیەك بکەین کە ڕێگەخۆشکەر بووە بۆ سەرهەڵدانی ڕۆمانە شـیعر وەکـو ژانرێکـی تـازە لەئـەدەبیاتی عەرەبیـدا، ئـەویش پرۆسـەی تێکـەڵکردنی شـیعر و پەخشـان و تێکشـاندنی سنوورەکانی ئەو دوو بەشـەی ئەدەبـە. دیـارە لـە شـیعری کلاسـیکی عارەبیـدا زۆر بـەزەقی پارێزگاری لە تێکەڵنەبوونی ئـەم دوو بەشـەکراوە، بـەڵام لەگـەڵ کرانـەوەی عـەرەب بـەڕووی ئەدەبیاتی ڕۆژئاوادا و نوێکردنەوەی شیعری عەرەبی ئەو سنوورە کاڵکرایـەوە و ڕێگەخۆشـکرا بۆ هاتنەئارای ئەزموونی نوێی ئەدەبی، کە پێشتر لە ئـەدەبیی عارەبیـدا بـوونی نـەبوو. لـەم ڕوانگەیەوە ((ڕەنگە ئەدەبی جـوبران خـەلیل جـوبران سـەرەتای ئـەو تێکەڵکردنـەی شـیعر و پەخشان بنوێنێت، دوای ئەمەش ئەزموونی شیعری ئازاد بەشداری کرد لە فرەوانکردنی تیۆری ژانرەکانی ئەدەبی لەرێگای ئەوەی ئەزموونی درامی و ڕەگەزەکانی چیرۆك و گێرانەوە و شانۆی خستە نێو جیهانی شیعرەوە، دواتر ئەزموونی شیعری ئازاد ڕێگەی خۆشکرد بـۆ سـەرهەڵدانی پەخشانەشیعر کە بە نموونەیەکی دیار و ئاشکرای ئەوەی ناوی دەنرێت ژانـری ئـەدەبی ئاوێتـە یاخود دەقێکی تێپەرێنەری ژانرەکان، دادەنرێت. لەسەردەمی ئێستەشدا ئەو کرانەوەیـەی لـە ئەزموونی ئەدەبی ڕوویداوە بووەتە هۆکارێك بۆ سەرهەڵدانی فۆرمی نوێتر لە هونەری ڕۆمان و شیعردا، لەوانە (المسراویە) و (کورتە چیرۆك) و( ڕۆمانە شیعر) و (پەخشانە شیعر) و گەلێکی دیکەش)) [2].

لەبارەی لێکۆڵینەوە و تۆژینـەوەی زانسـتیانەی ڕۆمانـە شـیعر و ناسـاندنی بـە ناوەنـدی ئەدەبیاتی عەربیشدا، ئەوا ڕۆماننوسی میسری (ئیداورد ئەلخـەرات) بـە ڕێبـەری ئـەم بـوارە

١- هەمان سەرچاوە.

٢- مقابلة مع دکتورة کوثر جابر، www.alarab.com .

دەناسرێت و چەندین لێکۆڵینەوەی لەبارەی ڕۆمانە شیعر و تێکەڵکردنی ژانرەکان بڵاوکردووەتەوە لەوانەش هەردوو پەرتووکەکەی خۆی (الكتابه عبر النوعيه ١٩٩٤) و( الحساسية الجديدة ١٩٩٣)دا و هەروەها هەر خۆشی لە ساڵی (١٩٨٥)دا دەقێکی ڕۆمانە شیعری بەناونیشانی ( رامه و التنين) دەنووسێت[١].

هەروەها ڕۆمانە شیعری (من يسكب الهواء في الرئة القمر)ی بەشار عەبدوللا، کە محەمەد جابر لەبارەیەوە دەڵێت: بەهۆی ئەو یەکانەی کە هەستی نـاوەوەی نووسەر پێکدێنن و لەناو دەقەکەدا هەن، هەستێکن ئەندازیاری ڕاستەقینەی دروستکەری دەقەکەن، بۆیە ئەو دەقە شتێکی زۆر گەورەیەو بەشێوەیەك کە ناتوانرێت ئێستە ناوی بنرێت، بەڵام هەرگیز ڕۆمانێکی ئاسایی نییە[٢].

هەر لەم ڕوانگەیەوە ئەحلام موستەغانمی ڕۆمانە شیعرێکی بەناونیشانی ( ژاكره الجسد) بڵاوکردووەتەوە کە زیاتر ((جەخت لەسەر مێژوو دەکاتەوە کە ئامادەییەکی بەرچاوی لە گۆڕەپانی عارەبی هەیە و چارەسەری کێشە سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانی لە نیشتمانی عارەبی دەکات و لە ناواخنیدا ئارەزووی گۆڕانکاری و ڕەتکردنەوەی چەسپاو و بیروباوەڕی خراپ و نابەجێ دەکاتەوە)) [٣].

هەروەها چەندین ڕۆمانە شیعری دیکەش هەن کە لەئەدەبیاتی عەرەبیدا جێگە و پێگەی تایبەتی خۆیان کردووەتەوە لەوانە ( سقف الكفايه)ی محەمەد حەسەن علوان و (الحزام)ی ئەبی دەهمان و (الغيمة الرصاصية)ی عەلی ئەلدەمینی و (الزمن الموحش)ی حیدەر حەیدەر و (الباذنجانة الزرقاء) و(الخباء) و (نقرات الظباء)ی میرال ئەلتەحاوی[٤]. هەروەها ڕۆمانە شیعری (جنوب الروح)ی محەمەد ئەلئەشعەری و (لحظات لا غير)ی فاتحە مورشید [٥].

---

١- هەمان سەرچاوە .

٢- محمد جابر، نصوص بشارعبدالله قراءة تأويلية في نسق الرواية، http://pulpit.alwatanvoice.com.

٣- احمد اللهيب، الرواية السعودية ادب الأميين ـ الرواية السعودية وفخ الأعلام، www.alsakher.com.

٤- د.عبداللة الفيفى، تداخل الأجناس في بلاغيات النص المعاصر، www.faifi.ws.com

٥- محمد معتصم، الرواية الشعرية، www.alnked-aliraqi.net.

## هۆكارەكانی سەرهەڵدانی ڕۆمانە شیعر:

دیارە هەر ژانرێك كاتێك دێتەئاراوە و دروست دەبێت، كۆمەڵێك هۆكـار زەمینـە خـۆش دەكەن بۆ ئەوەی بتوانێت لەسەر پێیەكانی خۆی بوەستێت و خەسڵەتەكانی خـۆی پێكبێنێـت و ڕكابەری ژانرەكانی دیكەی پێ بكات. ڕۆمانە شیعریش لەو كاتـەی وەكـو ژانرێـك هاتـە نێـو گۆڕەپانی ئەدەبەوە، كۆمەڵێك هۆكاری تایبەتی و گشتیی لە پشتی ئەو سـەرهەڵدانەدا بـوون. لەم چوارچێوەیەدا (ئەردەڵان شوكر سابیر) لە نامەی ماسـتەرەكەیدا بەناونیشـانی (تـەكنیكی گێڕانەوە لە ڕۆمانە شیعرەكانی (شێركۆ بێكەس)دا) كۆمەڵێك خاڵی دەستنیشانكردووە وەكـو هۆكارێك بۆ سەرهەڵدانی ڕۆمانە شیعر، بۆیە ئێمە لێرەدا جیا لەم خاڵانە، پێمانوایە كـە ئـەم خاڵانەی خوارەوەش هۆكارێك بوونە بۆ سەرهەڵدانی:

١ـ بەریەكەوتنی هەردوو بەشەكەی ئەدەب شـیعر و پەخشـان و هەوڵـدان بـۆ سـڕینەوەی سنوورەكانی نێوانیان و تێكەڵكردنیان، بەتایبەتیش كە لە سەردەمانی زوودا ئەو تێكەڵكردنـە قبووڵ نەدەكرا و دەبوایە هەر یەكێك لـەم دوو بەشـە بـەجودا كـار بكـەن، ئـەم تێكەڵكردنـە ڕێگەی خۆشكرد بۆ ئەوەی گەلێك لە فۆرم و ژانری تازە لەدایك بـن و لـەگۆڕەپانی ئەدەبیاتـدا جێگە و پێگەی خۆیان بكەنەوە و خەسڵەتەكانیان دابڕێژن.

٢ـ جیا لەوەی كە شیعر بەمەبەستی مانەوەی خۆی لە گۆڕەپانی ئەدەبیدا و ڕكابـەریكردن لەگەڵ ڕۆماندا دەستی بۆ زۆر ژانری دیكە درێژكردووە، ئەوا ڕۆمانیش بەدەوری خۆی پەلی بـۆ گەلێك ژانری دیكە ڕاكێشاوە، بەتایبـەتیش كـە تـا ئێسـتە وا سـەیری ڕۆمـان دەكرێـت كـە ((فۆرمێكی دیاریكراوی لەسەر ڕێككەوتووی لەئارادا نییە)) [1]، ئەمەش وا دەگەیـەنێت كـە ڕۆمان بە هۆی ئەوەی سنوورەكانی كراوەیە و داخراو نییە، بەئاسانی لەگەڵ ژانرەكانی دیكـەدا تێكەڵ ببێت و ئاوێتەیەكی نوێی ئەدەبی بێنێتە كایـەوە، یـاخود لـەناو پێكهاتـەی دەقەكـەدا ژانرەكانی دیكە بتاوێنێتەوە و بەمەبەستی دەقەكە سوودیان لـێ وەربگرێـت. دیـارە ئەمـەش زیاتر بۆ درێژە پێدانی مانەوەی خۆیەتی لـەگۆڕەپانی ئەدەبیـدا، بەتایبـەتیش كـە سـەردەمی ئێستەمان سەردەمی ڕۆمانە.

٣ـ هەمیشە ململانێ و ڕكابەری لەنێوان شیعر و ڕۆماندا هەیە و قەوارەی ئەو ململانێیـە لەكۆنەوە هەیەو تادێت زیاتر دەبێت و هەر یەكێكیان دەوێت ئەوی دیكە لە گۆڕەپانەكە بـەدەر

---

١- جبور عبدالنور، المعجم الأدبي، دار العلم للملايين، بيروت ـ لبنان، ٢٠٠٥، ص١٢٩.

بخات و لوتکە و پێشەنگ بۆخۆی بهێنێتەوە و جەماوەری خوێنەریش بۆ خۆی ڕابکێشێت. هەر بۆ نموونە لەبارەی ئەو ململانێیەی نێوان شیعرو ڕۆماندا، ئەگەر بەوردی سەیری لیستی دابەشکردنی خەڵاتی نۆبڵ بۆ ئەدەبیات بکەین کە ساڵانە دەدرێتە نووسەر و ئەدبیانەوە، ئەوا بەپێی ئەو لیستەیەی کە لەبەردەستدایە لەساڵی (١٩٠١-١٩٩٣)[1] لەکۆی دابەشکردنی (٨٧) خەڵات، (٤٢) خەڵات بەرۆماننووسان دراوە لەبەرامبەر (٢٤) خەڵات کە بەشاعیران دراوە، ئەمەش نیشانەی ئەوەیە کە ململانێیەکی سەخت لەنێوان ئەم دوو ژانرەدایە بۆ ئەوەی هەر یەکێکیان سوود لە تەکنیك و توخمەکانی ئەوی دیکە وەربگرێت و لەناوخۆیدا بتوێنێتەوە، تاوەکو بتوانێت لەلایەکەوە بەر لە گەشەکردنی بگرێت و لەلایەکی دیکەشەوە لاوازی بکات و لە دواوەی خۆیدا بەجێی بهێڵێت.

٤ـ تێکەڵبوونی بیۆگرافیا وەکو یادەوەرییەك لەگەڵ ژانری شیعردا، کە ئەمەش وای کرد ئیدی شاعیران بۆ نووسینەوەی بیۆگرافیای خۆیان لەجیاتی ئەوەی پەنا بۆ پەخشان بەن لە فۆرمی شیعردا یادەوەرییەکانی خۆیان بنووسنەوە، دیارە لەمەشدا پێویست بوو شاعیران پشوو درێژبن و شیعری درێژ بنووسنەوە، چونکە یادەرەوەی لە پارچەیەکی شیعریدا جێگەی باسکردنی نابێتەوە، هەروەها بۆ گێڕانەوەی ئەو یادەوەرییەش ناچار بوون پەنا بۆ تەکنیکەکانی گێڕانەوە بەن کەلەمەشدا ڕۆمان ئەو بوار و هەلە بۆ شاعیران دەستبەر دەکات. ئەمە خاڵە کاریگەرییەکی زۆری هەبوو لە دووبارە بووژاندنەوەی ڕۆمانە شیعر لەکۆتاییەکانی سەدەی بیستەمەدا هەروەکو پێشتر ئاماژەمان بۆی کرد. بەهۆی ئەوەی کە شاعیران لەرێگەی ڕۆمانە شیعرەوە، بیۆگرافیای خۆیان خستە بەرباس و توانیان دووبارە جەماوەر بۆ خوێندنەوەی ڕۆمانە شیعر بگەڕێننەوە.

٥ـ هەروەها گەلێك لە شاعیران جیا لە نووسینی شیعر، ئەزموونی نووسینی ڕۆمان بەشێوەی پەخشانیان هەبووەو گەلێك شاعیر ئەوەندەی بە ڕۆماننوس بەناوبانگ بووە، ئەوەندە بە شاعیر ناسراوە نەبووە. دیارە شارەزابوون لە تەکنیکەکانی ڕۆمانی پەخشان ئامێز، یارمەتیدەرێکی چاکی شاعیر بووە بۆ سوود وەرگرتن لەو تەکنیك و توخمانە و تەوزیفکردنی لەنووسینی ڕۆمانە شیعرەکەیدا، ئەمەش ماوەی نێوان ئەو دوو ژانرە شیعر و ڕۆمان سەبارەت

---

١- باکنر ب. تراوپك، مێژووی ئەدەبیاتی جیهانی، و: حەمە کەریم عارف، چاپی یەکەم، چاپخانەی ڕۆژهەڵات – هەولێر، ٢٠٠٨، ل ٣٩١-٣٩٥ .

بە شاعیر لەیەکتر نێزیکترکردووەتەوە و شاعیر لەیەکاتدا دەسەڵاتی بەسەر هەردوو ژانرەکەدا شکاوە و توانیویەتی لە هەردوو بواردا بەرهەمی هەبێت.

## جۆرەکانی ڕۆمانە شیعر:

ڕۆمانە شیعر بەپێی مێژووی خۆی هەوڵیداوە لە ناو گۆڕەپانی ئەدەبیدا خۆی بچەسپێنێت، لەم هەوڵەشیدا سوودی لەگەلێك سەرچاوە و بوار وەرگرتووە، لەوانەش ئاراستەکردنی دەقەکەی بەپێی تەمەنی خوێنەر، چونکە خوێنەر لە هەر تەمەنێکدا جۆرێك لە مەعریفە وەردەگرێت و پێویستی پێی هەیە، کە لەگەڵ تەمەنەکەی دەگونجێت و شیاوی وەرگرتنە. بۆیە دەبینین ڕۆمانە شیعر بەپێی تەمەن کاری کردووە و لەم ڕووەوەش دابەشی سەر ئەم جۆرانە دەبێت:

١ـ ڕۆمانە شیعری گەوران: ئەو جۆرە ڕۆمانە شیعرانەن کە لە نووسینیاندا شێوازێکی گشتیی ڕەچاو کراوە و تایبەت بەکێشەو گرفتی مرۆڤی کامل کە هەست بە پرسیارێیەتی بەرامبەر خۆی و کۆمەڵگەکەی و ژیان و چارەنووسی مرۆڤایەتی دەکات. ئەم جۆرە ڕۆمانە شیعرانە بەشێکی زۆری بەرهەمی ڕۆمانە شیعر دەگرنەوە و تێیدا خاوەن پەیام و ئەرکێکی دیاریکراون.

٢ـ ڕۆمانە شیعری گەنجانە: ئەم جۆرەیان زیاتر بایەخ دەدات بە ژیان و کێشەو گرفتی چینێکی دیاریکراوی نێو کۆمەڵ کە ئەوانیش گەنجن. لێرەدا شاعیر سوود لە کارەکتەرە گەنجەکان دەبینێت بۆ بەڕێوەبردنی ڕووداوەکان، کە زۆربەی ئەو ڕووداوانەش پێوەست دەبن بە ژیانی گەنجانە و خەون ئاواتەکانیان، لێرەشدا ئامانج یارمەتیدانی گەنجەکانە بۆ زاڵبوون بەسەر کێشەو گرفتەکانیان. بۆ نموونە ڕۆمانە شیعری کارین هیس (هاتنە دەرەوە لەناو تۆز و خۆڵ) کە ڕۆمانە شیعرێکی گەنجانەیە و بەهۆی پتەوەی ناوەڕۆکەکەی و ئێستێتیکای دەقەکەیەوە توانی لەساڵی (١٩٩٨) خەڵاتی نیوبری وەربگرێت[1].

٣ـ ڕۆمانە شیعری منداڵان: ئەم جۆرەیان تایبەتە بە تەمەنی منداڵی وبەهۆی ئەو ڕۆمانە شیعرانەوە ئامۆژگاری و پیشاندانی ڕێگەی ڕاست و ڕوونکردنەوەی خراپەکارییەکان بەمنداڵان نیشان دەدرێت، چونکە ئەم تەمەنە، تەمەنێکی هەستیارە لە ژیانی مرۆڤدا و پێویستت بەوە دەکات لەرێگای پەروەردەی تایبەتییەوە منداڵان مەعریفە و کلتووریان پێ بگەیەنرێت. ئەمە

1- Verse novel: From wikipedia. The free encyclopedia. www. En. Wikipedia.org.

سەرەڕای ئەوەی کە لەلایەکەوە منـداڵ توانـای لەبـەرکردنی هەیـە و بەئاسـانی ئـەو کۆپڵـە شـیعرانە وەردەگرێت و حەزی لێ دەکات و بەڕەوانی دەیخوێنێتەوە، لەلایەکی دیکەشەوە منداڵ حەز بـە چیرۆك دەکات چ بە شێوازی گێڕانەوە بێت یـاخود بـە شـێوازی خوێندنـەوە بێـت. دیـارە ئـەم دوو لایەنـەش یارمەتیدەرێکە بۆ گەشەکردنی ڕۆمانە شیعری منداڵان، چونکە لە یەککاتدا هەم چیرۆکێك پێشـکەش بە منداڵان دەکات و هەمیش لە قالبی شیعرەوە دەیخاتەڕوو، کە وشـە و ڕسـتەکانی کـورتن و خـاوەن مۆسیقا و سەروان کە منداڵان بەئاسانی و ڕەوانی لەبەریان دەکات.

## تایبەتمەندییە هونەرییەکانی ڕۆمانە شیعر:

هەر ژانرێك چەندین تایبەتمەندی هونەری هەیە کەوەکو خەسڵەتێك پێکهاتەی هونەری بۆ ژانرەکـە چێ دەکەن و ناسنامەکەی دەستنیشان دەکەن و سیمایەکی پـێ دەبەخشـن و بەهۆیـە لـە ژانرەکـانی دیکە جیای دەکەنەوە و فۆرمەکەی ڕەنگڕێـژ دەکـەن. لـەم ڕوانگەیـەوە ڕۆمانـە شـیعریش کۆمـەڵێك خەسڵەتی دیاریکراوی خۆی هەیە، بەشێك لەو خەسڵەتانە لەلایەن (ئـەردەڵان شـوکر سـابیر) لەنامـەی ماسـتەرەکەیدا بەناونیشـانی (تـەکینکی گێڕانـەوە لـە ڕۆمانـە شـیعرەکانی (شـێرکۆ بێکـەس)دا) دیاریکراوە، لێ ئێمە پێمانوایە کە هەندێك خەسڵەتی دیکەش مـاون، کـە شـیاوی ئامـاژە پێکـردنن، لەوانە:

١ - دیارە ڕۆمانە شیعر بە شیعر دەنووسرێت، بۆیە شیعر و هونەرەکانی شیعری زاڵبوونێکیان پێـوە دیارە و ئەو هاوکێشەیەی کە لە هـەردوو ژانـری ڕۆمـان و شـیعردا دروسـتبووە زێـتر بـەلای شـیعردا لاسەنگ دەبێتەوە، چونکە ((هەموو بنەماکانی شیعریی تێدا ڕەچاو کراون، هەنـدێ جـار بـە کـێش و سەروایشەوە، هەروەها لەزۆربەی کاتیش زاتییەتی شیعری تێدا پارێزراوە)) [1]، بەڵام لەگەڵ ئەوەش کـە شیعر زاڵبوونێکی پێوە دیارە، کەچی (( واتای ئەوە نییە، کە شـیعر لـە شـیعرییەتی خـۆی کـەوتوەو هەروەك واتای ئەوەش نییە، کە ژانرێکی تایبـەت یـاخود هونـەری داڕشـتنی یـەکێکیان بـە تـەواوی جێگەی ئەوی تریانی گرتۆتەوە، بە پێچەوانەوە واتای ئەوەیە، کە شـیعر لـەژێر کاریگـەرێتی پەخشـان بووژاوەتەوە و ڕۆمانە شیعریش دیوێکی ئێستەی ئەم بووژانەوەیە)) [2].

---

١- زاهیر ڕۆژبەیانی، شیعرییەت لە دەرەوەی شیعر، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر ـ کوردستانی عیراق ٢٠٠٨، ل٨.

٢- شێرزاد هەینی، ٩٥٥ دەقیقە لەگەڵ شێرکۆ بێکەسدا، چاپخانەی تیشك، کوردستان ٢٠٠٨، ل١٢.

٢- بەهۆی ئەوەی کە زمانی شیعری لە نووسینی ڕۆمانە شیعردا بەکاردێت، بۆیە تۆپۆگرافیای ڕۆمانە شیعر ئاسۆییە و هەموو لاپەڕەکە پڕ ناکاتەوە، بەپێچەوانەی ڕۆمانی ئاسایی کە زمانی پەخشان بەکاردەهێنێت، ئەوا تۆپۆگرافیایەکەی ستوونییە و تەواوی لاپەڕەکە پڕ دەکاتەوە و هیچ بۆشاییەك لە لاپەڕەکەدا بەدی ناکرێت. ئەمەش وا دەکات جیاوازی نێوانیان لە تۆپۆگرافیایەکەدا بەسەیرکردنێکی ئاشکرا بەدیار بکەوێت.

٣- لەبەرئەوەی زمانی ڕۆمانە شیعر، شیعرە، هەر بۆیەشە زۆربەی کات لەلایەن خودی شاعیرانەوە دەنووسرێن، چونکە ئەوان توانای نووسینی شیعریان هەیە ((ئەم توانایە وا لە شاعیر دەکات کە هێزی درێژەپێدانی هەبێت لە نووسینی ڕۆمانە شیعردا)) [1]، بەو واتایەی ئەگەر ڕۆماننووس شاعیر نەبێت، ناتوانێت ئەزموونی ڕۆمانە شیعر ئەدا بکات. لەهەمان کاتیشدا ((مەرج نییە بەپێی زەروورەت هەموو شاعیرێك ڕۆماننووس بێت)) [2] و بتوانێت خۆی لەقەرەی نووسینی ڕۆمانە شیعر بدات.

٤- جیاوازی سەرەکیی نێوان پارچە شیعرێك لەگەڵ ڕۆمانە شیعردا لەوەدایە کە ڕۆمانە شیعر، خۆی لە چەند پارچەیەکی درێژی شیعریدا دەبینێتەوە، کە بەهەموویان یەکدی تەواو دەکەن و وێنەی ڕاستەقینەی ڕووداوەکە دەخەنەڕوو. واتا درێژی شیعرەکە ڕۆڵی خۆی هەیە لە ناسینەوەو ناساندنی ڕۆمانە شیعردا.

٥- ئەم درێژی و درێژەپێدانەی شیعری لە ڕۆمانە شیعردا، بەهاوکاری توخم و تەکنیکەکانی گێڕانەوە پێڕەوی لێکراوە. گێڕانەوەش بڕبڕەی پشتی ڕۆمان پێکدەهێنێت، لێرەشدا خاڵی بەیەکگەیشتنی ڕۆمان و شیعر لەجەستەی ڕۆمانە شیعردا دیاری دەکرێت.

٦- لە ڕۆمانە شیعردا زمانی شیعری تانوپۆی بابەتەکە دەکات و ((لە زمانی پەخشان لادەدەن و وەکو شێوازێکی سەربەخۆ خۆیان دەچەسپێنن، بەڵام دیارە ئەم لادانەش لەسەر ئاستێکی فرەوانتری پێکهاتەکانی زمان دەگێرسێتەوە)) [3] کە زمانی شیعرە. ئەمەش جیاوازی زۆری هەیە لەگەڵ

---

١- ايمن اللبدى، حتى لايكون ((قصيدة النثر العربية)) مسألة وقت!، www.allabadi.com.

٢- مروان علي، القومى جان دوست: الرواية الكردية متعثرة بـ((حجر الأيديولوجيا والهم، مقابلة، www.welateme.net.

٣- شێرزاد هەینی، ٩٥٥ دەقیقە لەگەڵ شێرکۆ بێکەس دا، ل٤-٥.

شیعرییەتی زمان، چونکە ((زمانی شیعری ئەو زمانەیە کە لەشیعرەوە نێزیکە و پابەندی کۆمەڵێ سنووره، بەلاَم لە شیعرییەتی زماندا ئەو حاڵەتە بەدی ناکەین))[1].

٧- ئەم جیاوازییەی نێوان زمانی شیعری و شیعرییەتی زمانیش بەدەوری خۆی کاریگەریی لەسەر توخم و تەکنیکەکانی ڕۆمانە شیعریدا دروست دەکات، چونکە ((شیعرییەتی زمان مەودایەکی بەرفرەوان دەبەخشێتە زمانی سووڕانەوەی ڕووداوەکان بە پێچەوانەی زمانی شیعری ئەو مەودایە تەسك دەکاتەوە))[2]. بەو واتایەی کە ڕووبەری ڕووداو بەهۆی بەکارهێنانی زمانی شیعرییەوە تەسك دەبێتەوە و شاعیر بەحوکمی سنووربەندی زمانی شیعری ناتوانێت بە ئاسانی لایەنەکانی ڕووداوەکەی بخاتە بەرباس وەکو ئەوەی لە زمانی پەخشانی ڕۆمانی ئاسایی ئەنجام دەدرێت. بەمەش ڕووداو لە چەند وشە و پەیڤێکی کورت کورت چڕ دەکرێنەوە و لەرێگای وێنەی شیعرییەوە بە خوێنەران دەگەیەنرێن.

٨- کات و شوێن و دایەلۆگ و مەنەلۆگ و تەکنیك و توخمەکانی دیکەی گێڕانەوە، دەکەونە ژێر سێبەری ئەو فەزایەی کە لەرێگای بەکارهێنانی زمانی شیعریدا لە نێو پانتایی دەقدا دورست بووەو جۆرێك لە شاعیری بوونیان پێوە دیار دەبێت، چونکە ((ئەگەر زمانی شیعری بووە زمانی سەرەکیی کەواتە تۆ سیفەتی شاعیربوون دەبەخشیتە هەموو کارەکتەر و ڕووداوی نێو ڕووداوەکەت))[3]، بەمەش ڕووبەری بەکارهێنانیان جۆرە سنووربەندییەك لەخۆ دەگرێت.

٩- کارەکتەر لە ڕۆمانە شیعردا جیا لەوەی کە لە هەموو چین و توێژەکانی ناو کۆمەڵگە وەردەگیرێن و لە پانتایی دەقدا دادەمەزرێن، لەهەمان کاتیشدا دەربڕی هەست و سۆزەکانی خودیی شاعیرەکەشن، بەتایبەتیش لەو ڕۆمانە شیعرییانەی کە تایبەتن بە بیۆگرافیای خودی شاعیر، لێرەشدا گەلێك جار گێڕەرەوە خودی شاعیر خۆیەتی جا، یان ئەوەتا ( ناوێکی جیاواز لە ناوی نووسەرەکەی وەردەگرێت، یاخود هەر ناوی نییە، یاخود هەمان ناوی نووسەر وەردەگرێت))[4]. بەو واتایەی کە کارەکتەر لە ڕۆمانە شیعردا وەکو سێبەرێکی نێزیکی شاعیر وایە.

---

١- سەلاَح حەسەن پاڵەوان، شیعری کراوە ـ لە ئەزموونی شیعری نوێی کوردیدا،دەزگای چاپ و بلاَوکردنەوەی ئاراس، هەولێر ـ هەرێمی کوردستانی عێراق، ٢٠١٠، ل١٣٤-١٣٥.

٢- هەمان سەرچاوە، ل١٣٤-١٣٥.

٣- هەمان سەرچاوە، ل١٣٤-١٣٥.

٤- فيليب لوجون، السيرة الذاتية ـ ميثاف و التاريخ الأدبي، ترجمة: عمر حلي، المركز الثقافي العربي، بيروت ـ لبنان، ١٩٩٤، ص ١٤.

# بەشی دووەم
# پێگە و ئەدگاری ڕۆمانە شیعری کوردی

## باسی یەکەم: ڕەگ و ڕیشاڵی ڕۆمانە شیعری کوردی

مێژووی ڕۆمانە شیعر لە ئەدەبی کوردیدا ئەوەندە دوور و درێژ نییە، بگرە ڕۆمانە شیعر بەشێوەیەکی هونەری ژانرێکی تازەیە لە ئەدەبیاتی کوردیدا، لەگەڵ ئەوەشدا بۆ دەستنیشان کردنی سەرەتاکانی مێژووی ڕۆمانە شیعر لە ئەدەبی کوردیدا، پێویستە ئێمە تەنیا خۆمان بە مێژوویەکی دیاریکراو نەبەستینەوە و وا پیشان بدەین کە ئیدی لەو مێژوویەوە ڕۆمانە شیعر دەستی پێکردووە و لەپێش ئەو مێژووەشدا بە بڕای بڕ ڕۆمانە شیعرمان نەبووە و هیچ هەوڵێکیش بۆ داهێنانی فۆرمی تازە نەبووە. بەپێچەوانەوە ئەگەر چی دانانی مێژوویەکی دیاریکراوە بۆ سەرهەڵدانی هونەرییانەی ڕۆمانە شیعر گرینگە، لەگەڵ ئەوەشدا ئاماژە بە زەمینەسازی و خۆشکردنی بارودۆخی ئەو سەرهەڵدانە زۆر گرینگترە بخرێتە بەر باس و لێکۆڵینەوە، چونکە بەهۆیەوە شەقڵ و سیما و خەسڵەت و تایبەتمەندییەکانی ڕۆمانە شیعری کوردی ئاشکرا دەبن و دیاری دەکرێن. بۆیە ئێمە لەم ڕوانگەیەوە هەوڵدەدەین ڕەگ و ڕیشاڵی ڕۆمانە شیعر لە ئەدەبیاتی کوردیدا لەپێش سەرهەڵدانە هونەرییەکەی دەستنیشان بکەین و شی بکەینەوە.

### لە بیروباوەڕی ئاینیدا:

کورد وەکو هەموو میللەتانی دنیا خاوەن بیروباوەڕی ئاینی خۆی بووە و لە پەرستگاکاندا نزا و پاڕانەوەکانی بە شیعر هۆنیەوەتەوە، ئەمەش هاریکاری بووە لەوەی، کە بناخە و بنچینەکانی ئاینەکەی لە شێوەی حیکایەت و چیرۆك و ڕۆماندا بگێڕێتەوە. بۆیە سرووتەکانی ئاینی کوردی کۆمەڵە دەقێکی شیعرین و بە ئاسانی دەتوانین توخمەکانی گێڕانەوەیان تێدا دەستنیشان بکەین، لە دایەلۆگ و کات و شوێن و ڕووداوەوە کە بەهەموویان دەقگەلێکی

گێڕانەوەییان دروست کردووە. گاتاکانی زەردەشت پەڕتووکی پیرۆزی ئاینی کۆنی کوردانە و بە شیعر هۆنراوەتەوە و گەلێك توخمی گێڕانەوەی تێدا دەبینرێت، بەتایبەتیش ئەو گفتوگۆیەی، کە لەنێوان ئەهورمەزدا خودای خێر و خۆشی و زەردەشتی پێغەمبەر، هەروەها لە نێوان خودی زەردشت و خەڵکان، کە بەمەبەستی بانگەوازکردن بۆ ئاینەکەی پەنای بۆ شیعر بردوو تا گفتوگۆ لەگەڵ خەڵکان بکات و کاریگەرییان لەسەر دابنێت و هەست و سۆزیان ڕابکێشێت، لەهەمان کاتیشدا سوودی لە تەکینك و توخمەکانی گێڕانەوەش بینیوە و ئاوێتەی مەبەستەکەی خۆی کردوونە:

(( ٢٩/١

**ڕۆحی جیهان گلەییتان لێدەکات**
**بۆچی ئێمەت دروستکرد؟**
**کێ ئێمەی بەم شێوەیە دروستکرد؟**
**ڕق و زەبروزەنگ و دەستدرێژی و دڵڕەقی و یاخیبوون**
**ئێمەی گرتەوە**
**ئێمە جگە لە تۆ پشت و پەنایەکمان نییە**
**رزگارکەری چاکە کێیە کە ئێمە ڕزگار کات؟ نیشانم بدە**

**٢٩/٢**

**ئەو کاتە،**
**دروستکەری گەردوون پرسیاری لە ڕاستی کرد:**
**ڕابەری تۆ لە جیهان کێیە؟**
**تاکو ئێمە پشتیوانی لێبکەین،**
**توانای ئاوەدانکردنەوەی جیهانی پێبدەین.**
**دەتەوێ کێ سەرداری جیهان بێت،**
**تاکو ڕق و زیانی درۆزنان تێکبشکێنێت؟**

**٢٩/٣**

**ڕاستی لەوەرامدا وتی:**
**هیچ کەسێك لەمانە ناناسم**

**که ئازار و زیان لەجیهاندا لابەرێت،**
**لەبەرانبەری خراپکاراندا یارمەتی ڕاستی بدات؟**
**لەناو ئەم مرۆڤانەدا،**
**ئەو کەسە دەبێت لە هەموو کەس بەتواناتر بێت،**
**تاکو ڕابکەین بۆ یارمەتیدانی))** [1].

لەم سرووتانەی سەرەوە تێبینی دایەلۆگێك دەکەین لەنێوان خودای ئەهورمەزدا و پێغەمبەر کە ڕاستی کراوە ڕەمزێك بۆ ئەو پێغەمبەرە، هەروەها شوێن کەبرێتییە لە جیهان واتە زەوی و ئاسمان کە بارەگای ئەهورەمەزدایە ئەو ڕووداوەی گفتوگۆیەی لەخۆگرتووە، ڕووداوەکەش پیشاندانی ڕێوڕەسم و ڕوونکردنەوەی ئەدگارەکانی ئەو ئاینەیە کە ئەهورمەزدا بۆ پێغەمبەری دەستنیشانکردووە. هەر ئەوانیش ئەهورمەزدا و پێغەمبەر کارەکتەری سەرەکی جولاندنی ڕووداوەکانن و خوێنەریش، کە خەڵکە کارەکتەری جێبەجێکاری ئەو ڕێنماییانەیە. دیارە ئەو توخم و تەکنیکانە بەشێکی سەرەکین لە پرۆسەی گێڕانەوە کە سرووتەکانی ئاینی زەردەشتی پەنای بۆ بردووە.

هەروەها لە ئاینی ئێزیدیاتیشدا بەهۆی دەقی شیعرییەوە کۆمەڵێك چیرۆك لەبارەی خوڵقاندنی مرۆڤ و دروستکردنی زەوی و ژیان خراوتەڕوو:

((**یا ڕەبی تە دنیا چێکر، دنیا ب خێر**
**ئینسان تێدا دژین بە تێر**
**شەڤێت ڕەش، شەڤێت تاری**
**جی نەما گول ژێ بارین**
**خوداڤەندی کەریم و ڕەحمان**
**کرە ڕکن ئەردو ئەزمان**
**دابەر مە ڕوح وزمان**
**خوادڤەندێ مە ڕەبل سەمەد**
**ئەفراندن شەش ملیاکەت**

---

١- د. حوسێن وەحیدی، سروودو گاتاکانی زەردەشت، و: وریا قانیع، دەزگای وەرگێڕان، هەولێر ـ کوردستانی عێراق ٢٠٠٦، ل٣٢-٣٣.

**جوداكر دۆژو جنەب))** [1]

لە سروودی ئاینی كاكەییەكانیش چەندین سروودی ئاینیمان بەرچاو دەكەوێت كە بـەهۆی سوود وەرگرتن لە توخم و تەكنیكەكانی گێڕانەوە، چیرۆكی دروستكردنی زەویی و مرۆڤـەكان و ئاسمان و ژیانی باس دەكات:

**((خان ئەڵماس دەربارەی دروستبوونی دنیاوە دەڵێ:**

**حەوت ڕۆح پەیدا دەبن**

**با پێتان بڵێم**

**با حەقیقەت بزانن و، لاتان مەعلوم بێ**

**تاوەكو ڕێگەی شەیتان نەگرنە بەر**

**ئەوسا نە لەوح هەبوونە نەهیچ شتێ**

**نەعەرش بوو نەفەرش، جیهان سەرپاكی (دەریا) بوو**

**مەولام دوڕێ بوو دوڕیش لەناو دەریادا بوو**

**لەدوڕەوە دەرهات و دنیای ئامادەكرد**

**ناوی خۆی ناوە خاوەندگار**

**عەرش و قورش وفەرشی سازدا**

**حەفتا هەزار ساڵ بەتاك و تەنیا بوو**

**لەسەر بەحرەوە بە گۆچان (چۆگان )ی كرد**

**لەخاكی فەرشی جبرائیل سازدرا**

**تا بوو بە هامرازی خالیقی جەلیل**

**ئەوەل چوار فریشتەی دروست كردن**

**ئەوسا ئاسمان و زەمین**

**بەسرڕی قودەرت عالەم دروست بوو**

**حەوت تەبەقەی لەسەر پشتی ماسیەوە دامەزراند))** [2]

---

١- تارق جامباز، سەرەتای خوڵقان لەدەقەكانی كوردیدا، گۆڤاری ( كاروان)، ژمارە (٦٩)، ساڵی حەوتەم، تشرینی یەكەم و دووەمی ١٩٨٨، ل٩٢.

٢- هەمان سەرچاوە، ل٩٦.

لەگەڵ هاتنی ئاینی ئیسلامیشدا، لەلایەن مەلاو زانایانی کوردەوە بەمەبەستی گەیاندنی پەیامەکانی ئاینی ئیسلام بە خەڵکان و ڕوونکردنەوەی ڕێنمایی و بڕیارەکانی خوداوەند و ژیاننامەی پێغەمبەری ئیسلام و یاوەرانی، چەندین ڕووداوگەلی باسکراوی نێو قورئانی پیرۆز و چیرۆکەکانی وەکو (یوسف و زولەیخا و فیرعەون و نەمردو...) لە قالبی شیعریدا دە هۆنراوە و پێشکەش دەکران. لەوانە مەولوودنامە، کە لەلایەن هەندێك لە زاناکانەوە بە زمانی شیعری باسی لە ئەرکانەکای ئیسلام و ژیاننامەی پێغەمبەر و یاوەران و دورستکردنی زەوی و ئاسمان و ژیان کراوە. بونموونە لە مەولود نامەی (حاجی مەلا عەبدوڵای جەلی زادە)دا بەمشێوەیە باس لە کردەی خولقاندن کراوە:

((**ئەرز لەسەر بەردییە**
**بەرد لەسەر گا جۆتیە**
**گا جۆت لەسەر ماسییە**
**ماسی لەسەر ئاوییە**
**ئاو لەسەر هەوایە**
**هەوا لەسەر تاریکییە**
**کەس نازانێ چ بەحس و چ هەرایە**)) [1]

مەلا خدری دەشتی شاعیریش لە مەولوودنامەکەیدا بەمشێوەیە دروستکردنی زەوی و ئاسمانمان بۆ دەگێڕێتەوە:

((**پاشی خوا یەك جەوهەری لەو نورەدا**
**کردە مەنقور و دوو کەرتك بووە جوودا**
**کەرتی ئەوەل دایە چاوی هەیبەتێ**
**کەرتی پانی دایە چاوی شەفقەتێ**
**دەرکوڵی ئەو بەحرە کەفی کرد و هەم**
**دووکەڵی کردو بەجارێ بوو بەتەم**
**کەفەکەی ئەرزو دوخانی ئاسمان**
**ئەم دووە لەم دوو شتە تەرتیب دران**)) [1]

---

١- هەمان سەرچاوە، ل١٠٣.

ئەم دەقە شیعرانەی کە وەکو سرووتێکی ئاینی لە پەرستگاکان بەرهەم هێنـراون، بـەهۆی ئەوەی کە سوودیان لە تەکنیك و توخمـەکانی گێڕانـەوە وەرگرتـووە و توانیویانـە هونـەرەکانی گێڕانەوە تێکەڵی هونەرەکانی شیعر بکەن و ئاوێتەیەك دروست بکەن، کە دەکرێ وەکو بناخە و بنچینەیەك بۆ سەرهەڵدانی پەخشانە شیعر و چیرۆکە شیعر و ڕۆمانە شیعر لە ئەدەبی کوردیدا سەیریان بکەین و بەرێگەخۆشکەرێکیان بزانین بۆ سەرهەڵدانی ئەو ژانرە نوێیانە.

### لەئەدەبی فۆلکلۆریدا:

لێکۆڵینەوە و تۆژینەوە لە ئەدەبی فولکلۆری کوردی و دیاریکردنی لایـەن و پێکهاتـەکانی گەلێك گرینگە، چونکە لەلایەکەوە ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی ڕەنگدانەوەی بـارودۆخ و ژیـانی میللەتی کورد لەلایەنی سیاسی و کۆمەڵایەتیی و ئابووری و.....هتد دیاریدەکات، لەلایـەکی دیکەشەوە گەلێك ئـەزموونی ئـەدەبی وای تێدایـە کـە بـەپێی قۆناخـەکانی گەشـەکردنییەوە هاتوونەتە کایەوەو بەبێ زۆر لەخۆکردن و خۆرسـکانە سـیما و ئـەدگارەکانیان چەسـپاوە، کـە دەکرێ بکرێنە بنەمایەك بۆ گەشەسەندن و پێشخستنی ئەدەبی کوردی، هەر ئەمەشە وای لـە ڕۆژهەڵاتناسـی سـۆڤیەتی (ی.و. فـاریزۆف)کردووە لـەبارەی فۆلکلـۆری کوردییـەوە بڵێـت: ((فۆلکلۆری کورد لە ڕووی هونەری هەمەچەشنە و بابەتەکانیـەوە شـوێن و پلـە وپایـەی لـە ڕیزەکانی پێشەوەی فۆلکلـۆری ڕۆژهـەڵاتی نـاوین و نێزیکـدا دیـارە)) [٢]. لەبەرئـەوەش کـە ((ئەدەبی کوردی لەپلەی یەکەمدا فۆلکلۆری کوردی یە، لەو فۆلکلۆرەدا هەر تـەنیا پاشمـاوەو میراتی نەوەو پێشەکانی پێشوو نابینرێ، بگرە ئەمرۆش ئەو فۆلکلۆرە بەڵگەیە بۆ بەتوانایی لە ژیانداو بۆ ڕەنگینی ی هێزی بەرهەم هێنان، کە ڕۆژ بە ڕۆژ دەوڵەمەندیی ئەو بەرهەمـە تـازە ئەکەنەوە و فرەوانتر و زیاتری ئەکەن)) [٣] و بەمـەش بەشـەکانی ئـەدەبی فۆلکلـۆری کـوردی بناخەیەکی پتەو دروست دەکەن بۆ گەشەسـەندنی ئـەدەبی کـوردی. لـەم ڕوانگەیـەوە ئەگـەر

---

١- هەمان سەرچاوە، ل١٠٣.

٢- رازاو ڕەشید سەبری، چیرۆکی منداڵان لە ئەدەبی کوردیدا(١٩٩١ ـ ٢٠٠٥)، بڵاوکراوەی ئەکادیمیای کوردی، هەولێر ـ کوردستانی عێراق، ٢٠١٠، ل٣٥.

٣- کامەران موکری( محەمەد ئەحمەد تەها)، ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی، بەشی یەکەم،چاپخانەی زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر ١٩٨٤، ل٣٧.

ئاورێك لە فۆلكلۆری كوردی بدەینەوە، ئـەوا ڕەگ و ڕیشـاڵی ڕۆمانـە شـیعر لـە گـەلێك لـە بەشەكانیدا هەست پێدەكەین. لەوانە لەدێرزەمانەوە كاتێـك لەبـەر ئاگردانـدا شـەوان بـاب و باپیرانمان بە گێڕانەوەی حیكات شەوچەرەیان گەرم و بەجۆش دەكرد، ئـەو حیكایەتانـە ئەگـەر زۆرینەشیان لە چوارچێوەی قالبی پەخشاندا بن، ئەوا هەندێك لەو حیكایەتانە لە لایەن شاعیرە میللییە بەتوانایانەوە دەخرانە دوو توێی دەقی شـیعرییەوە، یـاخود بەشـێوەیەكی تێكـەڵ لـە پەخشان و شیعردا ئەو حیكایەتانە دەگێڕدرانەوە، ئەو حیكایەتانەش بەگـەلێك شـێواز و جـۆر دادەڕێژران لەوانە لەسەر زاری گیانەوەرانـەوە ڕووداوەكـان ڕێكـدەخران و گیانـەوەران دەبوونـە پاڵەوانی ڕووداوەكان كە ئەمەش زیاتر بۆ منداڵان دەهۆنراوەنـەوە بـە حیكایـەتی گیانـەوەران دەناسرا، یاخود حیكایەتی خەیاڵی و پڕوپوچ و حیكایەتی ئەفسانەیی و دڕو جانەوەر....هتـد. یەكێك لەم جۆرە حیكایەتانە، حیكایەتی (كێزا خاتوین)ـە، كـە بـاس لـە منـداڵێك دەكـات لەگەڵ باوكی بە هۆی ئەوەی كە مشك كەسێكی نێزیكی لەدەست خۆی داوە، سەرەخۆشی لـێ دەكەن و داوای خۆڕاگری و سەبری لێ دەكەن:

**(( كچكێ گوتە بابێ خۆ**

**كێزا تەڕەجوان**

**كەتە دیزا پان**

**نەمان هەستیخان**

**مشكێ خولیسەر**

**سویارێ شاشك شین**

**ڕەزڤانێ خەمگین**

**ئاڤا شێل و بێل**

**گارسێ سەر نخوین**

**دارا بەلگ وەرین**

**قەلا سەر بخوین**

**كچكا سەر دەوین....هتد))** [1]

١- موحسن عارف سالح، چیرۆكا زارۆكان لە دەڤەرا بەهدینان ( ١٩٨٠ـ ٢٠٠٤)، دەزگای سپیرێز بۆ چاپ و بلاوكردنەوە، دهۆك ـ كوردستانی عێراق، ٢٠٠٧، ل١٠٣.

هەروەها لە گەلێك بۆنەی كۆمەڵایەتیی و ئابوورییدا كورد لە ڕێگەی ئاوێتەكردنی گێڕانەوە و بەسەرهات لە قالبی شیعریدا، چەندین ڕووداوی خستۆتەڕوو بەتایبەتیش لە كاتی ماتەمین، هەروەها لەكاتی خۆشی و شادی و لەكاتی كاركردن و دروێنە و ساواركوتان و...هتد، بۆ نموونە لە ساواركوتاندا لە شەوانی پایز كچان و كوڕان كۆدەبوونەوە و بەدەم ساواركوتانەوە چەندین بەسەرهات و چیرۆكیان لە چوارچێوەی دەقی شیعریدا ڕێكدەخست و بە ئاوازێكی پڕ لەجۆش و خرۆشەوە دەیان گێڕایەوە. ئەم جۆرە بەسەرهات و چیرۆكانەش بەپێی قۆناخی ساواركوتانەكە دادەنرا، لە دوای تەواوبوونی ساواركوتانەوەش دەمەتەقێی نێوان كچ و دایك دەستی پێ دەكرد، كە بەمشێوەیە بوو:

**((ماری تەنكەی لەقەد گردی — دایكی گوتی ماچیان كردی**
**كچ: بەپێشماڵیان ڕابردم — هێشتا دوور بوو گازی كردم**
**سەگیان دڕبوو لێی پاسكردم — جەڕەم خوار بوو لۆی ڕاست كردم**
**دەستی ڕاستی لەملی كردم — بە دەستی چەپی مەمكی گرتم**
**بەزۆرداری ماچی كردم**
**دایك: ئەریَ كیژم چەند عەییاری — شەقت نەكەی وەك خەییاری**
**تۆ كیژەكی خۆش گفتاری — كیژ ماچ ناكریَ بە زۆرداری**
**كچ: ئەریَ دایە مەمكە لۆمە — ئەو هەتیمە جەرگی خۆمە**
**دایك: ئەریَ كیژم ناتكەم لۆمە — سەرم سپییە و پشتم كۆمە**
**ئەو فێرانە لەمەڕ خۆمە))** [1]

ئەگەر تەماشایەكی وردی ئەم دەقانە بكەین، دەبینین تەكنیك و توخمەكانی گێڕانەوەیان لەخۆدا هەڵگرتووە و جۆرێك لە چیرۆك و بەسەرهاتێكیان تێدا دەگێڕدرێتەوە كە دەكریَ بە بنەما و زەمینەیەك بۆ سەرهەڵدانی ڕۆمانە شیعر و چیرۆكە شیعر لە قەڵەمیان بدەین.

لە یارییە كوردەوارییەكانیشدا چەندین دەق دەبینین كە گێڕانەوەی ڕووداوێك لە خۆ دەگرن و ڕووخسار و سیمایەكی چیرۆكە شیعر یان ڕۆمانە شیعریان لیَ بەدی دەكرێت، بۆ نموونە لە یارییەكی كوردەوارییدا باس لە ژیانی دوایی دەكات:

١- د. شوكریە ڕەسووڵ ئیبراهیم، ئەدەبی فۆلكلوری كوردی، بەشی دووەم، چاپخانەی زانكۆی سەلاحەدین، ١٩٨٤، ل١٢٢-١٢٣.

**(( فاته مەگری مەگری**
**پێکرا بچینە قەبری**
**قەبری تەنگ وتارە**
**پڕ لەمشك و مارە..هتد))** [1].

لێرەشدا باس لە ژیانی ناو قەبر و ڕۆژگاری دوای مردنی مرۆڤ دەکات و بە شێوەی دایەلۆگ لەنێوان گێڕەرەو کارەکتەری سەرەکیی کە ناوی فاتەیە ڕێکخراوە و ئامانجیش قەناعەت پێکردنی خۆشەویستەکەیەتی بە پرۆسەی خۆشەویستەییەکەیان ئەمیش لەرێگای ئامۆژگاریکردنی بە کورتی ماوەی ژیان و ئاگەدارکردنەوەی لە ژیانی دوایی.

لە گۆرانی کوردیشدا گەلێك بەسەرهات و کارەسات لە دوو توێی قالبی دەقی شیعریدا گێڕدراونەتەوە و بەهۆیەوە خەم و خەفەتی خۆیانیان تێدا بەیان کردووە، بۆ نموونە لە بەستەی شایی ((هێ برام سەرێ من دێشێ))دا هۆنەر ڕووداوگەلێکی خۆشەویستی و نەتەوەیی لەشێوەی بەستەدا ڕێکخستووە کە هەم ئەم چیرۆکانە درێژییەکی بەرچاویان هەیە و هەمیش تەکنیك و توخمەکانی وەکو ڕووداو وکارەکتەر و دایەلۆگ و مەنەلۆگ و کات و شوێن..... تاد، تێدا بەرچاو دەکەون و هەروەها جۆرێك لە گێڕانەوەشی تێدا ڕەچاو دەکرێت:

**((دەستم کردە گۆتنێ**
**دەستم لە کەلەمچەیە**
**سواری جێبەکی دەبووم**
**هاتم لە دیبەگەیە**
**داکی کیژان ئیخبار کرد**
**ئەمنیان برد لۆ قشرەیە**
**حاکم ئیفادەی پرسیم**
**دەرێ کوڕم مەحکوومی**
**مادەت سەت و سێزدەیە**
**بێ خەتاو بێ هووچەیە**
**کتابەکەم دەنووسی**

١- تارق جامباز، سەرەتای خوڵقان لەدەقەکانی کوردیدا، ل١٠٢.

**لۆ عامی دیبەگەیە**
**کیژ ئیزرابیان لۆ کردم**
**گرتیان دەرکی قشرەیە**
**ئەگەر لۆمان بەرنەدەن**
**دەکەین موزاهەرەیە**
**عافەریم لە بۆ کیژان**
**ئەمنیان کرد تەبریەیە....هتد))** [1]

لەم دەقەدا هۆنەر پرۆسەی خۆشەویستی بە چەندین ڕووداو و شوێن چوواندووە، هەر لەم دەقەشدا ڕووداوی کۆتایی هاتنی شۆڕشەکەی شێخ مەحموودی حەفیدی تێکهەڵکێشی دەقە شیعرییەکەی کردووە و بەشێوەیەك هەم ئاخ و خەم لە یارەکەی خۆی، هەمیش لە کۆتایی هاتنی ئەم شۆڕشە دەخوات.

ئەوەی لە ئەدەبی فۆلکلۆریدا بەرچاوەو دەکرێ وەکو ئەزموونێکی سنوور شکاندنی نێوان ژانرەکان لەقەڵەمی بدەین (حەیران)ـە. حەیران دەکرێ وەکو یەکەمین فۆرمێکی فەرمی ئەدەبی لە ئەدەبیاتی کوردی دابنرێت، کە سنووری نێوان ژانرەکانی تێکشاندووە و لە یەك کاتدا بۆ داڕشتنەوەی دەقەکەی خۆی سوودی لە هونەرەکانی پەخشان و شیعردا وەرگرتووە. دیارە حەیران وەکو دەقێك لەلایەن لێکۆڵەرو ڕەخنەگرانەوە بەشیعر لەقەڵەم نەدراوە،بگرە بە پەخشانە شیعر دانراوە، ئەوەتا ( غەفوور مەخموری) لەمبارەیەوە دەڵێت: ((لەڕاستیدا حەیران شیعر نییە، بگرە پەخشانە شیعرە)) [2]، هەروەها خالید جوتیاریش هەمان ڕای هەیە و دەڵێت: ((حەیران پارچە پەخشانێکی پاراو ناسکە، بەزمانێکی سادەی خۆمانە نووسراوە دەشێ "پەخشانە شیعری" پێ بگوترێ)) [3]، ئەحمەد حەیرانیش هەمان ڕای هەیە و دەڵێت: ((شێوەی

---

١- پ.ی. د. هیمداد حوسێن، ئەدەبیاتی فۆلکلۆری کوردیی، چاپخانەی شەهید ئازاد هەورامی، کەرکووك ـ٢٠٠٧، ل٢٨-٢٩.

٢- غەفوور مەخمووری، هەگبەی مەخمووری (کۆبەرهەم)، بەرگی یەکەم، چاپخانەی منارە، هەولێر ـ ٢٠١٠، ل١١.

٣- خالید جووتیار، کورتە سەرەتایەکی حەیران، گۆڤاری ( ڕۆشنبیری نوێ)، ژ (٦٣)، ئەیلول و تشرینی یەکەمی ١٩٧٧، ل٤٢.

داڕشتنی دەچێتەوە سەر پەخشانە هۆزان))[1]. واتە حەیران تێکستێکە هەردوو ژانری شیعر و پەخشانی لەخۆیدا کۆکردووەتەوە و یەکێکە لەو دەقانەی کە دەتوانین بە دەقی کۆکەرەوەی ئەم دوو ژانرەی لەقەڵەم بدەین. دیارە پەخشانە شیعریش لەڕووی هونەرییەوە چەمکێکی ئەدەبییە بۆ زمان و ئەدەبیاتی ئەوروپی بەگشتیی و ئەدەبیاتی فەرەنسی بەتایبەتی دەگەڕێتەوە، کە برێتییەلە تێکەڵاوکردنی هەردوو ژانری شیعر و پەخشان و ئەم تێکەڵاوکردنەش بۆ نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەم دەگەڕێتەوە، کەپێش ئەم مێژووە بە ئاسانی دەتوانرا شیعر لە پەخشان جیا بکرێتەوە، کەچی دوای سەرهەڵدانی ئەم چەمکە پرۆسەی تێکشاندنی سنوورەکانی شیعر و پەخشان و تێکەڵاوکردنیان دەستی پێکرد[2]. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت لە ڕۆژگارێکی دێریندا و پێش ئەوەی بەشێوەیەکی هونەری لەئەوروپا بیر لە تێکەڵکردنی شیعر و پەخشان بکەنەوە، لەلایەن هۆنەرانی کوردەوە بێ ئەوەی بەمە بزانن و هەستی پێ بکەن، سنوورەکانی شیعر و پەخشانیان کاڵ کردووەتەوە و لە چوارچێوەی دەقی حەیراندا تێکەڵ و ئاوێتەی یەکدییان کردوون، کە ئەمەش دەکرێت وەکو ئەزموونێکی ئەدەبی بەنرخ سەیری لێ بکرێت و ببێتە بناخە وزەمینەیەکی لەبار و ڕۆشن بۆ سەرهەڵدان و گەشەکردن و نەشونماکردنی هونەری چیرۆکە شیعر و پەخشانە شیعر و ڕۆمانە شیعر لە ئەدەبی کوردیدا.

**لە ئەدەبی کۆندا:**

لە ئەدەبی کۆنی کوردیدا لەبارەی ڕۆمانە شیعرەوە ڕووبەڕووی جۆرێك لە ئیشکالییەتێك دەبینەوە، کە ئەویش خۆی لە ڕاوبۆچوونی جیاواز لەبارەی ڕۆمانە شیعردا دەبینێتەوە، بەو واتایەی کە کۆمەڵێك دەق لەبەردەستان لەبارەی ناسنامەکەیان ڕاوبۆچوونی جیاواز هەیە، ئەمە لە لایەك، لە لایەکی دیکەشەوە لەسەرەتا و ناوەڕاستی سەدەی بیستەمدا و بەتایبەتیش پاش نوێکردنەوەی ئەدەبی کوردیدا، کۆمەڵێك ڕەخنەگر و لێکۆڵەر لەبارەی ڕوونکردنەوەو توێژینەوەی دەقەکانی ئەدەبی کۆن ئەم ڕاو بۆچوونە جیاوازانەیان لەبارەی ڕۆمانە شیعر دەربڕیوە، ئەوەی جێگەی بایەخە ئەوەیە کە لەم ماوەیەدا بۆ یەکەمجار زاراوەی ڕۆمانە شیعر لە

---

١- جەمیل سنجاوی، حەیران و چەند بۆچوونێکی تر، چاپخانەی منارە، هەولێر ٢٠١٠، ل٣٩.

٢- د.موحسین ئەحمەد عومەر، فەرهەنگی زاراوەی ئەدەبی، بەرگی یەکەم، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر ٢٠٠٥، ل٧٠.

ئەدەبی کۆندا وەکو زاراوەیەك هاتووەتە ناوەوە و لەلایەن ڕەخنەگر و لێکۆڵەرانەوە باسی لێوەکراوە، ئەگەر چیش دەقێکی دیاریکراویشی لەبارەیەوە بەرهەم نەهاتبێت.

یەکەمین کەس، کە زاراوەی ڕۆمانە شیعریان لە ئەدەبی کوردیدا بەکارهێنابێت و خستبێتییە پاڵ هەندێك دەقەوە (د. مارف خەزنەدار) بووە، کاتێك لە لێکۆڵینەوەیەك بەناونیشانی (الرواية الشعرية ليلى و مجنون في الأدب الكردي) لە گۆڤاری (مجلة كلية الآداب) لە بەغدا [1]، دواتر هەمان لێکۆڵینەوە بە زمانی کوردی لەگەڵ کۆمەڵێك لێکۆڵینەوەی دیکەدا لە دووتوێی پەڕتووکێکدا لە ساڵی (١٩٨٤) بەناونیشانی (لە بابەت مێژووی ئەدەبی کوردی یەوە) بڵاودەکاتەوە.

د. مارف خەزنەدار لەم لێکۆڵینەوەیەدا ڕۆمانە شیعر بە یەکێك لە ئەدگارەکانی نەتەوە مسوڵمانەکان لە قەڵەم دەدات و دەڵێت: ((یەکێ لە ئەدگارەکانی ئەدەبی نەتەوە مسوڵمانەکان ئەوانەی بە زواتانی هیندۆ ـ ئەورووپایی و تورکی ـ مەنگۆلی دەدوێن ئەوەیە، کە چیرۆکی شیعری لە ناویاندا باوە، ئەم هونەرە شیعرییە هەروەکو لە ئەدەبی کلاسیکی نووسراودا هەیە، لە داهێنانی میللی، نووسراویشدا باوە)) [2]. دیارە کە لەیلا و مەجنوون وەکو حیکایەتێك و ئەفسانەیەکی میللی لەناو ئەو نەتەوە مووسوڵواتانەدا بڵاوبوویتەوە و هەروەکو (د.مارف خەزنەدار) ئاماژەی پێدەکات ((شاعیری هەرە گەورەی ڕۆژهەڵات نیزامی گەنجەیی (سەدەی دووازدەمی زاین) یەکەمین کەس بوو لە حیکایەت و ئەفسانەی میللی (لەیلا و مەجنون) ڕۆمانێکی شیعری کلاسیکی دروست کرد، ئەمە لە ڕۆژگارانی فەرمانڕەوایی ئەبوو موزەفەر شیروان شادا بوو لەساڵی ٥٨٥هـ / ١١٨٩ ز. لەهۆنینەوەی بووەوە)) [3] و ئیدی ئەو کارە ئەدەبییە، کە بەزمانی فارسی بوو، بووە سەرچاوە و بەڵگەیەکی گرینگ بۆ بەرهەم گەلێکی ئەدەبی بەهەمان ناوەوە، بەڵام بەزمانی جیاواز لە نێو ئەدەبی میللەتە مووسوڵمانەکاندا، شاعیرانی کوردیش ((لەرووی ڕوخسارەوە لاسایی یان کردووەتەوە و لێ یان

---

١- د.معروف خزندار، الرواية الشعرية (ليلى ومجنون) في الأدب الكردي، مجلة كلية الآداب (بغداد)، مج ١٨, ع ٢٠، ص٢٠٥ - ٢٢٠ ص.

٢- د. مارف خەزنەدار، لەبابەت مێژووی ئەدەبی کوردییەوە، چاپخانەی ( المؤسسة العراقية للدعاية والطباعة))، بەغدا ١٩٨٤، ل١٦٧.

٣- هەمان سەرچاوە، ل١٦٩.

وەرگرتووە و دەسکاری یان کردووە، ئـەوانیش لـەرووی کێشـەوە بەرهەمـەکانیان بـە شـێوەی (مەسـنەوی) نووسـیوە و بـەزۆریش کێشـی (هـەزەج) یـان بـەکارهێناوە بـۆ گێڕانـەوەی ڕووداوەکان)) [1].

جارێکی دیکە (د.مارف خەزنەدار) ئاوڕ لە ڕۆمانە شیعری دەداتەوە و لە بەرگی دووەمـی پەڕتووکەکەی خۆی بەناونیشانی (مێژووی ئەدەبی کوردی) بەشێکی تایبەت بە ڕۆمانـە شـیعر تەرخان دەکات و تێیدا ئاماژە بەوە دەکات، کە ڕۆمانە شیعر لە پێش سەدەی هەژدەمدا لەناو کۆمەڵی کوردەواریدا باو بووە و لەدوای سەدەی هەژدەمیشدا گـەلێك بابـەتی ڕۆمانـە شـیعر هاتوونەتە بەرهەم، بەڵام تا ناوەڕاستی سەدەی بیسـتەم بایـەخێکی ئـەوتۆ بـە ڕۆمانـە شـیعر نەدراوە لەلایەن لێکۆڵەر و ڕەخنەگرانەوە و زۆربەی ڕۆمانە شیعرەکانیش بەشێوەی دەسـتنووس لە نامەخانەکانی ئەورووپاوە پارێزرابوون و ئەوانی دیکەش لە ماڵە خوێندەوارەکانـەوە وەکـو بەشێك لە شیعری لیریکی تەماشایان کراوە[2].

لەگەڵ ئەوەشدا لێتۆژ ڕای وایە کە ڕۆمانە شـیعر زیـاتر بەرهـەمی ناوچـەکانی بـاکووری کوردستانە ((یەکێ لە خەسڵەتە گرینگەکانی ئەدەبی کوردی ئەوەیە ڕۆمانی شیعری بابەتێکی سەرەکییە لە داهێنانی ئەدەبیدا. بەزۆری لـە ناوچـە شـاخاوییەکان و هەرێمـەکانی بـاکووری کوردستان دەبینرێ)) [3]. واتە لێرەدا لێکۆڵەر کاریگەرێیەتی شوێن لە بەرهـەمێنانی ڕۆمانـە شیعردا دیاری دەکات، بەڵام چۆنییەتی ئەو کاریگەرییە و هۆکارەکانی ئەوەی کە بۆچی ڕۆمانە شیعر لەم ناوچانەدا بەزۆری بەرهەم دەهێنرێن و لە ناوچەیەکی دیکـە کـەمتر بەرهـەم دێـت، بۆمان ڕوون ناکاتەوە.

هەروەها (د.مارف خەزنەدار) هەر لەم لێکۆڵینەوەیەدا لەڕووی ناوەڕۆکەوە ڕۆمانە شیعری کوردی بەسەر چەند جۆرێکدا دابەشکردووە:

١ـ ڕۆمانی قارەمانی و سوارچاکی و جەنگاوەری ( مەلحەمەی پێ دەڵێن)

٢ـ ڕۆمانی مێژوویی.

---

١- هەمان سەرچاوە، ل١٧٣.

٢- د.مارف خەزنەدار، مێژووی ئەدەبی کوردی، بەرگی دووەم، دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر ٢٠٠٢، ل٤٢٥-٤٢٩.

٣- هەمان سەرچاوە، ل٤٢٥.

٣ـ ڕۆمانی ئاینی و ئاینزایی.
٤ـ ڕۆمانی دڵداری و دەسبازی.
٥ـ ڕۆمانی کۆمەڵایەتی.
٦ـ ڕۆمانی ئەخلاقی و پەند و ئامۆژگاری[1].

جگە لەمانەش لەپاڵ ئەوەی کە ( لەیلاو مەجنوون)ی وەکو ڕۆمانـە شـیعر دیـاریکردووە، چیرۆکی ( یوسف و زولەیخاش) بە ڕۆمانە شیعر دادەنێت، بەمەش لە ئەدەبی کۆندا بەپێی ڕای (د.مارف خەزنەدار) دوو دەقی ڕۆمانە شیعر بەدی دەکەین.

لە بەرامبەردا گەلێك لە ڕەخنـەگر و لێکۆڵـەران ئـەم ڕایـەی (د.مـارف خەزنـەدار) ڕەت دەکەنەوەو هەر دوو دەقی (لەیلا و مەجنوون) و (یوسف و زولەیخا) بە داستان لە قەڵەم دەدەن. هەروەکو (د. عزەدین مسـتەفا ڕەسـووڵ) لـە پـەڕتووکی (لێکۆڵینـەوەی ئـەدەبی فۆلکلـۆری کوردی)دا ئەم دەقانە لە خانەی داستاندا پۆلێن دەکات[2].

لەم ڕوانگەیەوە ئێمەش پێمان وایە کە ئەم دەقانە زیاتر داستانن و ڕۆمانە شیعر نین، ئەمە جگە لەوەش کە خودی (د.مارف خەزنەدار) هەرچەندە وەکو یەکەم لێکۆڵەر زۆر بەڕاشـکاوانە زاراوەی ڕۆمانە شیعری بەکارهێناوەو زیاتر لە لێکۆڵینەوەیەکدا جەختی لەسـەر کردووەتـەوە، بەڵام ناوەناوەش زاراوەی چیرۆکە شیعری لـەم لێکۆڵینەوانـەدا بـەکارهێناوە و لەگـەڵ ڕۆمانـە شیعردا تێکەڵی کردووە. ئەمە لەلایەك، لەلایەکی دیکەشەوە ئەگەر سەیری دابەشـکردنەکەی بۆ ناوەرۆکی ڕۆمانە شیعری کوردی بکەین، دەبینن داستانی بە جۆرێك لە جۆرەکـانی ڕۆمانـە شیعر داناوە کە ئەمەش هەڵەیە و داستان و ڕۆمانە شیعر دوو شتی لەیەکدی جودان. هەروەها دەبوایە لێکۆڵەر بۆ ئـەوەی لـە دابەشـکردنی جۆرەکـانی ڕۆمانـە شـیعر جیاوازییـەك لەگـەڵ جۆرەکانی (ڕۆمان) بکات، وا باشبوو لەبری ڕۆمان بەتەنیا، ڕۆمانە شیعری بەکارهێنابا، واتـە بنووسرا با (ڕۆمانە شیعری کۆمەڵایەتیی، ڕۆمانە شیعری دڵداری و...هتـد) بـۆ ئـەوەی لـە جۆرەکانی ڕۆمانی ئاسایی بە ئاسانی جودا بکرێنەوە.

لەراستیدا لەچوارچێوەی ئەدەبی کۆنی کوردیدا ڕووبەڕووی کۆمەڵێك دەق دەبینەوە، کـە لە ناونان و زاراوە دانان بۆیان، هێشتا ڕاو بۆچوونی جیـاواز وەردەگـرن و لەلایـەن ڕەخنـەگر و

١- هەمان سەرچاوە، ل٤٢٥.

٢- د. عیزةدین مستةفا رِةسوولَ، لیَكؤلَینةوةی ئةدةبی فؤلكلؤری كوردی، ضاثی دووةم ضایخانةی زانكؤی سلیَمانی ١٩٧٩، ل٦٢.

لێکۆڵەرانیشەوە بەتەواوەتی ساغ نەکراونەتەوە (( نموونەیێن ڤان جۆرا ژی د زورن لێ ڕەخنەگر نەشیاینە پۆلێنکێ بۆ بکەن کانێ ئایا ئەڤ دچنە دچارچوڤی ڕومانێ یان چیرۆکی یان چیرۆکە شعرێ ژ وان چی خەج و سیامەند، مەم و زین، فەرهاد و شرین..) )) [1]. بەم واتایەی کە ئەم دەقانە ئەگەر چی بەشێوەیەکی هونەری بە ڕۆمانە شیعر لەقەڵەم نادرێن، بەشێك لە سیما و ڕووخسار و ئەدگارەکانی ڕۆمانە شیعر لەخۆیاندا هەڵدەگرن و ئەزموونێکن لە تێکەڵکردن و ئاوێتەکردنی شیعر و گێڕانەوە، کە دەکرێ وەکو زەمینەیەکی لەبار و ساز بۆ سەرهەڵدانی هونەری ڕۆمانە شیعر لەقەڵەمیان بدەین.

## باسی دووەم:پێگەی ڕۆمانە شیعر لە ئەدەبی کوردیدا:

لەسەرەتای سەدەی بیستەمدا و لەژێر سێبەری ئەو گۆڕانکارییە سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتیانەی کە ناوچەکەی بەشێوەیەکی گشتیی گرتبویەوە و هەروەها ئاشنا بوون بە ئەدەبیاتی ئەورووپا و کرانەوە بەو کلتووره جیهانییەدا و لەژێر کاریگەریی ڕاستەوخۆی ئەدەبیاتی تورکیدا، ئەدەبی کوردی نوێبوونەوەیەکی بەخۆیەوە بینی. ئەم نوێبوونەوەیە وەکو بزووتنەوەیەك تەنیا لەنوێکردنەوەی ناوەرۆك و ڕووخساری شیعریدا خۆی نەبینییەوە، بگرە لەگەڵ هاتنی ئەو تەوژمە نوێخوازییە، هەروەها بە هۆی ئەو شاعیر و نووسەرە نوێخوازانەی کە زمانی بێگانەیان دەزانی، یان لە وڵاتانی دەرەوە بەتایبەتی تورکیا و ئەورووپا دەژیان، بۆ یەکەمجار کۆمەڵێك ژانری نوێ لەناو ئەدەبیاتی کوردیدا لەدایکبوو، لەو ژانرە نوێیانەش لەلایەن شاعیر نوێخواز (عەبدلڕەحیم ڕەحمی هەکاری) یەکەم دەقی شانۆیی بەناوی ( مەمی ئالان) دەنووسرێت و لەگۆڤاری (ژین) بڵاودەکرێتەوە[2]. هەروەها لەلایەن شاعیری نوێخواز ( شێخ نووری شێخساڵح) ژانری شیعری شانۆیی لە فۆرمی ئۆپەرێتدا دێتە ناو ئەدەبی کوردییەوە، ئەویش بە نووسینی ئۆپەرێتی (ئینتیباه) کە لە ساڵی (١٩٢٥) لە ڕۆژنامەی ژیانەوە بە زنجیرە

---

١- زۆزان سادق تروانشی، چیرۆکە شیعرا کوردی، دەزگەها سپیرێز یا چاپ و وەشانێ، دهۆك ـ کوردستانی عێراق ٢٠٠٨، ل١٠١-١٠٢.

٢- د. فەرهاد پیرباڵ، عەبدولڕەحیم ڕەحیمی هەکاری ـ تازەکردنەوەی شیعری کوردی و داهێنانی شانۆنامە لە ئەدەبیاتی کوردیدا،ل ١٠٧.

دابەزیوە[1]. سروود وەکو ژانرێك لە سەر دەستی زێوەری شاعیر هاتە نێو ئەدەبیاتی کوردییەوە و کۆمەڵێك سروودی بۆ قوتابیان و منداڵانی کورد دانا[2]. هەروەها لەلایەن پیرەمێردی شاعیرەوە ڕۆمانی (کەمانجەژن) وەرگێڕدرایە سەر زمانی کوردیی. لەلایەن (جەمیل سائیب)یشەوە چیرۆك وەکو ژانرێك لە ئەدەبی کوریدا دەچەسپێت، ئەویش بە بڵاوکردنەوەی چیرۆکی (لەخەوما) لە ڕۆژنامەی (ژین)دا[3].

ئەو ژانرانە ئەگەر بە کاریگەرییەتی ئەدەبیاتی بێگانەش هاتبنە نێو ئەدەبیاتی کوردییەوە، بەڵام ڕەگ و ڕیشاڵیان لەنێو ئەدەبی فۆلکلۆری و داب و نەریتی کوردیدا هەبووە، بۆیە لەگەڵ نوێکردنەوەی ئەدەبی کوردیدا توانیان جێ پێی خۆیان بکەنەوە و لە گۆڕەپانی ئەدەبی کوردیدا خۆیان بچەسپێنن و بەردەوامی بە خۆیان بدەن و مێژوویەك دروست بکەن.

لەگەڵ ئەو بزووتنەوە نوێخوازییە و سەرهەڵدانی ئەو ژانرانەشدا، کەچی ڕۆمانە شیعر وەکو ژانرێك لەو سەردەمەدا بەشێوەیەکی هونەری سەریهەڵنەدا، بگرە لە کاتێکی زۆر درەنگتر سەریهەڵداو هاتە ناو ئەدەبیاتی کوردییەوە، دیار هۆکارگەلێك هەن لەپشت ئەم درەنگ سەرهەڵدانەی ڕۆمانە شیعرەوە، لەوانەش:

١- هێشتا شیعر سێبەری خۆی بەسەر ئەدەبیاتی کوردیدا زاڵکردبوو، بەتەواوەتی جێگەی خۆی بۆ ئەو ژانرە نوێیانەی کە هاتبوونە کایەوە بەجێ نەهێشتبوو، بەتایبەتیش هونەرەکانی پەخشانیش لەو سەردەمەدا تازە چرۆیان دەرکردبوو، بۆیە شیعر وەکو شای نێو گۆڕەپانی ئەدەبی کوردیدا درێژەی بە کاروانی خۆی دەدا.

٢- چیرۆك و ڕۆمان وەکو دوو هونەری گەورەی گێڕانەوە، تازە لە ناو ئەدەبی کوردیدا لەدایکبوون و هێشتا بە تەواوەتی لەڕووی تەکنیك و توخمەکانی گێڕانەوەدا کامڵ و پێگەیشتوو نەبوون و نووسەر و شاعیرانیش بەتەواوەتی پەیان بە ئەدگار و خەسڵەتەکانی نەبردبوو و بەسەریدا زاڵ نەببوون.

---

١- ئازاد عەبدولواحید، دیوانی شێخ نووری شێخ ساڵح، بەرگی یەکەم، چاپی دووەمی بژارکراو، دەزگەی چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر ـ کوردستانی عێراق ٢٠٠٨. ل٦٠.

٢- عەبدولواحید ئیدریس شەریف، سروود و گۆرانی نیشتمانی و بەرەنگاری کوردی لە کرمانجی خوارووودا ((١٩٣٥-١٩٩١))، نامەی ماستەر، کۆلێجی زمان ـ زانکۆی کۆیە، ٢٠٠٨، ل٥٥-٥٦.

٣- سابیر ڕەشید، چیرۆکی کوردی، ڕەخنە و لێکۆڵینەوە، چاپخانەی ڕۆشنبیری، هەولێر ٢٠٠٧. ل١١.

٣- هێشتا بارودۆخی ئەو کاتەی ڕۆشنبیری و ئەدەبی ئاشنای ئـەم ئەزموونانـەی ڕۆژئـاوا نەببوو لە تێکشکاندنی سنوورەکانی نێـوان شـیعر و پەخشـان و دروسـتکردن و هێنانـەئارای ئەزموونی پەخشانەشیعر و چیرۆکە شیعر و ڕۆمانە شیعردا.

٤- کاریگەرێیەتی هزری نەتەوەیی کە تازە لەناو کایەی ڕۆشنیرانی کورد چـرۆی کردبـوو، بەتایبەتیش لەگەڵ ئەو هەمووە شۆڕش و ڕاپەڕینەی کوردا، کە ئەمەش زیاتر ڕۆڵی ئەدەبی لە خزمەتی ئەو هزرە نەتەوایەتییەدا قەتیس کردبوو و ئەرکی پاراستنی میللەت و زمان و خاکی لە ئەستۆدا هێشتبووە، ئەمەش شاعیران و نووسەران لە ئیلتیزامکردن بەو ئەرکە نەتەوەییە و هەوڵدان بۆ بەجۆشکردن و بەرەوپێشبردنی پێوەست کردبوو و بواری ئـەوەیان لا نـەمابۆوە کـە خۆیان بۆ ئاشنا بوون بەو ئەزموونە نوێیانەی ڕۆژئاوا تەرخان بکەن.

٥- بەشێوەیەکی گشتیی ئەو ئەزموونە هاوچـەرخانەی ڕۆژئـاوا لـەو سـەردەمەدا هێشـتا نەگوازرابوونەوە بۆ نـاو ئـەدەبیاتی ڕۆژهـەڵات، بەتایبـەتیش ئـەدەبیاتی تـورکی و عـارەبی، بۆنموونە ئەدەبیاتی عەرەبیش لەکۆتاییەکانی سەدەی بیستدا ئەم ژانرە نوێیەی تێدا لەدایکبوو.

سەرەڕای ئەمانەش دەکرێ لەهەندێك دەقی ئەو سەردەمەدا هەناسەی ڕۆمانە شیعر بـەدی بکەین، بەتایبەتیش لە هـەردوو دەقـی هاوینـە گەشـتەکەی گۆرانـدا بەناونیشـانی (گەشـت لەهەورامان)(گەشت لە قەرەداغ)دا. هەڵبژاردنمان بۆ ئەم دوو دەقەی گۆرانی شـاعیر بـۆ ئـەوە دەگەڕێتەوە، کە ئەم دوو دەقە لەلایەن ڕەخنەگر و لێکۆڵەرانی دیکەشـەوە، لـە بۆتـەی ژانـری دیکەدا مامەڵەیان لەگەڵدا کراوە، بۆ نموونە (د.عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ) پێی وایـە کـە ئـەم شیعرە (( بریتی یە لە بابەتە هۆنراوەیـەکی چـیرۆك ئـامێز)) [1]. هـەروەها (ئـازاد ئەحمـەد مەحموود) ئەم دوو دەقە شیعرەی لە خانەی پەخشانە شیعر و چامەی درێژ داناوە و دەڵێـت:(( ئەم چەشنە شیعرە مێژوویەکی لك و پۆپداری لەناو ئەدەبی کوردیدا بۆ خۆی تایبەت کـردووە. هـــەر لـــە دوو چـــامە هەواڵئامێزەکـــەی "نـــالی و ســـالم" تـــا دوو هاوینـــە گەشـــتە فۆتۆئامێزەکەی"گۆران"))[2].

---

١- د. عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ، ئەدەبیاتی نوێی کوردی، چاپخانەی خوێندنی باڵا، هەولێر ١٩٩٠. ل١٤٢.

٢- ئازاد ئەحمەد مەحموود، شەش لێکۆڵینەوەی شیعری، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر ٢٠٠٨. ل٥٧-٥٨.

گۆران ئەم دوو دەقەی دابەشی سەر چەند بەشێك کردووە، لە( گەشت لەهەورامان)دا دابەشی سەر (١٠) بەش کراوە، هەر بەشێك ناوی خۆی بۆ دیاریکراوە کە ئەمانەن ( دیمەنی ڕێگەوبان، ڕێگەی ناوباخ، دێ، ژینی دیوەخان، مەلای دیوەخان، بەیان، مزگەوت، کانیی ژنان،ژن، گۆرانی). بە پێچەوانەوە لە ( گەشت لە قەرەداغ)دا کە دابەشی سەر (٢١) بەش کراوە، بەشەکان تەنیا ژمارەیان بۆ داندراوەو ناوی تایبەتی خۆیان نییە. لەهەردوو دەقەکەشدا پێشەکییەك کە زانیاریی لەبارەی نووسینی دەقەکانەوە لەخۆگرتووە بەناونیشانی (سەرەتا) لەلایەن نووسەرەوە تۆمارکراوە[1]. لەم دەقانەدا ئێمە ڕووبەڕووی چیرۆك و بەسەرهاتێك دەبینەوە کە ((سەرەتا و کۆتایی هەیە و ڕووداوەکان یەکدی تەواو دەکەن)) [2]و وێنەیەکی تەواوی چیرۆکمان پێشکەش دەکەن کە تەکنیك و توخمەکانی گێڕانەوەیان لەخۆیاندا هەڵگرتووە. هەرچەندە ئەم دوو دەقە بە گەشتنامە ناونراوە و لەئەنجامی گەشتی شاعیر بۆ ئەم ناوچانە هاتووەتە کایەوە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو داڕشتنەی کە گەشتنامەکەی پێ نووسراوەتەوە، داڕشتنێکە تێکەڵ لە شیعر و گێڕانەوەیە. گەشتنامەش ((بەگشتیی لەسەر دوو کۆڵەکە دەوەستێ، یەکێك تۆمارکردنی بینین و گوێ بیست و بەڵگەنامە کۆکردنەوەیە. دووەم: وەسف کردن و داڕشتنێکی ئەدەبیانە)) [3] یە، کە بتوانێت سەرنجی خوێنەر بۆخۆی ڕابکێشێت، دیارە گۆران لەمەدا لە تێکەڵکردنی هونەرەکانی شیعر و هونەرەکانی گێڕانەوەدا سەرکەوتنی بەدەستهێناوە.

ڕووداو لە ( گەشت لەهەورامان)دا بریتییە لە باسکردنی چەند گەشتێکی شاعیر بۆ ناوچەی هەورامان و تێیدا ئاماژە بە ژیانی ناو دێ و دیوەخانی دەرەبەگ و هەڵسوکەوتی ناو مزگەوتان و کانیی ژنان کراوە و ئەو دیمەنانە وەکو زنجیرە ڕووداوێك بەیەکتری بەستراونەتەوە و لەدواییدا وێنەیەکی گەورەی ڕووداوەکەمان پێشکەش دەکەن کە بریتییە لە گەشتکردن بۆ ئەو ناوچانەوە. بەهەمان شێوە ڕووداو لە ( گەشت لە قەرەداغ)دا بریتییە لەگەشتێکی شاعیرە، کە لەسلێمانییەوە دەست پێدەکات و لە دێی (سەیوسێنان و داریزەرد و قۆپیی قەرەداغ) کۆتایی

١- عەبدوڵڵا گۆران، دیوانی گۆران، چاپی دووەم، نشر پانید، تاران ١٣٨٥. ل١١٧-١٢٩.

٢- د. فازیل مەجید مەحموود، سروشت لە شیعری گۆراندا، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، کوردستانی عێراق ٢٠٠٧. ل٩٧.

٣- عەبدولڕەزاق بیمار، پەخشانی کوردی، دار الحریة للطباعة، بەغدا ١٩٩٨. ل١٨٢.

پێدێت، لەم دەقەشدا گۆران بەوردی ڕووداوگەلێکمان پێشکەش دەکات لەرێگای باسکردنی ئەو وێنە وتابلۆیەی دێ و باخ و ڕێگەو بانەکانی ئەم ناوچانەوە ودواتر بەوردی ڕووداوی بوك گواستنەوەیەك لە دۆکان دەگێڕێتەوە هەر لە داوەتکردنەوە تادەگاتە هێنانی بووك و شایی و هەڵپەرکێیەوە.

جێگەی باسە هەرچەندە گۆران وەکو کامێرامانێك وەسفی ئەم ناوچانەی بۆ کردووین، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەست و نەستی تایبەتی خۆشی لەگەڵدا تێکەڵکردووە، بۆنموونە لە لە( گەشت لەهەورامان)دا کاتێك گەشتی ڕووداو دەگاتە گوند بەمشێوەیە دەدوێت:

**خانووی بەگزادە لەسای دەرختا　　ئارامیی بووکە لە کۆشی بەختا**

**خانووی ئەهالیش زۆریان دوو نهۆم　　هەندێ قیچ و قیت، هەندێ لارو کۆم**

**یەك لەسەر یەکتر، بەرەو لووتکەی کێو　　بۆ ئاسمان ئەچن وەك پێپلکەی دێو!**

**لەدێدا کام جێت گەورە بەرچاو کەوت:　　ماڵی ئاغەیە و خانەقا و مزگەوت!**

**(دیوانی گۆران ل ١١٨)**

لەم کۆپلە شیعرەدا، بە ئاشکرا بیروبۆچوونی شاعیر بەدیار دەکەوێت لەبارەی جیاوازی چینایەتی، کە خانووی خەڵکی وەکو بەڵگەیەك لەسەر هەژاری و نەبوونی خەڵکی بەگشتیی و دەوڵەمەندی و دەستڕۆشتووی ئاغا بەتایبەتی بەکارهێناوە ((بەمشێوەیە دەبینین لە کلاورۆژنەی وەسفی خانووەکانەوە جیاوازیی چینایەتی ڕەمەکی خەڵکەکەی دەرخستووە لەگەڵ بەگزادە و ئاغادا)) [1]، لەم گۆشەنیگایەوە بیروڕای خۆی خستۆتە نێو دەقەکەوە. ئەمەش ئەوە دەردەخات کە گەشتی شاعیر ((سەرباری وێنەگرتنی کامێرە ئاسای دیمەن و وێنە و دیاردەکانی ژینگە و تۆمارکردنی ئەو زانیارییانەی بە وێنەکانەوە پێوەندیی دارن، سەرباری ئەمەش دەربڕینی گۆشەنیگا و هەست و هۆش و سۆزی پەسەندی و ناڕەزایی نووسەرەکەیە)) [2].

ئەوەی تێبینی دەکرێت ئەوەیە گۆران لە داڕشتنی ڕووداوەکانی ئەم دوو دەقەدا سوودێکی زۆری لە هونەری سینەما و بەتایبەتیش بەکارهێنانی دیمەن وەرگرتووە و زۆر شارەزایانە دیمەنی ڕووداوەکانی لە خاڵ وشوێنێکەوە بۆ خاڵ و شوێنێکی دیکە گواستۆتەوە و بەبێ ئەوەی خوێنەر هەستی پێ بکات و زنجیرەی وێنەی ڕووداوەکان تێکبدات.

---

١- د. فازیل مەجید مەحموود، سروشت لە شیعری گۆراندا، ل٥٨.

٢- عبدالرزاق بیمار، پەخشانی کوردی. ل١٨٣.

لەم دوو دەقەدا کارەکتەر ڕۆڵێکی پڕ بایەخی هەیـە و کارەکتـەری سـەرەکیی دیـارە کـە شاعیر خۆیەتی و خۆی ئەنجامدەری گەشتەکەیەو لەسەر زاری ئەویشەوە تەواوی ڕووداوەکانمـان بۆ دەگێڕدرێتەوە. هەرچەندە شاعیر لە هەردوو گەشتەکەیدا چـەندین هـاوڕێی لەگەڵـدا بـووە، بەڵام ناوی هیچ کامێکیان لە ناو ڕووداوەکاندا نەهاتووە و ئەرکی گێڕانـەوەی ڕووداوەکانیشـان لەئەستۆدا نییە و تەنیا ئەوە نـەبێت کـە شـاعیر زیـاتر بـە جێنـاوی یەکـەمی کـۆ ( ئێمـە) ڕووداوەکان دەگێڕێتەوە کە ئەمـەش ئاماژەیـە کـە چـەند کەسـانێك لەگـەڵ شـاعیردا بوونـە لەگەشتەکەیدا. لەگەڵ ئەوەشدا چەندین کارەکتەری لاوەکی لەنێو دەقـی ڕووداوەکانـدا هـەن وەکو( مەلا، ئاغا، ژن، پیرێژن، بووك، زاوا، لاو، کچ...هتد)، کە لە گێڕانـەوی ڕووداوەکانـدا بەشدار دەکەن.

دایەلۆگ وەکو تەکنیکی گێڕانەوە لەلایەن شاعیرەوە بـەکارهاتووە و تێکـەڵی دیمەنـەکانی نێو گەشتەکەکراوە و بەهەردوو شێوازەوە، واتـە دایـەلۆگی ڕاسـتەوخۆ و ناراسـتەو خۆیـەوە، بۆنموونە لەدایەلۆگێکی ڕاستەوخۆدا شاعیر دەمەتەقێی لەگەڵ پیری ناو باخێکدا دەکات:

**سەلامون عەلەیك، مامەی بن دار گوێز،        سەلامی مانوو لە پیری بێ هێز!**
**ـ مەرحەبا سەرچاو، بەچکەی کاکۆڵ قیت      سمۆرەی سەردار، ڕۆڵەی زرنگ و زیت!**
**(دیوانی گۆران ل ١١٧)**

هەروەها لە دایەلۆگێکی دیکەدا، کە بەشـێوەی ناڕاسـتەوخۆ داڕێـژراوە، لەگفتوگۆیـەکی شاعیر لەگەڵ کەسێکی کوێردا، کوێرەکە بەمشێوەیە دەدوێت:

**وتی: دوو مانگە گل لە چاومایە        ڕێی دوور پێوانم بۆ نووشتەی بابە!**
**یا پیر،بەیەك گەز ڕیش کەی ڕەوایە        بۆ چاو بێت، لەڕێ کوێرایی دایە؟!**
**(دیوانی گۆران ل ١٢٤)**

کات و شوێن وەکو دوو توخمی گرینگی گێڕانەوە لەم دوو دەقەدا زۆر باڵادەستن و سـێبەری خۆیان بەسەر تەواوی ڕووداوەکاندا کردووە. دیارە ئەم گەشتانە بـە هـاوین ئەنجامـدراون بۆیـە شاعیر ناوی ناون (دوو هاوینە گەشت)، کە ئەمەش کاتەکەی دیاری کردووە و ڕەنگی داوەتەوە لەسەر ناوەرۆکی ڕووداوەکاندا. شوێنیش ڕۆڵێکی گەورەی گێـڕاوە لـەم دوو دەقـەدا، هـەر لـە ناونیشانیان کە بریتییە لە (گەشت لە هەورامان)(گەشت لە قەرەداغ)دا، کە دیـارە نـاوی دوو

شوێنی دیاری کوردستانن و بە دەستنیشانکردنیشان سنووری شوێن لەم دوو دەقەدا کێشراوە، لەگەڵ ئەوەشدا گۆران لە دەقی ( گەشت لەهەورامان) تەنیا لە ناونیشانی سەرەکیی دەقدا ناوی (هەورامان)ی هێناوە، کەناوێکی تایبەتییە، ناوەکانی دیکە زیاتر ناوێکی گشتین (دیوەخان، مزگەوت، کانی ژنان، دێ...)، کەچی لە (گەشت لە قەرەداغ)دا، ناوی شوێنەکانی کە گەشتی بۆ کردوون بەتەواوتی بردووە، تەنانەت گۆران لە شیعرەکانیدا ((بە هیچ جۆرێك ناوی شوێنی نەبردووە تەنیا لە گەشتی قەرەداغ نەبێت کە ناوی ئەو شوێنانەی بردووە، کە لە گەشتەکەدا بەسەر کراونەتەوە)) [1].

بەمشێوەیە دەبینین تەکنیك و توخمەکانی گێڕانەوە لەم دوو دەقەی گۆراندا زۆر بەئاشکرا دیارن و بەهێزن و لەبەرئەوەش دەتوانین ئەم دوو دەقە بە ڕۆمانە شیعرێکی سادە و سەرەتا لە ئەدەبی کوردیدا ئەژماریان بکەین. بەو واتایەی کە ئەم دوو دەقە ڕۆمانە شیعرێکن وەکو ڕێگەخۆشکەر و زەمینەسازییەکن بۆ سەرهەڵدانی هونەریی ڕۆمانە شیعر.

## دەقەکانی ڕۆمانە شیعر لە ئەدەبی کوردیدا:

ڕۆمانە شیعر بە شێوەیەکی هونەریی لە کۆتاییەکانی سەدەی بیستەمدا لە ئەدەبی کوردی سەریهەڵدا، لەم ماوەیەشدا چەند دەقێکی ڕۆمانە شیعر لەلایەن شاعیرانەوە نووسرانەوە، کە ئەمانەن:

**١- زێوان:** ڕۆمانە شیعرێکە لەلایەن (سەباح ڕەنجدەر)ی شاعیرەوە نووسراوە، بە یەکەمین دەقی ڕۆمانە شیعری هونەری لە ئەدەبی کوردیدا لە قەڵەم دەدرێت. واتە سەرهەڵدانی هونەری ڕۆمانە شیعر لە ئەدەبی کوردیدا بە (زێوان) دەست پێدەکات و ئەم ژانرە لەسەر دەستی سەباح ڕەنجدەر دێتە ناو ئەدەبی کوردییەوە. هەروەها یەکەم ڕۆمانە شیعری کوردیشە، کە لە شێوەی پەڕتووك لە ساڵی (١٩٨٨) چاپ و بڵاوکرابێتەوە. ئێمە لەم لێکۆڵینەوەماندا هەوڵ دەدەین بونیادی تەکنیکی و پێکهاتەی توخمەکانی ئەم ڕۆمانە شیعرە شی بکەینەوە و بیخەینە بەرباس.

**٢- ژوانگەی هەژان و ژان:** لەلایەن (جەمال شارباژێڕی) شاعیرەوە بڵاوکراوەتەوە و برێتییە لە (٢٧٠) لاپەڕەی قەبارە مام ناوەندی، کە وەکو پرۆژەیەك بۆ پاراستنی دەستنووسەکان

١- د. فازیل مەجید مەحموود، سروشت لە شیعری گۆراندا، ل١٧٥.

لەلایەن چاپەمەنی زاماوەوە چاپکراوە. ڕووداوی سەرەکیی ڕۆمانەکە، پێوەندیی خۆشەویستی نێوان دوو کەسە، کە ئەوانیش (بەهرە و هونەر)ن، هەردووکیان کارەکتەری سەرەکیی ڕۆمانە شیعرەکە پێکدەهێنن. ئەم پێوەندییە خۆشەویستییە لە نێوان ئەم دوو کارەکتەرە بەپێی گۆڕانی بارودۆخ و پیلانی کەسانی ناحەزەوە سەرناگرێت و دەگاتە بنبەست. ئەم دوو کارەکتەرە، کە بە هۆی خزمایەتی و ناسیاویی لە منداڵییەوە ئاشنای یەکدیی بوونە و هەر لەو کاتەوەش هەستی خۆشەویستییان بەرامبەر یەکتری جووڵاوە، ئەم پێوەندییە دواتر دەچێتە قۆناخێکی دیکە و لە نامەگۆڕینەوەدا خۆی دەنوێنێت. بەڵام بەهۆی دوو هۆکاری سەرەکی ئەم دوو خۆشەویستە بۆ یەکتر نابن، یەکەمیان ماڵەوەی خۆیان، چونکە باوکی کە پێشتر پێشمەرگە بووە، دواتر هاتووەتەوە بووە بە پیاوی ڕژێم و سیخوڕی بۆ ڕژێم دەکات و لە بەرامبەر ئەم کارەشدا پاداشت وەردەگرێت و بەماوەیەکی کەم دەوڵەمەند دەبێت و ژیانی دەگۆڕێت و لە گوندەوە بەرەو شار دەگوازێتەوە، بەمەش گۆڕانکارییەکی هزری بەسەر تەواوی دایك و باوکی بەهرەدا دێت و خۆیان بە خانەدان دەزانن و ڕازی نابن کچی خۆیان بە کوڕێکی هەژار بدەن ((لێرەدا جیاوازی چینایەتیش ڕۆڵی هەبووە لە بەیەکتر نەگەیشتنی (بەهرە و هونەر) چونکە هونەر سەر بە خێزانێکی هەژار بووە و باوکی بەهرە ڕازی نەبووە بەهرە بداتە هونەر)) [1]، تەنانەت نەسرین خانی دایکی بەهرەش، کە خۆی بە وەفادارترین کەس دادەنا بۆ دایکی هونەر، بەهەمان شێوە گۆڕا و پارە و سامان بووە هەموو شتێك لەلای. دووەمیان کار و کردەوەکانی (باجی حاجی خەجێ) کە وەکو کارەکتەرێکی فیتنەگێڕ دوای دیتنی بەهرە لەگەڵ هونەردا، تۆمەت بۆ بەهرە چێ دەکات. ئەمەش بۆ ئەوەیە تا بەهرە بۆ هونەر نەبێت، چونکە خۆی خوشکەزایەکی هەیە بەناوی (فاروق) و دەیەوێت بەهرە بۆ ئەو بێت.

ڕووداوەکانی ئەم ڕۆمانە شیعرە دراماتیکانە بەڕێوەدەچن، دواجار لە شاردا کاتێك بەهرە لە فەرمانگەیەك بە فەرمانبەری دادەمەزرێت، ئاشنای کەسێك دەبێت بەناوی ( فاروق)، کە هەمان ئەو خوشکەزایەی باجی خەجێیە و ئیدی شوو بە ئەو دەکات و خۆشەویستییەکەی لەگەڵ هونەردا بە مەرگ دەسپێرێت. لە بەرامبەریشدا هونەر چی لەدەست نایەت، ئەوە نەبێ کە لە کۆتایی ڕۆمانەکەدا بەداخ و کەسەرەوە بڵێت:

---

١- ئەردەڵان شوکر سابیر، تەکنیکی گێڕانەوە لە ڕۆمانە شیعرەکانی (شێرکۆ بێکەس)دا، ل ١٥.

**کاتێ ویژدان**

**دێته دووان**

**ئەی تۆ دەڵێی چی نەرگس**

**خان**

**کاتێ ویژدان**

**دێته وەرام**

**ئەی تۆ دەڵێی چی کاك**

**بارام؟!**

**باشە ئەی تۆش حاجی خەجێ**

**چ باجێکی دەخەیتە جێ**

**کە نەت هێشت دوو دڵ بگەنە**

**کام و مەرام ( ژوانگەی هەژان و ژان ل٢٦٣)**

هەرچەندە ڕووداوی سەرەکیی خۆشەویستی بەهرە و هونەرە، بەڵام گەلێك ڕووداوی دیکەش لە دەوری ئەم ڕووداوە سەرەکییەوە دەسووڕێنەوە و ڕوانگە و بۆچوونی شاعیرمان لەمەڕ ڕووداوگەلێکی سیاسی و کۆمەڵایەتیی پیشان دەدەن، لەوانە بوومەلەرزەکەی تشرینی ساڵی (١٩٦٢) و بارودۆخی شۆڕشی ئەیلوول لەگەڵ ڕژێمی عێراق، وەکو دەستپێکردنەوەی شەڕ لەگەڵ ڕژێم لە ساڵی (١٩٦٣) و شکستهێنانی گفتوگۆی نێوان سەرکردایەتیی شۆڕش و ڕژێم لە ساڵی (١٩٦٣)دا کە لەمبارەیەوە شاعیر ڕاو بۆچوونی خۆی دەردەبڕێت و دەڵێت:

**هەموو ژیرێك دەیان زانی ئەم چەتانە هی ئەوە نین**

**دانشتنیان لەگەڵ بکرێت**

**هەر ئەوەندە ڕادەوستێت**

**تا خۆی دەگرێت!**

**تا هێز ڕێك دەخاتەوە و**

**پیلانی نوێ دادەڕێژێ**

**خوێن بڕێژێ ( ژوانگەی هەژان و ژان ل١٠٤)**

هەروەها ڕووداوەکانی  شەڕی ڕەزان لە ساڵی (١٩٦٣)دا و قەدەخەکردنی هاتوچۆ لە سلێمانی و ڕەشبگیری و گرتن و ڕاوەدوونان و چەندین ڕووداوی دیکە. شاعیر لە سەرەتای ڕۆمانە شیعرەکەیدا ژمارەی کارەکتەرەکانی دەستنیشان کردووە، کە ئەوانیش (٢٩) کارەکتەرن، هەر هەموویان کارەکتەری گۆڕاون، واتە ئەوانن کە لە سەرەتاوە جۆرە کەسایەتییەك و بیروباوەڕێکن و لە کۆتاییدا تەواو گۆڕاون و کەسایەتییەك و بیروباوەڕێکی دیکەیان هەیە و بەمەش هەڵسوکەوتیشان لەگەڵدا دەگۆڕێت و ((تەنیا لەم ناوەدا (هونەر)ی سەر دەفتەری کەسانی ناو ڕۆمانەکە نەبێ وەك شەخسیەتێکی نەگۆڕ تا دواساتی دەست لێك بەردان مایەوە)) [1] و نەگۆڕا، بەو واتایەی کەسێکی چەسپاوە و لەڕووی بیروباوەڕەوە گۆڕانکارییەکی وای بەسەردا نەهاتووە. کاتی ڕووداوەکە دوو ساڵی تەواوە و گەلێك شوێنیش کراون بە شانۆی ئەو ڕووداوانە وەکو سلێمانی، چوارتا، خانەقین و دەشت و هەردوو گوندەوە. لەبارەی نووسینی ئەم ڕۆمانە شیعرەوە، شاعیر ئاماژە بەوە دەکات، کە هیچ جۆرە زۆر رلەخۆکردنێك پاڵی پێوەنەناوە بۆ نووسینی ئەم دەقە.

ئەوەی لەم دەقەدا کە شاعیر وەکو کارێکی ئەدەبی گرینگ ئەنجامی داوە ئەوەیە، کە ناونیشانی بەرهەمەکەی بە ڕۆمانە شیعر دیاریکردووە و ناسنامەکەی پێ بەخشیوە و لە دەقە شیعرییەکانی جودای کردووەتەوە و بەمەش توانیویەتی گەشەسەندنێك بە مێژووی ڕۆمانە شیعری کوردییەوە بدات و ڕێگە خۆش بکات بۆ ئەوەی سەرەتای مێژووی ئەم ژانرە تۆمار بکرێت.

**٣ـ ئەڤین ئاوی ژیانە:** لەلایەن (مەهاباد قەرەداغی)یەوە نووسراوە و بریتییە لە (١٢٤) لاپەڕە کە لەلایەن شاعیرەوە پێشکەش بە هەموو (عاشقانی ئەنفال) کراوە. لەم ڕۆمانە شیعرەدا ڕووداو بریتییە لە باسکردنی دۆزەخبوونی زەوی، ئەویش لەکاتێکدایە، کە سێ کارەکتەری سەرەکیی ڕۆمانە شیعرەکە (لاس و خەزال و سێوە)ن لە گفتوگۆیەکانی نێوانیاندا باس لەم بەدۆزەخبوونەی زەوی دەکەن و ئارەزووی ئەوە دەکەن، کە چاکتر و باشتری بکەن. خەزال و لاس، کە ژن و مێردن و کچێکیان هەیە بەناوی سێوە، دیارە لە سەرەتادا هەموویان لەسەر زەوی ژیاون، بەڵام دواتر خەزال لەسەر دەستی (ئیڤا و ئادەم) زەوی بەجێ دەهێڵێت و دەچێتە سەر هەسارەی (ئۆرانوس) و سێوەی کچیشیان لەگەڵ هاوڕێیەکانی بەرەو هەسارەی

١- کەمال غەمبار، بەرەو جیهانی شیعری چەند شاعیرێك، دەزگەی چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس،هەولێر ـ کوردستانی عێرا، ٢٠٠٨، ل ٣٥٩.

ڤینۆس دەچێت و بەتەنیا لاس لەسەر هەسارەی زەوی دەمێنێتەوە. ڕووداوی ڕۆمانە شیعرەکە بە نووسینی نامەیەك لەلایەن خەزالەوە بۆ لاسی هاوسەری دەست پێدەکات کە بریتییە لە نامەی ( هەزارو یەکەم) کە کاتی خۆی لەسەر هەسارەی زەوی نەیتوانیوە تەواوی بکات. ئەم نامەیە لە پێشەکییەك پێکهاتووە لەگەڵ سێ وێستگە، وێستگەی یەکەم بەناونیشانی ( ژوانێك لەدۆزەخ) و وێستگەی دووەم بەناونیشانی ( کەناری دۆزەخ)ە و ێستگەی سێیەمیش بەناونیشانی (دوورکەوتنەوە لەهەسارەی دۆزەخە)، دیارە پێشەکییەکە بە پەخشان نووسراوەتەوە، بەڵام سێ وێستگەکە بە زمانی شیعری ئازاد نووسراونەتەوە. ئەم تێکەڵییەش لەبەکارهێنانی شیعر و پەخشاندا ڕەهەندێکی بە ڕووداوەکاندا بەخشیوە، بەواتایەکی دیکە ڕووداوەکان خۆیان شێوازی نووسینەوەیان فەرز کردووە لەو تێکەڵییەی پەخشان و شیعردا، هەروەکو لەمبارەیەوە (زاهیر ڕۆژبەیانی) ئاماژە بەم حاڵەتە دەکات و دەڵێت: ((ڕۆمانە شیعری ( ئەڤین ئاوی ژیانە) بە ڕۆمانێکی ئاسایی دانانرێ، چونکە هەڵسوکەوت لەگەڵ ڕووداوێکی کەتواری بەڵام ناماقووڵدا دەکات و، لەبەرئەوەی پاڵەوانەکانی کەسی کارا نین لەململانێکەدا، بگرە قوربانین، بۆیە نابەجێ دەبوو ئەگەر بەکەرەستەی ماقووڵ و ئاسایی و تەکنیکە باوەکانی ڕۆمانی کلاسیکی بنووسرایەتەوە، یا وەکی دیکە دەشێ بڵێین ڕۆماننوس بەدەستی ئەنقەست نییە ئەو تەکنیك و پێکهاتەیەی لە نووسینەوەی ڕۆمانەکەدا بەکاربردووە، بگرە خودی بابەت و تێمەی ڕووداوەکەیە، ئەو شێوە و شێوازە تێکەڵەی بۆ خۆی دۆزیوەتەوە و سەپاندوویەتی))[1].

ئەو ڕووداوە کەتوارییەی بەڵام ناماقووڵەی کە زاهیر ڕۆژبەیانی ئاماژەی بۆ کردووە بریتییە لە پرۆسەی ئەنفال، هەر ئەمەشە بووەتە هۆکاری لێکدابڕانی ئەم خانەوادەیە و پەرتەوازەبوونیان، کە دیارە ڕەنگدانەوەی خودی ژیانی شاعیر خۆیەتی کە یەکێك بووە لەوانەی تاڵاوی ئەو نەهامەتییەو کارەساتانەی لەسایەی ڕژێمی بەعسدا جێژتووە و ئەمەش وەکو ئەزموونێك لە ناو ڕووداوەکانی ئەم ڕۆمانە شیعردا بەرجەستە بووە. شاعیر بۆ گێڕانەوەی ڕووداوەکانی پەنای بۆ تەکنیکی نامە بردووە، دیارە بەکارهێنانی ئەو تەکنیکەش بەمشێوە باو تەقلیدییە نەبووە، بگرە بەکارهێنانەکەی وەکو تەکنیکێك پەیامگەیاندن بووە، بەواتایەی کە نامەکە، نامەیەکی ئاسایی نەبووە کە بیخاتە سەر کاغەزێك و پوولی لێبدات و بەکەسێکدا

---

١- زاهیر ڕۆژبەیانی، کاروباری گێڕانەوە، دەزگەی چاپ و بلاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر ـ کوردستانی عێرا، ٢٠١١، ل ١٧٠.

ڕەوانی بکات[1] و تەنیا خۆی چیرۆکی ژیانی خۆی و تێبینییەکانی تێدا بگێڕێتەوە، بگرە لەڕێگای ئەم ڕۆمانەوە کەسایەتیی نامە بۆچووش، کە لاسی هاوسەرێیەتی بەشداری لە گفتوگۆیەکاندا دەکات و بەتایبەتیش لە وێستگەی دووەمدا، کە گفتوگۆیەی ناڕاستەوخۆی لاسە کەشێکی سیحری و فەنتازی بە دەقەکە بەخشیوە و بەمشێوەیە دەست پێ دەکات:

**خەزالەکەم،**
**هەر لە یەکەم دڵۆپی ئەو بارانەوە**
**هۆشم گەیشتە دۆزەخ و،**
**هەستم لای دەنگت مایەوە ( ئەڤین ئاوی ژیانە ل ٧٩)**

شاعیر لەم ڕۆمانە شیعرەدا سوودی لە گەلێك ئەفسانە و فۆلکلۆر و چیرۆکی ئاینی بینیوە وهەموویانی لە خزمەت دەقەکەیدا بەکاربردووە و بایەخێکی زۆریشی بە هێما داوە و ئەم ئەفسانە و فۆلکلۆر و چیرۆکە ئاینییانەی وەکو هێمایەك لە دەقەکەدا بەکاربردووە، لەوانەش زەوی وەکو دۆزەخێك هێما کردووە کە هەمیشە پێویستی بەوە هەیە خەڵکانی ناوی ئاگەداربکرێنەوە و ڕێنمایی بکرێن، ئەم کارەش پێغەمبەرەکان ئەنجامیان داوە. لێرەوەش شاعیر لە کۆتایی ڕۆمانەکەدا لەسەر زاری خەزالەوە بەمشێوەیە دەدوێت:

**ژینگەی ئێمە ژوانگەیە،**
**ژوانگەیەکی سێگۆشە لە ئۆرانووس، یان لە ڤینۆس،**
**گرینگە لە شوێنێکی ئەم گەردوونەدا سێوێ هەیە و،**
**هێدی هێدی پێ دەگات و گەورە دەبێ،**
**دەبێتە پێغەمبەرێك و،**
**فریای ئاوەزمان دەکەوێ، بیرێکی نوێ، پەیامی نوێ. ( ئەڤین ئاوی ژیانە ل ١٢٢)**

لەم کۆپلەیەدا ((دەستەواژەی (سێوێ هەیە و هێدی هێدی پێ دەگات) دەستەواژەیەکی (تەورییە) و دوو دیوە، هەم ئاماژەیە بۆ (سێوەی کچی (خەزال و لاس) کە وردە وردە (گەورە

---

١- محەمەد ئەحمەد حەسەن (حەمە مەنتك)، بینای ڕووداو لە چیرۆکدا، گۆڤاری ڕامان، خولی سێیەم، ساڵی یازدە، ژمارە (١١٠) کانوونی یەکەمی ٢٠٠٦ . ل٧٨.

دەبێت و دەبێتە پێغەمبەرێك) و بە (بیرێکی نوێ) و بە (پەیامی نوێ) دەبێتە (فریـاد) ڕەس، هەم لەهەمان کاتدا ئاماژەیەکە بۆ ئەو (سێوە)ی کە حەوا و ئـادەمی لەسـەر خۆشەویسـتی و سێکس و زگ و زا و پێکەوەنانی خێزان پێك هێنا و بووە هۆی لە بەهەشت دەرکردنی خۆیان و نەوەکانیان)) [1] و ئیدی لەسەر زەوی نیشتنەوە، کە بـە سـزایەکی دۆزەخیانـە بۆیـان ئـەژمار دەکرێت.

شاعیر لەسەر بەرگی پەڕتووکەکەیـدا نووسـیوەیەتی (ڕۆمانـە شـیعر) و بەمـەش ناسـنامەی دەقەکـەی ڕاگەیانـدووە و لـە دەقـەکانی دیکـەی جـودای کردووەتـەوە و لەسـەرەتا و کۆتـایی پەڕتووکەکەشـیدا وتـەی چـەند شـاعیرێك و فەیلەسـووفێکی بڵاوکردووەتـەوە، کـە پێوەنـدیی ڕاستەوخۆیان بە ڕووداوی دەقەکەوە هەیە. شاعیر لەبارەی ئەم دەقـەی خۆیـەوە لـە بیرەوەرییـەکانی خۆی کە بەناوی ( سالێك لەدۆزەخ ) بڵاوکردووەتەوە دەڵێت: ( ئەڤین ئاوی ژیانە ڕۆمانێکی شـیعری یە کە ئەویش سەرچاوەکەی دۆزەخە و، ڕووداوەکانی لە کارەساتەوە هەڵدەقوڵێت (ئەنفال و عشـق و سەحراو چاڵ). کاتی هاتبوو، سالآنێك بوو ڕووداوەکانی لەناو مێشکمدا دەسووڕانەوە و کـە دەهـاتم بیان نووسمەوە چەند دێرێك یان چەند لاپەڕەیەکم دەنووسی و ئیدی بەجێم دەهێشـت و دڵـم دەکەوتـە تەپەتـەپ...... بـەڵام کـە کـاتی هـات ئیـدی....... دانیشـتم و یـەك هەناسـە نووسـیمەوە ، نووسینەوەی ئەو ڕۆمانە یان ڕاستتر بڵێم لەدایکبوونی ئەو بەرهەمە دە ڕۆژی خایاند)) [2].

**٤ـ خاچ و مار و ڕۆژمێری شاعیرێ:** ( شێرکۆ بێکەس)ی شاعیر بیرەوەرییەکانی خۆی لـە چوارچێوەی ڕۆمانە شیعرێکدا تۆمار دەکات ئەویش بە ناونیشـانی (خـاچ و مـار و ڕۆژمێـری شاعیرێ)، لە ناونیشانەکەی ڕا دیارە کە شاعیر ڕۆژمێری ژیانی تایبەتی خۆی و خانەوادەو کەس وکارەکەی دەگێڕێتەوە. ژیاننامەی شاعیر تا ساڵی (١٩٩٦) کەساڵی دەستپێکردنی ئەم ڕۆمانە شیعرەیە، دەخایەنێت. سەرەتاش شاعیر بە ساتی لەدایکبوونی خۆی دەست پێدەکات و دەڵێت:

**(( تۆ لە گەڕەکی گاوراندا بووی و بەتۆو و لەدایك بووی**

**ژنە دیانێکی هاوسێ، مریەمێکی گوڵە هێرۆی،**

**ڕوا و لەناو تاریکیدا، گەنم ڕەنگی وەکو گۆیژە،**

---

١- زاهیر ڕۆژبەیانی، شیعرییەت لەدەرەوەی شیعر، ل ٢٢.

٢- مەهاباد قەرەداغی، ساڵێك لە دۆزەخ، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر ـ کوردستانی عێراق، ٢٠٠٥، ل ١٦.

**ناوکی بڕیت، هێشتا لەناو کاسەدا بووی،**
**مریەم بەکلۆ خەڵووزێ، لەسەر تەختی نێو چەوانت**
**وێنەی صەلیبێی کێشاو تاجە دڕکی کردە سەرت و**
**لەباوەشی نامۆیی خۆی وعیسادا، وەك کارژۆڵەیەکی تازە زاو،**
**ماچی کردی و هەڵیگرتیت))   (خاچ و مار و ڕۆژمێری شاعیرێ ل ١٠)**

ئیدی لێرەوە گەشتی ژیانی شاعیر دەست پێدەکات و ژیانی منداڵی و لاوی خۆی و دڵداری و خۆشەویستی بۆ خاك و نیشتمان و ئاوارەبوون و دوورکەوتنەوە لە نیشتمان باس دەکات و ئاماژە بەگەلێك ڕووداوگەلی تایبەت بە خانەوادەی خۆی و کەسوکارەکەی دەکات ، لەنێو ئەوانەشدا ڕووگەلێکی زۆری سیاسیش وەکو جۆرێك لەتەکنیکی چیرۆك لەناو چیرۆکدا دەخرێتە ڕوو و باس دەکرێت و تێیدا شاعیر هەم کەتواری ئەو کارەسات و ڕووداوە سیاسییانەی کێشاوە کە بەسەر میللەتەکەیدا هاتووە، هەمیش لەم گۆشەنیگایەوە بیروڕاو بۆچوونەکانی خۆی لەمەڕ ئەم ڕووداوانە دەربڕیوە. بۆ نموونە لەبارەی هەرەسهێنانی شۆڕشی ئەیلول و ئەو ڕێکەوتنامەیەی کە لەلایەن ڕژێمی بەغدا و شای ئێرانەوە بەسترا بەمەبەستی کۆتایی پێهێنانی میللەتی کورد و یاریکردن بە میللەتی کوردەوە، دەڵێت:

**((بەم جۆرە سەری تۆ تۆپێکی شووشە بوو**
**تا ساڵێك لەنێوان هەڵدان و گرتنەوەی شمشێردا**
**هات و چوو...**
**تا ڕۆژێك لە مارتا و لەبەردەم پاشادا**
**تۆپ کەوتە خوارەوە و تۆپ شکاو تۆپ ورد بوو، بوو بە خۆڵ**
**خۆڵیشیان هەر بەخۆت بە لەشی بێ سەرت، گسك دا.**
**شمشێریش پێکەنی و چووەوە کیفەکەی!)) (خاچ و مار و ڕۆژمێری شاعیرێ ل ٢٢٧-٢٢٨)**

لێرەدا و لەنێو دێرەکانی ئەم کۆپلەیەدا بەتەواوەتی بیروڕایەکانی شاعیر هەست پێدەکرێت کە میللەتی کورد هەرچەندە زوڵمێکی گەورەشی لێدەکرێت،بەڵام خۆشی هێشتا ئاگەداری ئەم جۆرە یارییە سیاسییانە نییەو وەکو تۆپێکی گێژوێژی لێهاتووە کە هەرکەسێ بێ و شووتێکی لێدەدا و ئاراستەی لایەکی دەکات بێ ئەوەی بزانێت بۆ کوێ دەچێت. دیارە باسکردنی ئەم حاڵەتەش بەمەبەستی ئەوە بووە کە هۆشیارییەکی سیاسی لەلای تاکی کورد دروست بکات.

هەرچەندە ئەم ڕۆمانە شیعرە ژیاننامەی شاعیرە و تایبەتە بە ژیانی کەسایەتییەکی ڕۆشنبیر، کەچی لەهەمان کاتیشدا ڕۆژمێرێکی وردی بارودۆخی سیاسی و کۆمەڵایەتیی کوردستانە، هەر لەو کاتەی کە ڕژێمی عێراق بەشێنەیی دەستی بە عارەبانـدنی کوردستان کردووە و هەتا هەڵگیرساندنی شۆڕشی ئەیلوول و پرۆسەی ئەنفال و کیمیابارانکردن و سووتان و رووخاندنی گوندەکانی کوردستانەوە، تا دەگاتە ڕاپەڕین و پاکتاوکردنی کوردستان لە بەعس، دواتر کۆڕەوە ملیۆنییەکەی کوردستان و بارودۆخی ئەوسای دوای ڕاپەڕین، کە دیارە کاریگەریی یەکجار گەورەی لەسەر هەست و سۆزەکانی داناوە و دەڵێت:

**(( هەمدیسان نەفرەتی خۆکوژیم هاتەوە،**

**نێو خوێن و هاتەوە ناو کاولاشی ماڵەکەم.**

**هەمدیسان ئەم دەستم ئەو دەستم ئەکوژێ و**

**ئەو دەستم سەری خۆم ئەدزێ و**

**ئەو دەستم دەمی خۆم ئەدووریْ و**

**هەمدیسان من هەر خۆم چەقۆم و**

**هەر خۆیشم تەرمەکەم)) (خاچ و مار و ڕۆژمێری شاعیرێ ل ٣٦١)**

سەرەڕای ئەمانەش ئەم ڕۆمانە شیعرە لەڕێگەی باسکردنی ژیانی شاعیرەوە، مێژوو و بارودۆخی شارێکی وەکو سلێمانی و ئەو کارەسات و نەهامەتییانەی کە دووچاری خەڵکەکەی بۆتەوە، دەگێڕێتەوە. دیارە بەهۆی ئەو کارەسات و ماڵوێرانییەی کە لەگەڵ تەمەنی شاعیردا ڕێیکردووە ((هەستی نامۆبوونێکی قووڵ لەلای شاعیردا دەبینرێت، ئەمەش زیاتر بۆ ئەو بارودۆخە دەگەڕێتەوە کە شاعیر تێدا ژیاوە، هەر لەو بارودۆخە خێزانییەی کە شاعیر تێیدا پەروەردە بووە لەگەڵ هەموو ئەو کارەسات و مەرگەساتانەی کە بەسەر میللەتەکەیدا هاتووە)) [(١)] کە وایان لێکردووە هەمیشە لە خەمی میللەت و نیشتمانەکەیدا بێت، ئەگەر لەدوورە وڵاتیشدا بێت.

**٥ـ گۆڕستانی چراکان:** ڕۆمانە شیعرێکی دیکەی ( شێرکۆ بێکەس)ی شاعیرە و تێیدا کارەساتی ئەنفال دەکاتە چەقی ڕووداوەکان و هەوڵدەدات لەم ڕێگەیەوە کارەساتەکە نەمر بکات و هەمیشە لە یادەوەریدا بمێنێتەوە و لەهەمان کاتیشدا ئەو کارەساتە بۆ نەوەکانی دواتر

١- ئەردەلان شوکر سابیر، تەکنیکی گێڕانەوە لە ڕۆمانە شیعرەکانی ( شێرکۆ بێکەس)دا، ل ٣٧.

بەوردەکارییەوە بگوازرێتەوە، بۆ ئەوەی بتوانن پەندی لێ وەربگرن و لە ژیانی ئایندەیاندا سوودی لێ وەربگرن.

شاعیر کۆتایی کارەساتی ئەنفالی کە برێتییە لەرووخانی ئەنجامدەری ئەو کارەساتە کە ڕژێمی بەعسە و هەڵدانەوەی گۆڕە بەکۆمەڵەکان لە ناوەڕاست و خوارووی عێراقی کردۆتە سەرەتای دەستپێکی ڕۆمانە شیعرەکەی و ڕووداوەکەش لەرێگای ئەو سەفەرە دەگێڕێتەوە کە بەرەوە گۆڕە بەکۆمەڵەکان ئەنجامی دەدات و بەدوای ئێسك و پروسکی میللەتەکەیدا دەگەڕێت:

**((ئەڕۆم و**
**سەفەرێکی تازەم لەبەر**
**سەفەرێ بەپێی پەتی خەمان**
**سەفەرێ بەسواری هەواڵی ناوەخت و**
**سەفەرێ بەسواری دووکەڵێ**
**کە پاشکۆ و خورجینی**
**پڕکردووە لە چاوی کوژراوی باران)) ( گۆڕستانی چراکان، ل١٢)**

دیارە گۆڕە بەکۆمەڵەکانیش ژمارەیان زۆرە و هەر گۆڕێك و هەر شەهیدێك چیرۆکی پڕ لەناسۆری لەپشتە، ئەمەش ئەرکی شاعیر قورس دەکات و توانای ئەوەی نامێنێ هەموو گۆڕەکان بەسەر بکاتەوە، بۆیە چەند کارەکتەرێك دێنێتە ناوەوە بۆ گێڕانەوەی ڕووداوەکان و هەمیش ئەو کارەکتەرانە وا دروست دەکات کە خۆیان یەکێك بوونە لەو کەسانەی کە بەڕێککەوت لەو پرۆسە بەدناوە ڕزگاریان بووە یان لەدەست ڕژێم خۆیان حەشارداوە و ئیدی گێڕانەوەیان پێ ڕادەسپێرێت، یەکێك لەم کارەکتەرانە(کاڵێ)یە کە ژنێکی ڕزگاربووی کارەساتی ئەنفالە و کاتێك دەردەکەوێت ڕووی لە شاعیر دەکات و دەڵێت:

**((شوێنم کەوە**
**دەستبگرە بە پرچمەوە**
**من ژنێکی خەڵکی "زینانە" م**
**ناوم "کاڵێ" یە**
**سەرگوزەشتەی دۆزەخ و دۆزەخەوان و**
**بەیتی حەشرو قیامەت و حیکایەتی دابڕان و**

هەڵقرچان و، هاتنەوە لەوەو دنیاوە
لەلای منە!))  ( گۆڕستانی چراکان، ل٣٠)

کەسایەتییەکی دیکەی ڕۆمانە شیعرەکە ( شاعیرێکی گەنج)ە کە لە سەربازی ڕایکردووەو خۆی حەشارداوە و دوای ڕاپەڕین لە حەشارگەکەی دێتە دەرەوە، ئیدی بەشێك لە گێڕانەوەی ڕووداوەکانی دەکەوێتە ئەستۆ. دیارە کارەکتەرێك بەناوی شاعیرەوە، بەمەبەستی ئەوەبووە کەبارودۆخی کەسانی ڕۆشنبیری ناو کۆمەڵ لەو سەردەمەدا بەرچاو بخرێت کە لەژێر چ گوشارێکدا ژیاون. کارەکتەرێکی دیکە کە بەشداری لە گێڕانەوەی ڕووداوەکان دەکات سەربازێکی شیعەیە، کە ئەویش بەدەست ئەم ڕژێمەوە دەتلێتەوە و بەزەیی بە کوردەکان دێتەوە، بەڵام ناتوانێت لەترسی پاسەوانەکان فرمێسك بڕێژێت.

هەرچەندە شاعیر لەدوای ڕاپەڕینەوە ئەم ڕۆمانە شیعرەی نووسیوە، بەڵام کاتی ڕووداوەکە بریتییە لە ساڵی (١٩٨٨) کە کارەساتی ئەنفالی تێدا ئەنجامدراوە وگەڕانەوەیە بۆ ئەوکاتانە. سەرەڕای ئەمانەش بەحوکمی ئەوەی کە ڕۆمانە شیعرەکە تەرخانکراوە بۆ باسکردنی ئەو کارەساتە، بۆیە زۆرێك لە دیمەن و وێنە و تەنانەت زمانی شیعرەکەش نائومێدی و ڕەشبینی و ناسۆرییەکی بێ وێنەیان تێدایە، بۆیە (( تاوەکو وەرگر نەکەوێتە نێو خەمێکی ڕەهاوە، شاعیر لەرێگەی مەزراندنی تەکنیکی "فلاش باك"ی کورتەوە کاتە پڕ لە خۆشی و شادی و چێژبەخشەکانی ژیانی کارەکتەرەکانی پێش ئەوەی ئیهانە بکرێن، کێشاوە و ئەو یادەوەریی گۆرانی ئامێزانەی نووسیوەتەوە کە سنوور جیاکرەوەن لەنێوان بوونی دوێنێ و لەناوچوونی ئەمرۆ)) [1]. دیارە هەڵبژادنی ناونیشانەکەش پێوەستە بەم کارەساتەوە. دەشتوانین ئەنفال بە ناونیشانی سێبەر یاخود ناونیشانی دووەمی ئەم ڕۆمانە شیعرە دابنێین، بەڵام لەبەرئەوەی کە شاعیر سەفەرەکەی لەناو گۆڕستانەکانە، بۆیە گۆڕستانیش دەکاتە ناونیشان[2].

* * *

---

١- خالد سليمان، عندما تشترط الماساة على اللغة عنفا لكل زمان ـ (مقبرة الفوانيس) للشاعر الكوردي شيركو بيكەس، www.gilgamish.org.

٢- هەمان سەرچاوە.

بەمشێوەیە ڕۆمانە شیعر لـە قـالبی هونـەری خۆیـدا لەئـەدەبی کـوردی لـەم ماوەیـەدا سەرهەڵدەدات و لەلایەن شاعیرەکانەوە بایەخی پێدەدرێت و بەرەوە پێشەوە دەبردرێت. ئـەوەی جێگەی تێبینییە ئەوەیە کە تاکو ئێستە تەنیا (٥)دەقی شیعری نووسـراونەتەوە و لـەم پێـنج دەقەشدا دوو خاڵی سەرەکیی لەناسنامەی دەقەکاندا بەدی دەکەین:

١ـ چوار دەق لەم دەقانە کەبریتین لە ( ژوانگەی هەژان و ژان، ئەڤین ئـاوی ژیانـە، خـاچ و مار و ڕۆژمێری شاعیرێ، گۆڕسـتانی چـراکان) لەلایـەن خاوەنەکانیانـەوە ناسـنامەکەیان کـە ڕۆمانە شیعرە یەکلایی کراوەتەوە و لەسـەر بەرگـەکانیان ڕاسـتەوخۆ ئاماژەیـان بـۆ کـراوە و بەمەش لە ژانرەکانی دیکەدا جیاواز بوونەتەوە.

٢ـ تەنیا دەقی ( زێوان)ی سەباح ڕەنجدەر نەبێت، کە لایەن خاوەنەکەیەوە ناسنامەکەی بـە ڕۆمانە شیعر دیاری نەکراوە و ئێمە لەم لێکۆڵینەوەیەدا لایەنەکانی شـی دەکەینـەوە و هـەوڵ دەدەین ناسنامەکەی دیاری بکەین.

## هۆکارەکانی سەرهەڵدانی ڕۆمانە شیعر:

کۆمەڵێك هۆکار ڕۆڵیان لە سەرهەڵدانی ڕۆمانە شیعر لەئەدەبی کوردیدا لە کۆتاییـەکانی سەدەی بیستەمدا گێڕاوە، ئەو هۆکارانەش بەیەکەوە زەمینەسـازی هونـەرییان بـۆ ئـەم ژانـرە خولقاندووەو لە گۆڕەپانی ئەدەبیدا کارایان کردووە. لەوانەش:

١ـ بەردەوامبوون شۆڕش و ڕاپەرینەکانی کورد کە بوونە هۆکـاری ئـەوەی شـاعیران کـە پاڵپشتی ئەو شۆڕشانە بن، هەروەها هەڵگیرساندنی شەڕی عێراق و ئێـران و کاریگـەریی ئـەو شەڕە لەسەر باری ئابووری و کۆمەڵایەتیی کوردستان کە لەلایەك بووە هۆکـاری پەرەسـەندنی شۆڕشی کورد و لەلایەکی دیکەشەوە ناڕەزایی جەماوەری لە پەرەسـەندن دابـوو، ئەمـە بـووە هۆکارێك بۆ ((بەرزبوونەوەی بیری نەتەوایەتی و هۆشـیاری و ڕۆشـنبیری کۆمـەڵانی خـەڵکی کوردستان بەتایبەتی توێژە ڕۆشنبیرەکە، بەشـە زۆریەکـەش شـاعیر و نووسـەران بـوون)) [١]، بەمەش خەڵکێکی زۆر یان ئەوەتە پێوەندییان بە شۆڕشەوە کـرد یـان خۆیـان حەشـاردا. لـەم بارودۆخەدا ئـەو شـاعیرانەی، کـە پێوەنـدییان بـە شۆڕشـەوە کردبـوو و چ ئەوانـەش خۆیـان

---

١- شەرمین ئبیراهیم عەزیز، پەشێو و تازەکردنەوە لە شیعری کوردیدا، چاپخانەی ڕۆشنبیری، هەولێر ـ کوردستانی عێراق ٢٠٠٦، ل١٤٠.

حەشاردابوو ((خەریکی خوێندنەوەی ئەدەبیاتی جیهانی بوون. ڕۆشنبیری خۆیان بەهێز دەکرد و بیریان لە گۆڕینی شیعری نوێی کوردی دەکردەوە)) [1]، دیارە بیرکردنەوەش لە گۆڕانکاریی لە شیعری نوێی کوردیدا شاعیرانی بە گەلێك ئەزموون و ژانری نوێ ناساند لەوانەش ڕۆمانە شیعر.

٢ـ ئەدەبیاتی عارەبی و بێگانە ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ کاریگەریی لەسەر شاعیران و نووسەران کورد هەبوو لە هەموو بوارەکانی ئەدەبیدا. ئەو وتار و لێکۆڵینەوانەی کە لە زواتانی بێگانەوە وەردەگێڕدرانە سەر زمانی کوردی، بەتایبەتیش لەگۆڤارەئەدەبییە عەرەبییەکان وەکو (الاقلام، افاق العربیە و...هتد)، هەروەها لە گۆڤارە کوردییەکانی وەکو (کاروان، بەیان، ڕۆشنبیری نوێ، ڕۆژی کورد، نووسەری کورد، ڕۆژنامەی هاوکاری)، ڕۆڵیان بینی لە گواستنەوەی ئەزموون و بەرهەمی عارەبی و بێگانە و ئاشناکردنی شاعیران بە ڕێباز و ژانرە نوێیانە.

٣ـ ڕاپەڕینی ساڵی (١٩٩١) دەروازەیەکی لەباری بۆ کرانەوە بەڕووی جیهان لەبەردەم میللەتی کورد ڕەخساند. بەمەش ئەدەبی کوردی ڕاستەوخۆ کەوتە ژێر کاریگەریی ئەو کرانەوەیە و لە تەواوی بوارەکانی ئەدەبیدا ڕەنگی دایەوە ((ئەمەش بەهۆی هاتوچۆ و گەشتکردنی نووسەر و ئەدیبان هاتەدی، کە زۆرێك لەم نووسەر و ئەدیبانە توانییان سوود لە وڵاتی پێشکەوتوو وەرگرن و ئەدەبیاتەکەیانی پێ نوێ بکەنەوە و ئەدەبیاتی تاراوگە و نامۆش بەشێوەو چەشنێکی تر سەریهەڵدایەوە، لەلایەن ئەو نووسەر و ئەدیبانەی، کە وڵاتانی تری جیهانیان بە نیشتمانی دووەم ئەژمار کرد)) [2]. لەهەمان کاتیشدا ئەو پاڵەپەستۆ و سانسۆرەی لەسەر بەرهەمەکانی شاعیران و نووسەران کە پێشتر لەلایەن ڕژێمەوە هەبوو نەما و جۆرێك لە ئازادی لە بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکان بۆ نووسەری کورد هاتەکایەوە.

٤- ئەو کارەسات و نەهامەتییانەی کەبەسەر میللەتی کورد داهات، هەر لە کارەساتی ئەنفال و کیمیابارانکردنی هەڵەبجە و بالیسان و بادینان و سوتاندنی ڕەز وباخات و وێرانکردنی

---

١- د. حوسێن غازی کاك ئەمین گەلاڵەیی، ڕەوتی نوێکردنەوەی شیعری کوردی لە باشووری کوردستان، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر ٢٠١٠، ل١١٣.

٢- کارزان موحسین قادر، سیما تازەکانی ڕۆمانی کوردی لەنێوان ساڵانی (١٩٩١-٢٠٠٠)، نامەی ماستەر، کۆلێژی زمان ـ زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر ٢٠٠٩، ل٢٦-٢٧.

زیاتر له (٤٥٠٠) گوند و دێهاتی کوردستان، پێڕەوکردنی سیاسەتی جینۆساید و کردەوەکـانی ڕاگواستن وبەعەرەبکردنی کوردستان لەلایەن حکومەتی بەعسی عێراقەوەو بەردەوامبوونی ئەو زوڵم وستەمانە لەدژی بوونی میللـەتی کـورد، شـاعیر و نووسـەرانی کـوردی هانـدا گیـانی بەرگریکردن و شۆڕشکردن له دژی ئەو بارودۆخە لەنێو بەرهەمەکانیان قووڵتر بکەنـەوە ئەمـە لەلایەکەوە، لەلایەکی دیکەشەوە لە هەموو ژانر و بوارەکانی ئەدەبیدا ئەسپی خۆیان تاو بـدەن و بیکەنە جێگەی باسکردنی بابەتی ئەو کارەسات و ڕووداوە جەرگبڕانە، بۆیە لەو سـەردەمەدا باسکردنی ئەم ڕووداوانە لەژێر سایەی دەسەڵاتی ڕژێمدا مایەی مەترسییەکی گەورە و مـەحاڵ بوو، بۆیە لە دوای ڕاپەڕینی بەهاری (١٩٩١) دەرگا واڵاکرا بـۆ ئـەوەی شـاعیر و نووسـەرانی کورد بە ئازادی قەوارەی ئەو کارەساتانە لەنێو بەرهەمەکانیان بـاس بکـەن. دیـارە هـەر ئـەو کارەسات و نەهامەتیانەش بوونە کەرەستەی بابەتێك لەلایەن ( شـێرکۆ بێکـەس)ی شـاعیر و ڕۆمانە شیعری (گۆڕەستانی چراکانی) لەبارەی ئەنفالەوە نووسی.

٥- گەشەکردن و پەرسەندنی ژانـری ڕۆمـان لـە ئـەدەبی کوردیـدا، ڕۆمـانی کـوردی لـە کۆتاییەکانی سەدی بیستەمدا پێشکەوتنێکی بەرچاوی بەخۆیـەوە بینـی و بەتایبـەتیش دوای ڕاپەڕین ژمارەی بەرهەمەکانی بەرێژەیەکی بەرچاو زیادی کـرد. ئـەو بارودۆخـەی کـە بەسـەر کەتواری کۆمەڵگەی کوردی و تاکی کوردی داهـات هـەر لـەزوڵم وزۆرداری ڕژێمـی بـەعس و شەڕی خۆکوژی کوردیش ((بوونە بابەت و بابەتگەلی زۆربەی ژانری ئەدەبی کوردی، چاکترین و باشترین ژانریش بتوانێت ئەم ڕووداو و بابەتە فرەوان و مەزنانەی کورد بگرێتـە باوەشـی خـۆی وبەتەواوی گوازرشتیان لێبکات، ئەوە ژانری ڕۆمانی فرەوان و مـەزن بـوو لەئاسـت فـرەوان و مەزنی ڕووداو بابەتەکان)) [1]، بەمەش شاعیران زیـاتر ئاشـنای دنیـای ڕۆمـان و تـەکنیك و پێکهاتەی توخمەکانی بوون و زەمنیەسازییەك هاتەئاراوە بۆ لەدایکبوونی ڕۆمانە شیعر.

٦ـ لەبەری ئەوەی شیعری نوێی کوردی ((یـەکێك لـەهۆکاری نوێبوونـەوەی بـەکارهێنانی کەلتوور و فۆلکلۆری کوردی بوو)) [2]، ئەمەش وای کرد کە شاعیران و نووسەرانی کـورد ڕوو لە گەنجینـەی دەوڵەمەنـدی فولکلـۆری کـوردی بکـەن و پێشـتریش باسمـانکرد لـە کـەلتوور

---

١- هەمان سەرچاوە، ل٢٥.

٢- د. حوسێن غازی کاك ئەمین گەلاڵەیی، ڕەوتی نوێکردنەوەی شیعری کوردی لە باشووری کوردستان، ل١١٦.

وفۆلكلۆری كوردیدا ئەزموونێكی تێكەڵكردن و ئاوێتەكردنی شیعر و پەخشان بوونی هەبووە كە ئەمەش بووە ئیلهامبەخش بۆ شاعیرەكان و زەمینەسازییەك بۆ لەدایكبوونی ڕۆمانە شیعر.

٧- گەشەكردنی بواری وەرگێڕان، چەندین پەڕتووكی تایبەت بە بوارەكانی ئەدەبی وەرگێڕدرانە سەر زمانی كوردی، بەتایبەتیش لە دوای ڕاپەڕینەوە تا ئێستە ئەم ڕێژەی وەرگێرانە بەرزبوونەوەیەكی بەرچاوی بەخۆیەوە بینیوە و خۆی لەقەرەی هەموو بوار و ژانرەكانی ئەدەبیشدا داوە و ڕۆشنبیر و خوێنەرانی كوردی ئاشنای ئەزموونی ئەدەبی هاوچەرخی جیهانی كردووەتەوە.

٨- زۆرینەی ڕۆماننوس و چیرۆكنووسانی ئەمڕۆی كورد، پێشتر شاعیر بوونە و بەهۆیەوەش ئاشنایەتییەكی تەواویان لەگەڵ جیهانی گێڕانەوەدا پەیدا كردووە و توانیویانە بەئاسانی لەهەردوو ژانردا بەهرەو شیانی خۆیان بنوێنن و تێیدا لە ئەزموونی ڕۆمانە شیعردا قووڵی بكەنەوە، ((بۆیە ئەم ئەزموون و تاقیكردنەوەیان بە ئاشكرا لە بەرهەمەكانیان ڕەنگیداوەتەوە وەك شیعرییەت، دیمەن، دووبارەكردنەوە، شێوازی كاریگەر و سەرنجڕاكێش، وێنە، وردەكاری تەكنیك و ڕەگەزەكانی چیرۆك و شیعر و...هتد)) [١].

٩- سەفەر و گەشتی بەشێك لە شاعیران بەرەو وڵاتانی دەرەوە بەتایبەتیش ئەورووپا و ڕۆژئاوا كە بەهۆیەوە ئاگەداری بزووتنەوەی ئەدەبی جیهانی بوون و لەنێزیكەوە شارەزایی و ئەزموونیان لە ئەدگار و سیما تازەو هاوچەرخەكانی ئەو بزووتنەوانە وەرگرت. بەشێك لەو گەشتانەی شاعیر و نووسەرانی كوردیش بەدوولایەن خۆی پیشاندا، لایەنێكیان هەڵاتن و خۆ دەربازكردن بوو لەو كەتوارە تاڵەی كەبەهۆی دەسەڵاتی ڕژێمی بەعسەوە هاتبووە كایەوە، واتە گەشتێكی بەناچاری بووە و جۆرێك بووە لەكۆچكردن و نەگەڕانەوە ئەمەش زیاتر لە ساڵانی حەفتا و هەشتاكاندا بوو. لایەنەكەی دیكەش گەشتی ئاسایی بووە و بە ئارەزووی خۆدی شاعیر و نووسەران ئەنجامدراوە و ماوەیەكی دیاریكراویشی وەرگرتووەو كە تێیدا هەمیشە شاعیر لەپێوەندییدا بووە لەگەڵ ناوخۆی كوردستان كە دیارە ئەم لایەنە زیاتر لە پاش ڕاپەڕینەوە بەرجەستەبووە. لەم ڕووەوە كۆمەڵێك لە شاعیر و نووسەران كە گەشتیان بۆ دەرەوە كرد.

---

١- كارزان موحسین قادر، سیما تازەكاننی ڕۆمانی كوردی لەنێوان ساڵانی (١٩٩١-٢٠٠٠)، ل٣٠.

## قۆناخەکانی ڕۆمانە شیعری کوردی:

هەرچەندە ڕۆمانە شیعری کوردی، ژانرێکی سەردەمیانەو هاوچەرخە و مێژوویەکی ئاوا دوور و درێژی نییە تاوەکو پۆلێن بکرێت و قۆناخبەند بکرێت، بەڵام بۆ ئەوەی سیما و خەسڵەتەکانی بەتەواوەتی ئاشکرابن و بتوانین جوغز و هەڵکشانی لە ئەدەبی کوردیدا وێنە بکێشین، ئەوە پێویست دەکات لە چەند قۆناخێکدا ئاوێتەبکرێت بۆ ئەوەی شیانی ئەوەمان هەبێت بەوردی سەرەتا و هاتنەئاراو پێگەیشتنی باس بکەین. بۆیە ڕۆمانە شیعری کوردی بەڕای ئێمە لەسێ قۆناخی سەرەکیدا خۆی ڕەنگرێژ دەکات، لێرەدا ئێمە لە دابەشکردن و دەستنیشانکردنی ئەم قۆناخانەدا پشتمان بە خودی مێژووی ڕۆمانە شیعر بەستووە نەك ساڵ، چونکە بەڕای ئێمە ڕۆمانە شیعر بەحوکمی تازە سەرهەڵدانییەوە، هێشتا ماویەتی لەسەر بنەمای ساڵ قۆناخبەند بکرێت. قۆناخەکانیش ئەمانەن:

١ـ قۆناخی یەکەم، ڕەگ و ڕیشاڵی ڕۆمانە شیعرە لە کولتوور و ڕۆشنبیری و فولکلۆر، بەتایبەتیش لە بیروڕای ئاینی و حەیران و لاوك و یاری کوردەواری و گۆرانی و بەستەی کوردی دا، کە ئەم قۆناخە، قۆناخێکی سادە و ساکارە و بەقۆناخێکی هونەری ئەم ژانرە لەقەڵەم نادرێت، تەنیا دەتوانرێت وێنە و بەشێك لە خەسڵەت و سیماکانی لەنێو کلتوورو فولکلۆردا ببینرێتەوە و بکرێتە بناخەو بنچینە.

٢ـ قۆناخی دووەم، لەگەڵ نوێکردنەوەی شیعری کوردی، گەلێك ژانر و ڕێبازی نوێی ئەدەبی هاتە نێو ئەدەبیاتی کوردییەوە و هەندێك لەو بەرهەمانەی کە لەلایەن شاعیرانی نوێخوازەوە نووسران، بەشێکیان لە خەسڵەت و سیماکانی ڕۆمانە شیعریان لەخۆیاندا هەڵگرتووە و دەکرێت بە ئەزموونێکی سادەو ساکاری ڕۆمانە شیعری کوردی لەقەڵەمیان بدەین، وەکو هەردوو هاوینەگەشتەکەی گۆرانی شاعیر.

٣ـ قۆناخی سێیەم، قۆناخی سەرهەڵدانی هونەرییانەی ژانری ڕۆمانە شیعرە لە ئەدەبی کوردیدا، کە لەکۆتاییەکانی سەدەی بیستەمدا و لەسەر دەستی کۆمەڵێك شاعیری نوێخواز لەدایکبوو، لەگەڵ ئەم سەرهەڵدانە هونەرییەشدا تا ئێستە (٥) دەقی هونەریی ڕۆمانە شیعرمان هەیە.

# بەشی سێیەم

# تەکنیك و توخمەکانی گێڕانەوە

## لە ڕۆمانە شیعری "زێوان"دا:

(زێوان) ڕۆمانە شیعرێکی (سەباح ڕەنجدەر)ـە و بە یەکەمین ڕۆمانە شیعری چاپکراو لە ئەدەبی کوردی لە قەڵەم دەدرێت. ئەم ڕۆمانە شیعرە لە (١٧٦٢) دێرە شیعر پێکهاتووە و ئەزموونی هەناسە درێژی شاعیر لە نووسینەوەی دەقی شیعری پیشان دەدات. ئەم ڕۆمانە شیعرە جاری یەکەم لە سالی (١٩٨٨) چاپ و بڵاوکراوەتەوە، سالی (٢٠٠٩)ش چاپی دووەمی بە پێشەکییەکی شاعیر بەناونیشانی (لە ئاهەنگی بیست ساڵەی زێوان)دا، کە بە بۆنەی تێپەڕبوونی (٢٠) ساڵ بەسەر چاپکردنیدا ڕەتببوو، بڵاوکرایەوە.

ئەم ڕۆمانە شیعرە یەکەمین ئەزموونی شیعری شاعیر بووە، بێ ئەوەی هەستی پێبکات، شاعیر بە ڕۆمانە شیعر وەکو ژانرێکی نوێی ئەدەبی هاتووەتە ناو گۆڕەپانی ڕۆشنبیری و ئەدەبی کوردییەوە. دیارە ئەو بوێرییەی شاعیریش لەو تەمەنەییدا کە تازە یەکەم دەقێکی شیعری بڵاودەکاتەوە، دەقە شیعرییەکەش، ڕۆمانە شیعر بێت، ئەوا ئاساییە لەلایەن کۆمەڵگەکەیەوە وا بە ئاسانی هەرس نەکرێت، بگرە دژایەتیشی بکرێت، هەر بۆیە لەلایەن سانسۆری ڕژێمەوە سێ جار ڕەتکرایەوە، هەر جارەو بە بڕوبیانوویەکەوە، دەمێك بە دەقێکی تەمومژاوی و دەمێك بەوەی، کە چامەی درێژ پێویستە کەسانێکی بەتەمەن و خاوەن ئەزموون بینووسێت و دەمێکی دیکە بەوەی کە دەقێکی ڕەشبینی و نائومێدییە و...هتد، بەڵام شاعیر کۆڵی نەدا و بەردەوامبوو لەسەر بە چاپگەیاندن و بڵاوکردنەوەی، هەروەکو خۆی لە پێشەکییەکەی چاپی دووەمدا دەڵێت: ((دەزگەی چاودێریش سێ جار ڕەتی کردەوە. بڕواشم بەوە هەیە ئەگەر جاری یەکەم سەرنەکەوتم: جاری دووەم و سێیەم و چوارەم....هتد، هەیە. منیش سووربووم و کۆڵم نەدەدا. لەبەرئەوەی دەمزانی کارم لە شێواز و زمانێك کردووە

قبوولکردنی بیٚ گیٚچەڵ نییە))[1]. ئەم سووربوونەی شاعیریش لە دواجاردا بەئاواتەکەی گەیاند و دەقی ڕۆمانە شیعرەکەی ڕەزامەندی لەسەر دراو بڵاوکرایەوە.

هەرچەندە شاعیر لەکات و ساتی بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکەی، بەدەقی شیعری نەك بەدەقی ڕۆمانە شیعر بڵاویکردووەتەوە، بۆیە بە تاقە دەقیٚك دادەنریٚت لە میٚژووی ڕۆمانە شیعری کوردیدا، کە لەلایەن خاوەنەکەیەوە ناسنامەی بۆ ڕۆمانە شیعر دیاری نەکردووە، هەرچەندە لە پیٚشەکییەکەی چاپی دووەمیدا شاعیر لەگ ەلیٚك شویٚندا ناڕاستەوخۆ ئەوە ڕوون دەکاتەوە، کە ئەم دەقەی لە دەقیٚکی شیعری جیاوازە و پیٚکهاتەیەکی ئاویٚتەیی و چیرۆك ئامیٚزی هەیە و دەڵیٚت: ((هەوڵم داوە ئەو جۆرە شیعرە بەرهەم بهیٚنم، کە لە دایکیٚکی پاکیزە لەدایك بوو بیٚت، ئەگەر نەشم توانیبیٚت بەرهەمی بهیٚنم، تیٚکۆشاوم لیٚی نیٚزیك ببمەوە و وەك ڕۆشنبوونەوەیەکی گیانی پیٚوەی خەریك بم)). لە شویٚنیٚکی دیکەشدا دەڵیٚت: ((شیعرم بۆ ئەوە نەبووە، بە هۆیەوە جیهان بناسم. بۆ ئەوەم بوو، چیرۆکیٚك دروست بکەم بۆ گیٚڕانەوە)). لیٚرەدا شاعیر دوای بیست ساڵ لە نووسینی دەقی (زیٚوان)دا، دوای بەدەستهیٚنانی ئەزموونیٚکی شیعری قووڵ و جاریٚکی دیکە گەڕانەوە و خویٚندنەوەی دەقەکەدا، ناڕاستەوخۆ ئاماژە بەوە دەدات، کە ئەم دەقە ڕۆمانە شیعرە، بەڵام خۆزگە بە ڕاستەوخۆ ئەم بابەتەی باسکردبا و ناسنامەی دەقەکەی لەو پیٚشەکییەدا چەسپاندبا. ئەم ئاماژە دانەی شاعیر لەبارەی دەقەکەوە دوای بیست ساڵ دیٚت، کە تیٚیدا شاعیر ل ەگەلیٚك ژانری دیکەدا ئەزموونی خۆی تاقیکردووەتەوە، ئەوەتا لە بواری پەخشانە شیعردا تاقیکردنەوەکەی بە سەرقافڵە دادەنریٚت و لەمبارەیەوە (کەمال غەمبار) دەڵیٚت: ((بەلای منەوە، (سەباح ڕەنجدەر) یەکەمین شاعیری کوردە، کە شیٚوازی شیعر و پەخشانی لیٚك گریٚداوە. بە هەردوو شیٚواز کیٚشەکەی خۆی چارەسەر دەکات.. دوو جۆر (شیعر و پەخشان) زیاتر بایەخ بە ترپە و ئیقاعی ناوەوە دەدات، گویٚ ناداتە زەنگی مۆسیقای ناوەوە... زیاتر گونجانی ئاواز و وشە ئامیٚزی گەرەك نییە، بگرە شووشتنەوەی وشەکان لەناوەوەدا و تەقاندنەوە و پڕکردنەوەیە بە مەودای نویٚ)) [2]، هەروەها (د. حوسیٚن غازی کاکەمین)یش ئاماژە بە تایبەتمەندییەکانی شیعری (سەباح ڕەنجدەر)دەدات و لە سیٚ لایەنەوە بۆی دەڕوانیٚت، ئەوانیش (هاوبەشکردنی ویٚنە، تیٚکەڵکردنی شیعر و پەخشان،

---

١- سەباح ڕەنجدەر، زیٚوان، چاپی دووەم، چاپخانەی یاد، سلیٚمانی ٢٠٠٩، ل١٢.

٢- کەمال غەمبار، بەرەو جیهانی شیعری چەند شاعیریٚك، ل ٦٨.

دەقــی خــەونی و فــۆرمی زەینــی) و لــەبارەی تێکــەڵکردنی شــیعرو پەخشانیشــەوە دەڵێــت: ((هونەرێکە لەشیعری کوردیدا تایبەتە بەم شـاعیرە)) [١]. تەنانـەت هەنـدێك لـە لێکۆڵـەران مامەڵەی ڕۆمانە شیعرییان لەگـەڵ پەخشـانە شـیعرەکانیدا کـردووە، وەکـو ( ئـازاد ئەحمـەد مەحموود) لەبارەی پەخشانە شیعری (سرووش)ەوە دەڵێت:((چامە پەخشـانییەکە زەیـن تێیـدا کراوەتەوە. کەدەکرێت وەك "ڕۆمانە شیعر"یش بخوێندرێتەوە، زۆر جیاواز و پڕ سەرسامیتر لەو ڕۆمانە شیعرانەی پێشتر لە ئەدەبی کوردیدا نووسراون)) [٢]. هەروەها (حەمە مەنتك) لەبارەی ئەم شیعرەوە دەڵێت: (( ئەگەر سەیری ئەم چامە (زێوان) بکەین بـۆ ئـەو سـەردەم ئـەم شـێوە شیعرە لە شێوەی چامە و ڕۆمانە شیعردایە)) [٣]، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە شاعیر لـەدوای بڵاوکردنەوەی (زێوان)دا، چەند ئەزموونێکی پێڕەوکردووە کە تەنیا دەقی شیعری نەبووە. هـەر ئەم ئەزموونانەش بەوەی گەیاندووە کە شیعر ئـەوەی لـەباردا هەیـە لـە هونـەرەکانی دیکـە هەڵمــژێت و لەهــەمان کاتیشــدا وەکــو ئۆکســجینێك لــە پێکهاتــەی هونــەرەکانی دیکــەدا بەشداربێت، لەمبارەوە لەپێشەکییەکەی (زێوان)دا، دەڵێت: ((شیعر لەبواری خۆیدا دەتوانێـت هونەری شێوەکاری و فۆتۆگراف وگۆرانی و درامای شانۆیی و مۆسیقا وتەلارسـازی و هونـەری دیکەش وازی بکات. هەروەها هونەری دیکەش دەتوانن بەشداری لەوە بکەن شـیعر وەربگێـڕن بۆ زمانی خۆیان. شیعر لەهەندێ باردا دەبێتە بـاوکی هونـەرەکان و لەهەنـدێ بـاری تریشـدا دەبێتە کوڕ وکوڕەزا)) [٤]. بەو واتایەی شاعیر، شیعر دەکاتە مینبەرێك بۆ کۆکردنەوەی هەموو ژانرەکانی دیکە و ئاست بەخشین بەو سنوور بەزاندنەش بە گونجـان و لەیەکـدی نێزیکبوونـەوە دەبێت، هەروەکو لـەبارەی پەخشـانە شـیعرەوە دەڵێـت: ((گونجانـدن و لێـك نێزیککردنـەوەی

---

١- د. حوسێن غازی کاکەئەمین گەلالەیی، ڕوەتی نوێکردنەوەی شیعری کوردی لەباشووری کوردستان (١٩٨٠-١١٩١)، ل ١٨٠.

٢- ئازاد ئەحمەد مەحموود، شەش لێکۆڵینەوەی شیعری، ل ٨٤.

٣- حەمە مەنتك، سوریالیزم لە ئەدەبی نوێی کوردیدا،دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر ٢٠١١، ل ١٠٥.

٤- سەباح ڕەنجدەر، زێوان، ل١٠-١١.

شێوازی شیعری ئازاد و پەخشانە شیعر ئاست بۆ سنووربەزاندنەکان دەدۆزێتەوە)) [1]. ئەم سنوور بەزاندنەش ژانری نوێ و تازە بەرهەم دەهێنێت. لەم چوارچێوەیەدا ئێمە هەوڵدەدەین یەکە یەکەی توخمەکانی گێڕانەوە لە ڕۆمانە شیعری (زێوان)دا بخەینە بەرباس و لێکۆڵینەوە:

### ناونیشان:

یەکەم شتێك کە سەرنجی خوێنەر بۆ لای خۆی ڕادەکێشێت، ناونیشانە، ناونیشان بەشێکی گرینگ و پڕ بایەخ لە پرۆسەی نووسین و خوێندنەوەی دەقدا دەگرێتەوە، چونکە خوێنەر لە یەکەم ساتی ساتوسەودایکردنی لەگەڵ هەر دەقێکدا، ڕووبەڕووی ناونیشان دەبێتەوە. بۆیە ناونیشان ئێستە لەلایەن شاعیر و نووسەرانەوە جێگەی بایەخ و گرینگی پێدانە. ناونیشان هەڵگری گشت پەیامەکانی دەقەکەیە و چڕکردنەوەی ڕووداوی دەقەکەیەو دەکرێت بەهۆی ناونیشانەوە خوێنەر و وەرگر ئامادەبکرێت بۆ گەڕان بەناو ژوورەکانی دەقدا. ئەگەر چی ناونیشان لە چەند وشەیەك پێك دێت، بەڵام هەر خودی ئەم وشە بەژمارە کەمانە دەبنە کلیلێك و دەرگاکانی دەقی پێدەکرێنەوە. ناونیشان لەگەڵ پرۆسەی خودی ناودا یەکدەگرێتەوە و بەهۆی ناونیشانەوە دەقێك لە دەقێکی دیکە جیا دەبێتەوە، واتە ناونیشان هەڵگری کەسایەتیی و جەوهەری ئەو بابەت و دەقەیە کە بۆی دەدانرێت و سیما و خەسڵەت و لایەنەکانی تێدا ڕەنگدەداتەوە. هەروەکو (لۆسیە گۆڵدەمان) پێی وایە کە ناونیشان سورەیای دەقە و ڕێگە پێچوو پەناکانی دەق ڕووناك دەکاتەوەو لەسەرەوە وەکو بلاجکتۆرێك وایە و تیشك بەسەر جەستەی دەقدا دەهاوێژێت و ڕووناکی دەکاتەوە و بە باق وبریقی دەکات[2]. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ناونیشان لەدەقدا چەند ئەرکێکی گرینگ ڕادەپەڕێنێت:

١ـ ناسنامەی دەق دیاری دەکات.

٢ـ دەقێك لەدەقەکانی دیکە جیا دەکاتەوە.

٣ـ تەواوی سیفەت و خەسڵەت و سیما و ڕەنگ و ڕووی دەقە کە لە ناونیشانەکدا دەچەسپێت و ڕەنگدەداتەوە.

---

١- سەباح ڕەنجدەر، دوو کتێب لەبارەی شیعرەوە، دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی، هەولێر ٢٠١١، ل٢٢.

٢- ئارام سدیق، ناونیشان لە چیرۆکی کوردیدا، چاپخانەی کارۆ، سلێمانی ٢٠٠٩، ل١٤٩.

٣ـ کلیلی چوونە ژوورەیەوە بۆ ناو ژوور و گۆڕەپانی دەق.

٤ـ ئامادەکردنی خوێنەرە بۆ وەرگرتنی ئاماژە و هێماکانی ناو دەقەکە.

٥ـ کاریگەریی تەواوی بەسەر توخمەکانی دیکەی گێڕانەوە وەکو ڕووداو و کارەکتەر و کات و شوێنەوە هەیە و دەکرێ ببێتە بەشێکی ڕوونکەرەوەی یەکێك لەم توخمانــە و ناونیشــانەکەی لەمانەوە بەدەست دەهێنێت.

لەبەرئەوە بە هۆی ناونیشانەوە، خوێنەر جۆرێك لە ڕۆشنبیریی دەست دەکەوێت و بەهۆی خوێندنەوەی تەواوی دەقەکەش ڕووبەری ئــەو ڕۆشــنبیرییە فــرەوان دەبێتــەوە و ڕەنــگ و ڕووی دەچەسپێت. بۆیە دەکرێت خودی ناونیشان بەدەقێك دابنرێت، دەقێکی چڕ وکــورتکراوە لــەناو دەقە ڕەسەنەکەدا، چونکە ناونیشان کاکڵەی دەرەوەی دەق لەخۆ دەگرێت و وەکو بەرگێك وایە، چەند جوان سەرنج ڕاکێش و فانتازی بێت، ئەوەندە خوێنەر و وەرگر گــیرۆدەی خــۆی دەکــات و لەبەرگەکەوە ئاراستەی ناواخنیان دەکات و پەلکێشی خوێندنەوەیان دەکات.

لەم ڕوانگەیەوە ئەگەر لە ناونیشانی یەکەم دەقی ڕۆمانە شیعری کوردی وردبینەوە، ئەوا دەبینین شاعیر ناونیشانێکی پڕ لە تەمومژ و گوواتــاوی و ڕامــان و بیرکردنــەوەی بــۆ دەقەکــە هەڵبژاردووە کە ئەویش (زێوان)ــە، واتە ناونیشان لەم دەقەدا هەرچەندە لە تاقــە یــەك وشــە پێکهاتووە، بەڵام ڕاستەوخۆ خۆی نادات بە دەستەوە و خوێنەری گیردۆەی بــیر لێکردنــەوە و ڕامانێکی قووڵ دەکات، ئەمەش بەهۆی نادیاری و ناڕوونی و تەمومــژاوی لــە ناونیشــانەکەوە هاتووەتە کایەوە. بەو واتایەی کە ناونیشــان لێــرەدا ناونیشــانێکی ئاســایی نییــە، لەهــەمان کاتیشدا ئەم ناونیشانە پێوەندییــەکی ڕاســتەوخۆی بــە کارەکتــەر و کــات و شــوێنەوە نییــەو لەیەکەم ڕاماندا لەهەمبەر ئەو ناونیشانەوە، خوێنەر هیچ نیشانەیەکی تایبەت بــۆ کارەکتــەر یاخود شوێنکات هەست پێناکات، بگرە بە پێچەوانەوە خوێنەری تووشی سەرسامی و ڕەگەزی کتوپڕی دەکات. ئەمەش لەبەرئــەوەی کــە ناونیشــان ناڕاســتەوخۆ پێوەنــدیی بەتــەواوی ئــەو ڕووداوەوە هەیە کە شاعیر بۆمانی دەگێڕێتەوە، واتە پێوەنــدی بەتــەواوی پێکهاتــەی بونیــادی ڕۆمانە شیعرەکە هەیە، کەئەویش برێتییە لە ژیاننامەی شاعیر لە کات و ساتێکی دیاریکراوی تەمــەنی خۆیــدا ئــەویش منداڵییــە و لەچوارچــێوەی زەمــەن و ســەردەمێکی دیــاریکراوی کۆمەڵگەشدا کە خودی شاعیر تێیدا ژیاوە و بەدەستییەوە ناڵاندوویەتی.

دیاره (سەباح ڕەنجدەر) یەكێك لەو شاعیرانەی پەی بە ترسناكی ناونیشان بردووە و هەستی بەوە كردووە، كە ناونیشان یارییەكە یاخود جەنگێكە شاعیران و نووسەران بێ ئەوەی پێكهاتەی یارییەكە یاخود جەنگەكە ڕابگەیەنن، لەگەڵ خوێنەرانیدا دەیكەن بەمەبەستی كۆكردنەوەی زۆرترین ژمارەی خوێنەران و قەتیس كردنیان لەژوورەكانی دەقدا و دواجار هێنانە دەرەوەیان لەو ژوورانە بەشێواز و ڕەنگ ورووییەكی دیكەوە، لەمبارەیەوە شاعیر دەڵێت: ((ناونیشان وەك ڕووناكییەكی تیژ تیپەڕە بۆ ڕوشنكردنەوەی پانتایی و بونیاد و جوولەكانی ناوەرۆك و ناساندنی دەق، چونكە بەهۆی ناونیشانەوە نووسین و بینینی نووسەر پێشكەش دەكرێت، واتا و كرۆكی دەقەكە دێتە بەر بیرو خەیاڵی خوێنەر)) [1]، ئەم ڕۆڵ زانینەی ناونیشانیش مەترسی نیگەرانییەكانی شاعیرمان لەهەڵبژاردنی ناونیشانی یەكەم ڕۆمانە شیعری كوردی بۆ ڕوون دەكاتەوە، كاتێك دەڵێت:((سەرەتا سێ ناونیشان بەخۆیانەوە خەریكیان كردبووم. یەكەم: منداڵی بەرزەخییەكان. دووەم: زێوان. سێیەم: گۆڕان لەئاكاری مەرگدا. بەدرێژایی ماوەی نووسین نیگەرانییەكیشم لەگەڵدا بوو بۆهەڵبژاردنی ناونیشان)) [2]تەواوی ئەو نیگەرانییەی شاعیریش پێوەستە بەپێكهاتەی گشتیی دەقەكە، چونكە یەكێك لەم ناونیشانانە بەلێزانییەوە لەلایەن شاعیر هەڵدەبژێردرێت كە ئەویش (زێوان)ە، دەربڕی تەواوی پێكهاتەی دەقەكەی لەخۆدا كۆكردووەتەوە.

لە ڕاستیدا زێوان جۆرە گیاییەكە لەگەڵ گەنم و جۆ شین دەبێت و كاتێك بەرەكەی پێدەگات، كە لەدنكێك دەچێت و ڕەنگی ڕەشە، لەگەڵ گەنم و جۆدا دەدورێتەوە و تێكەڵیان دەبێت و دواتر لێی جیاواز دەكرێتەوە، چونكە تامێكی تاڵ وناخۆشی هەیە. هەڵبژاردنی ئەم ناونیشانەش پێوەستە بە خودی ژیانی شاعیر لەو سەردەمەدا و هەروەها ڕووداوی ڕۆمانە شیعرەكەش، كە باس لەو ژیانەی شاعیر دەكات كە پڕە لە ترس لە مردن و پیربوون و وێرانكردنی گوند ودێهاتەكان. هەروەها پێوەستە بەخودی ژیانی شاعیریش لەو سەردەمەدا كە هەڵاتووی سەربازی بووە خۆی حەشارداوەو هەمیشە لەفەزایەكی ترس و مەرگ ژیاوە. بۆیە كاتێك شاعیر ڕووداوەكانی تەمەنی خۆی دەگێڕێتەوە، ئەوەمان پێڕادەگەیەنێت كە ژیان پڕ لەبەرهەم و جوانییە وەكو گەنم و جۆیەكان، بەڵام جاربەجار زێوانیش دەبێ بخۆین كە تامێكی

١- سەباح ڕەنجدەر، دوو كتێب لەبارەی شیعرەوە، ل ٢٩.

٢- سەباح ڕەنجدەر، زێوان، ل٦-٧.

تاڵ بەژیان دەبەخشێت. واتە لێرەدا ناونیشان هێمایەکە بۆ کۆ ڕووداوی ژیانی شاعیر لە ڕۆمانە شیعرەکەدا. هێماش ((لای هەموو شاعیران یەك شت نییە، بگرە دەگۆڕێت بەگۆڕانی پاڵنەرەکە، هەر لەبەرئەوەشە جاری وا هەیە بەکارهێنانی ڕەمز دەکەوێتە خانەی پێویستییەکی تاکەکەسی کە تەنها پێوەندیی بە شاعیرەکە خۆی هەیە لەو ڕووەوەی کە کۆمەڵە هۆکارێکی دەرەکی کە پێوەندییان بە بارودۆخی سیاسی یان ژیانی کۆمەڵایەتیی یان باری دەروونی یان جۆری بیرکردنەوەو عەقیدەو ئایدیۆلۆژیاوە هەیە، هۆی بەکارهێنانەکە بەیەکێك یان زیاتر لەو هۆیانە دەبەسترێتەوە)) [1]. بەو واتایەی کە هێما لەحاڵەتێکی تاکەکەسیەوە دەبێتە حاڵەتێکی کۆ، بەتایبەتیش کە هێما ((وشەیەکە یاخود دەستەواژەیەکە یاخود دەربرینێکی دیکەیە کە ئاوێتەیەك لە واتای بەیەکبەستراو لەخۆ دەگرێت)) [2]، ئەو ئاوێتەیەش پێوەستە بە حاڵەتە تاکە کەسییەکەوە و لەوێوەوە بەرەو بونیادی پێکهاتەی دەقەکە شۆڕ دەبێتەوە. لەم چوارچێوەیەدا ئێمە پێمان وایە کە بەکارهێنانی هێما لەلایەن شاعیرەوە بۆ دەقی ئەو ڕۆمانە شیعرە سەرکەتووە بووە، چونکە لەلایەکەوە تەمومژ و نادیارییەکی تێدا بەرجەستەکراوە و لەلایەکی دیکەشەوە دەربڕی کۆی گشتیی پەیامی خودی شاعیر بووە لە دەقەکەدا. بەمەش زیندوویەتی بە ناونیشان بەخشییوە، کە لەگەڵ هەر خوێندنەوەیەکی دەقە، واتایەك لەواتاکانی ناونیشانمان بۆ ڕوون دەبێتەوە و ئەمەش وای کردووە ناونیشان بەدرێژایی ڕۆژگار خۆی بپارێزێت و جۆرێك لە وزەیەکی متبوو لەخۆیدا هەڵبگرێت و لەگەڵ هەر خوێندنەوەیەکدا بەشێك لەو وزەیە ببەخشێت کە پێویستە بۆ خوێنەر تا بەهۆیەوە هەمیشە واتای نوێ لەدەقەکەد هەڵکرێنێت و مەودای تازەی بۆ دروست بکات، ئەم پرۆسەیەش لەدواجاردا کرانەوەیەك بەدەق دەبەخشێت و گیانی نەمری پێ دەنۆشێت و پەساپۆرتی سەردەم بڕەکانی لە باخەڵی دەق دادەنێت و بە نەوەکان شادی دەکات.

---

١- د. پەرێز سابیر، تەوەرەکانی ڕەمزی شیعری لە ڕەخنەی ئەدەبی کوردیدا، گۆڤاری(زانکۆ)، ژمارە(٢٥)، حوەزیرانی ٢٠٠٥، ل٥٣٠.

٢- محمد علي كندي، الرمز و القناع في الشعر العربي الحديث، دار الكتاب الجديد المتحدة، بيروت ـ لبنان ٢٠٠٣، ص٥٣.

## دەستپێك:

لە پاش ناونیشان، دەستپێك بـەگرینگترین هونـەر دادەنرێـت كـە شـاعیر و نووسـەران لـە سەرەتای دەقەوە پەنای بۆ دەبەن. دەستپێك زیهن و هزری خوێنەر ئامادە دەكـات بـۆ ئـەوەی لەگەڵ ڕەوتی ڕووداوەكاندا تێكەڵی بكات و شیانی ئەوەی هەبێت كەندو كۆسـپی ڕووداوەكـانی پێ هەرس بكرێت و لەگەڵ ڕەوتـی ڕووداوەكانـدا هـەل بكـات. كەواتـە دەسـتپێك لـە دەقـدا هونەرێكی یەكجار پڕ بایەخە و چەندین ئەركی گرینگ لـەناو دەقـدا دەبینێـت، یـەكێك لـەو ئەركانـە ئامـادەكردنێكی دەروونـی و كۆمەڵایـەتیی خوێنـەرە تابەهۆیـەوە بتوانێـت درێـژە بەخوێندنەوەكانی بدات و لەبەرامبەر دەقدا هەناسـە كـورت نـەبێت. بـەو واتایـەی پێویسـتە دەستپێك بەشێوەیەك بێت، كە لەلایەن شاعیر و نووسەرەوە پوخت و چڕ كرابێتەوە بـۆ ئـەوەی خوێنەر لەكاتی خوێندنەوەدا توانستی وەرگرتنی یەكەمجاری ڕووداوەكەی هەبێت، ئەمـەش بـە خاڵی دەستپێكردنی ڕەوتی ڕووداوەكان لەقەڵەم دەدرێت، كە گرینگییەكی لەرادەبەدەری هەیـە هەم بۆ خوێنەر كە دەكەوێتە ناو چەقی ڕووداوەكەو، هەمیش بۆ شاعیر كە لەو پێتەوە دەسـت بە گێڕانەوەی ڕووداوەكە دەكات. هەر لەدەستپێكدا دەكرێت شاعیر كارەكتەر جـا كارەكتـەری سەرەكیی بێت یان لاوەكـی بـە خوێنـەران بناسـێنێت و خـاڵی دەسـتپێكردنی ڕووداوی بخاتـە ئەستۆ. واتە هەم لەلایەك كارەكتەر پرۆسەی یەكترناسـین لەگـەڵ خوێنـەر دەكـات و هـەمیش دەست بە گێڕانەوەی بەسەرهاتەكەی دەكات. هەروەها دەكرێـت لەدەسـتپێكدا شـوێنی ڕووداو دیاری بكرێت و وەكو دیمەنێكی سینەمایی بـەوردی وێنـەی بكێشـرێت و پیشـانی خوێنـەری بدرێت و لەوێوە هەوڵبدرێت دەروونی وەرگری بۆ وەرگرتنی ڕووداوەكان ئامادەبكرێت. بەهەمان شێوەی شوێن، دەكرێت كات لە دەستپێكدا لەلایـەن شـاعیرەوە تیشـكی بخرێتـە سـەر و زەق بكرێتەوە بۆ ئەوەی لەناویدا ڕووداو دەست بە گێڕانەوە بكات. هەندێكجاریش دایەلۆگ یـاخود مەنەلۆگ دەستپێك ڕەنگرێژ دەكەن و هەوڵدەدەن بەهۆی دایەلۆگ یاخود مەنەلۆگـەوە سـەرەتا چەند زانیارییەكی پێویست بەخوێنەر بگەیەنن و دواتر خـاڵی دەسـتپێكردنی ڕووداوەكـان بـۆ خوێنەر دیـار بكـەن. كەواتـە ئێمـە لـەناو دەسـتپێكدا كۆمـەڵێك شـت بـەدی دەكـەین كـە بەهەموویانەوە سەرەتای دەستپێكردنی گێڕانەوە دیاری دەكەن. بۆیـە ئەگـەر ئێمـە بمانـەوێت جۆری دەستپێك دیاری بكەین، ئەوا دووچاری جۆرێك لە زەحمەتی دەبینـەوە، چـونكە ئەگـەر بمانەوێت دەستنیشانی جۆرەكانی بكەین (( ئەوە ناگەینە خاڵی كۆتایی، بەو پێیەی كە هـەموو

دەقێك دەكرێت بخرێتە نێو چوار چێوەیەكەو تا دەقی نوێتر هەبێت شێوازی نوێتر و دەستپێكی جیاوازتر هەیە)) [1]. لەگەڵ ئەوەشدا دەستپێك خاوەن چەندین خەسڵەت و سیمای دیاری خۆیەتی و پێویستە دەستپێك بە وشە و ڕستەی سەرنجراكێش دەست پێبكات و ((هەر لەچوارچێوی ئاماژەكردنێكی كورت دابێت و نەبێتە هۆی ئاشكراكردنی گشت كەلێن و لایەنە شاراوەكانی دەقەكە، چونكە دەستپێكی درێژدادڕ لایەنی تەكنیك و ناوەرۆكی دەق بەتاڵدەكات و خوێنەر ئارەزووی ئەوەی نامێنێت، كە بەدوای بەشەكانی تر بكەوێت))[2]. لەم ڕوانگەیەشەوە دەستپێكی ڕۆمانە شیعری (زێوان) بەمشێوەیە دەستپێدەكات:

**((سروشت هەموو شتێكت ترساندوومی**
**لرفەی ئاگرت**
**بڵندایی چیات**
**گەفی ڕووبارت**
**دەشتایی ڕووتت**
**پەنجەم لەچاوەڕوانییەكی دوانەهاتوو**
**یان گیان پێنەماو**
**بەناویەكدا دەشكێنمەوە**
**یادی ماڵێكردنی ورچ دەبێتە بۆنە و نیشان**
**دیوە تاریكەكانی زەوی چی لێ دەدۆزێتەوە**
**منداڵیی هێشتان ناونەنراوم لەسەر ڕانی**
**ئەو ڕێیانەی دەبنە حەكایەت**
**خۆی دەگێڕێتەوە))     ( زێوان، ل١٧)**

لەم دەستپێكدا سەرەتا شاعیر ئاماژەی بەشوێن كردووە كە (سروشت)ـە و دەستی خوێنەر دەگرێت و بەهێواشی دەیهێنێتە نێو ئەو فەزا پان و پۆرەوە و لەوێوە خوێنەر بۆ گەشتێكی پڕ لە چاوەڕوانی و ترس و گومان تەرخان دەكات ( پەنجەم لە چاوەڕوانییەكی دوانەهاتوو) ئەو گەشتەی كە بە (منداڵی هێشتا لەناونەنراوم) دەست پێدەكات و لەو (ڕێیانەی كە دەبنە

١- ئارام سدیق، ستاتیكای گێڕانەوە، چاپخانەی یاد، سلێمانی ٢٠٠٩، ل٢٢.

٢- كارزان موحسین قادر، سیما تازەكانی ڕۆمانی كوردی لەنێوان ساڵانی (١٩٩١ـ ٢٠٠٠)، ل١٣٦.

حیکایەت خۆی دەگێڕێتەوە). واتە شاعیر لەم دەستپێکدا شوێن وەکو توخمێکی گێڕانەوە بەکاردەهێنێت وسروشتیش مۆڵگەی هاتنەناوەی شاعیرە ((بەهرە و سرووشم لە سروشتی پاکیزە و نەژاکاوەوە وەردەگرت، وەك سەرچاوەیەکی بەپیت و یارمەتیدەر بۆ خەملاندنی بیرکردنەوەم، لێی نێزیك دەبوومەوە)) [1] و لەنێزیکبوونەوەیەش خۆی وەکو کارەکتەرێك ئاشنای خوێنەر دەکات و پرۆسەی یەکتر ناسین ئەنجام دەدات، ئەمەش هەمووی لەچوارچێوەی دایەلۆگێکی ناڕاستەوخۆدا، کە شاعیر لەگەڵ خودی سروشت بەئەنجامی دەگەیەنێت. کەواتە لەم ڕۆمانە شیعرەدا توخم و تەکینکەکانی ( شوێن، کارەکتەر، دایەلۆگ) بەزەقی بەرچاو دەکەون و خوێنەر بۆ ناو کەش وهەوای ڕووداوەکان ئامادە دەکەن، ئامادەکردنێك جۆرێك لەفانتازی و خەونی لەخۆیەوە گرتووە و خوێنەری تووشی سەرسوڕمان و حەسرەتێك دەکات لەوەی کە ئەو کارەکتەرە کەجارێ منداڵێکی ناونراوە دەبێ چ جۆرە حیکایەتێك بگێڕێتەوە. بەو واتایەی کە دەستپێك لەم دەقەدا تەواوی لایەنی ڕووداو وبەسەرهاتەکەی ئاشکرا نەکردووە و وەکو نهێنییەك بۆ خوێنەری بەجێهێشتووە تاوەکو وردە وردە لەتەك تێکەڵبوون لەگەڵ ڕووداوەکاندا بیاندۆزێتەوە. لەهەمان کاتیشدا جۆرێك لە پەناهانی و شاراوەیی ڕووداوەکانی بە خوێنەر گەیاندووە. بۆ ئەوەی کەمەندکێشی خوێندنەوەی بکات.

**ڕووداو:**

ڕووداوی سەرەکیی ئەم ڕۆمانە شیعرە گێڕانەوەی ژیانی تایبەتی شاعیر خۆیەتی، واتە ژیاننامەی شاعیرو بیرەوەرییەکانیەتی، ژیاننامەش یەکێکە لەو بوارە گرینگانەی ئەدەبی کە تێیدا هەموو کون و کەلەبەرێکی ژیانی شاعیر و نووسەر دەخرێتە بەر دەستی خوێنەر و تێیدا پەردە لەسەر ڕووی گەلێك لەنهێنییەکان و وردەکارییەکانی شاعیر خۆی و بەرهەمەکانی هەڵدەماڵدرێن و بەهۆیەوە زانیاریی گرینگ و پڕ بەها لەسەر ژیانی شاعیر لەڕووی سیاسی و کۆمەڵایەتیی و ئابووری و...تاد دەست دەکەوێت و دەبێتە یارمەتیدەرێکی بەهێز بۆ زیاتر تێگەیشتنی لە بەرهەمەکانی و پەی بردن بە بازنە پڕ لە تەمومژ و ئاڵۆزەکانی ئەو دەقانە. نووسینەوەی ژیاننامە کارێکی پڕ بەها و بەسوودە بۆ خودی شاعیر و بۆ خوێنەرانیش و لەدواجاریشدا ئەو ژیاننامەیە دەبێتە مولکی گشتیی و گەلێك ڕووداوگەلی سیاسی و

---

١- سەباح ڕەنجدەر، زێوان، ل٥-٦.

کۆمەڵایەتیی تێدا تۆمار دەکرێت کە لەرووی مێژووییەوە بایەخێکی یەکجار زۆریان هەیە. گێڕانەوەی یادەوەرییەکانیش لەلایە شاعیر و نووسەرانەوە، بەشێکی زیندووی ئەدەبە، لە رۆژهەڵاتدا بەگشتیی و لە ئەدەبیاتی کوردیشدا بەتایبەتی بایەخێکی ئەوتۆ بە هونەری گێڕانەوەی بیرەوەرییەکان نەدراوە و هونەرێکی تازە و نوێیە و زیاتر لەم سەدەی دواییەدا باوی سەندووە. هەروەکو (شێرکۆ بێکەس)ی شاعیر دەڵێت:(( تێکڕا لە ئەدەبی ئێمەدا، ئەدەبی یاداشت، یان ئەدەبی بیرەوەری زۆر کەم بایەخی پێدراوە، بۆ نموونە ژمارەیەکی هەرە زۆری شاعیران و ئەو ئەدیبانەی، تا ئەوانەی لەماوەیەکی نێزیکیش کۆچی دواییان کردووە، هیچیان بەجێنەهێشتووە کەپێی بڵێین بیرەوەری)) [1].

لەبارەی پێناسەو توخمەکانی بیۆگرافیا یان ژیاننامەشەوە گەلێك بیروڕا و بۆچوونی جیاواز گوتراوە، لەوانە ڤیلب لۆجۆن بەمشێوەی بیۆگرافیا دەناسێنت:(( گوتنێکی هێنانەوەیی پەخشان ئامێزە، کە کەسێکی کەتواری لەبارەی بوونی تایبەتی خۆی دەیگێڕێتەوە، ئەمەش بەجەخت کردنەوە لەسەر ژیانی تاکایەتی خۆی و مێژووی کەسییەکەی)) [2]. بەلای لاروسیشەوە بیۆگرافیا (( ژیانی کەسێکە لەلایەن خۆیەوە نووسراوە)) [3]. کەچی ڤابیرۆ لە ڕوانگەیەکی ئەدەبییەوە تەماشای گێڕانەوەی ژیاننامە دەکات و دەڵێت:(( بیۆگرافیا کارێکی ئەدەبییە، گێڕانەوەیە، جا بە شیعر بێت یاخود بە وتارێکی فەلسەفی...... تاد بێت، کە نووسەر بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ یاخود ئاماژەدان ژیانی خۆی دەگێڕێتەوە و بیروڕایەکانی دەردەبڕێت و هەستەکانی وێنەدەکێشێت)) [4]. گێڕانەوەی ژیاننامەش دەکرێ بە هەردوو شێوازی پەخشان و شیعریش بێت (( هیچ بەربەستێك نییە لەبەکارهێنانی دێڕە شیعر لە بیۆگرافیادا)) [5] لەگەڵ ئەوەشدا بە هەزاران بیۆگرافیا دەبینین کە لە گێڕانەوەیدا پەنا بۆ زمانی پەخشان بردراوە و ئەوانەی بەشیعر گێڕدراونەتەوە لە پەنجەی دەست تێپەڕ ناکەن. لەگەڵ ئەوەشدا ((زۆرێك لەو

---

١- شێرزاد هەینی، ٩٥٥ دەقیقە لەگەڵ شێرکۆ بێکەسدا، ل٢٥.

٢- فيليب لوجون، السيرة الذاتية، الميثاق والتاريخ الأدبي،ترجمة وتقديم: عمر حلي، المركز الثقافي العربي، بيروت ـ لبنان، ١٩٩٤ ل٨.

٣- هەمان سەرچاوە ل١٠.

٤- هەمان سەرچاوە ل١٠.

٥- هەمان سەرچاوە ل١٦.

بیۆگرافیا شـیعریانه لـه بیۆگرافیـای پەخشـان ئـامێز جـوانترن )) [1]. هـەر ئەمەشـە هـانی شاعیرەکانی داوە بەتایبەتی بۆ ئەوەی ژیاننامەی خۆیان بە شیعر بهۆننەوە، چونکە لەلایەکەوە ژیاننامەی خۆیان بە بەرگێکی خەیالاوی و فانتازییـەوە پێشـکەش دەکـەن و ڕووداوەکـان لـە چوارچێوەی زەمەنێکی کەتواری و خەیاڵییەوە دادەڕێژن، ئەمەش جۆرێك لـە تـام و چـێژ بـە خوێنەر دەبەخشێت و پەلکێشی خوێندنەوەی دەکات و لەلایەکی دیکەشەوە وشەو ڕستە و دێرە شیعرەییەکان کەشێکی سیحری لەسەر خوێنەر چێ دەکەن و ڕەنگە بەشـێوەیەك بکەوێتـە بـەر کاریگەریی دێڕە شیعرەکان لەبەریان بکات.

لەم چوارچێوەیەشدا (سەباح ڕەنجدەر) لە نووسنەوەی بەشـێکی بیرەوەرییـەکانی لـەجیاتی پەخشان، شیعری کردووەتەوە چەقی گێڕانەوە و ڕووداگەلی ژیانی تایبەتی خۆی لـە زمـانێکی شیعری تێکهەڵکێش کردووە و پێشکەشی خوێنەری دەکـات. بۆیـە ڕووداوی سـەرەکیی ئـەم ڕۆمانـە شـیعرە دوو مـاوەی گرینگـی لـەخۆ گرتـووە ئـەوانیش، مـاوەی منـداڵی و مـاوەی گەنجێتییە، بەڵام زیاتر لەژێر کاریگەرێتی ماوەی منداڵییەو دەیەوێت بگەڕێتەوە بۆ ئەو ماوەیە کە ماوەی بەرائەت و پەپولەییە، هەرچەندە لەزەت و خۆشییەکانی مـاوەی گەنجێتیشـی بـاس دەکات، بەڵام هەر لەو ماوەیەشدا نەهامەتییەکان ڕووی تێ دەکەن و ژیان ناخۆش دەکەن.

دیارە شاعیر لەماوەی گەنجێتییەوە ئەم ژیاننامەیـەی خـۆی نووسـیوەتەوە، هـەروەکو لـە پێشەکییەکەیدا خۆی ئاماژەی بۆ دەکات و دەڵێت:((لەتەمەنی نۆزدە ساڵیدا یەکەم هەناسـەی ئەم دەقە بە سییەکانمدا گەڕا و ڕژایـە ئاسـۆی هەسـتەکانمەوە. پێویسـت بـوو هەڵیبگرمـەوە، لەبیست و دوو ساڵیدا بەرهەم هات و تەواو گەڵاڵە بوو)) [2]. لەم تەمەنـە زووەدا شـاعیر کـە پەنا بۆ گێڕانەوەی ژیاننامەکەی دەبات، مەبەستی ئەوە نییە، تـەنیا چـەند ڕووداوێکمـان بـۆ بگێڕێتەوە، بگرە ئـەوە سـەلمێنەری ئەوەیـە، کـە ڕووداوگـەلێك لـەژیانی شـاعیر ڕوویانـداوە کاریگەریی قووڵیان لەسەر تەواوی کایەکانی ژیانی بەجێهێشـتووە، بەشـێوەیەك کـە ڕەنـگ و ڕووی ژیـانی ئاینـدەیان گۆڕیـوە، گـۆڕانیش هەمیشـە تـرس و دڵەڕاوکێیـەکی بـێ سـنووری لەگەڵدایە، چ جا ئەوەی کە ژیانی تایبەت خۆت بێت و نـەزانێت بـەچ ئاراسـتەیەکدا دەڕوات، بۆیە شاعیر بە ترس و گومان و ئاینده نادیارەوە ڕووبەڕووی ژیـان بۆتـەوە و یسـتوویەتی ئـەو

١- هەمان سەرچاوە ل١٦.

٢- سەباح ڕەنجدەر، زێوان، ل٦.

ڕووداوگەلەی کە بەسەریداهاتووە پارچەکانی شیبکاتەوە و لێیان تێ بگات، بۆ ئەوەی بتوانێت بڕیار لە سەر پلانێك بدات ژیانی داهاتووی خۆی لەسەر بونیاد بنێت و ئایندەی پێ بنەخشێنێت ((لەدڵەوە لەم ڕووبەڕووبوونەوەیەم پرسی و بە دوایدا گەڕام، بۆ ئەوەی لەسەرگەرمی گەڕاندا دووبارە خۆم بە بوون بناسێنمەوە و بڕیاری دیکە بۆ چۆنیەتی ژیان بدەم)) [1] بڕیاردانیش پێویستی بەوە هەیە دان بە شتەکان دابهێنێت و بیانخاتە بەرباس ولێکۆڵینەوە، چونکە ((سەنتەری بواری بیۆگرافیا دانپێدانانە)) [2] ئەم دانپێدانانە لەرووی دەروونییەوە حەسانەوەیەك بە ناخی شاعیر دەبەخشێت و لەهەمان کاتیشدا لە رووی کۆمەڵایەتییەوە پاڵەپەستۆی لەسەر کەمتر دەکاتەوە و بواری ئەوەی پێ دەبەخشێت دووبارە بە ژیانی خۆی دا بچێتەوە و سەر لەنوێ دایبڕێژێتەوە، بۆیە هەرچەندە وا باوە شاعیران و نووسەران و سیاسەتمەدار و هونەرمەندان و....تاد، لەدوای تەمەنێکی دوور درێژدا ژیاننامەی خۆیان بنووسن و بڵاوبکەنەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەبینین، کە شاعیر لە تەمەنێکی زوودا کە گەنجایەتییە، بڕیاری نووسینەوەی یادەوەرییەکانی دەدات، کە ئەمەش قەوارەی ڕووداوەکان و کاریگەرییەکانمان لەسەر ناخی شاعیر و ژیانی تایبەتی ئەومان بۆ پیشان دەدات.

لە چنینەوەی ڕووداوەکانیشدا، شاعیر خۆی بە سێکوچکەی کۆنی گێڕانەوە کە بەسێکوچکەی مۆپاسانی ناسراوە نەبەستۆتەوە، واتە ڕووداو بەپێی زەنجیرە بەندی خۆی لە سەرەتا و ناوەڕاست و کۆتاییدا سنووربەند نەکراوە، بگرە شاعیر ئەم یەکانەی تێکشکاندووە و لەگێڕانەوەی ڕووداوەکاندا پارچەکانی تێکەڵ بەیەکتر کردووە و لە پارچەیەکی ڕووداوێکەوە کە تەواو نەکراوە، هەنگاوی گێڕاوەی بۆ پارچەیەکی دیکە بردووە و بەشێکی لەوی گێڕاوەتەوە. بەمەش گێڕانەوەی ڕووداوەکان لە تەمەنی منداڵییەوە بۆ تەمەنی گەنجێتیدا چووە، بەپێچەوانەوە لەتەمەنی گەنجێتیدا بۆ تەمەنی منداڵی ڕەوتی ڕووداوە هەنگاوی ناوە:

ڕەوتی ڕووداو

منداڵی ────────────► گەنجێتی

گەنجێتی ◄──────────── منداڵی

---

١- هەمان سەرچاوە، ل٦.

٢- فيليب لوجون، السيرة الذاتية، الميثاق والتاريخ الأدبي،ترجمة وتقديم: عمر حلي، ل١٢.

ئەم جۆرە گێڕانەوەیەش بەرگێکی خەیاڵی وفـەنتازی بـە خـودی ڕووداوەکـە بەخشـیوە و لەکش و هەوایەکی سیحریدا لە پێش چاوی خوێنەر دێن و دەچن. ڕووداو لەم ڕۆمانـە شـیعردا بەسەر (٨) بەشی سەرەکیدا دابەشکراوە و هەر بەشێکیش ژمارەیەکی تایبەتی بۆ دیـاریکراوە کە لە ژمارە (١) ەوە دەست پێـدەکات تـا ژمـارە (٨)، واتـە بەشـەکان هـیچ ناونیشـانێکی لاوەکییان نییە، دەقەکە تەنیا یەك ناونیشـانی سـەرەکیی هەیـە، کـە ئـەویش ڕەنگدانـەوەی ڕووداوی سەرەکییە، کە ژیاننامەی شـاعیر لـەخۆ دەگرێـت. واتـە ناونیشـانی سـەرەکیی کـە (زێوان)ـە چڕکردنەوە و کورتکردنەوەیەکی خەستی ڕووداوی ڕۆمانە شیعرەکەیە.

شاعیر لەسەرەتای گێڕانەوەی بیرەوەرییەکەدا لە ڕووداوی لەدایکبوونی خۆی وهاتنە سـەر دنیای بووندا دەست پێدەکات:

**((منداڵیی هێشتان ناونەنراوم لەسەر ڕانی**
**ئەو ڕێیانەی دەبنە حەکایەت**
**خۆی دەگێڕێتەوە))      ( زێوان، ل١٧)**

دیارە لەو ساتانەی کە منداڵ لەدایك دەبێت، هێشتا ناوێکی دیـاریکراوی لـێ نـەنراوە تاوەکو لەسەرجەم مرۆڤەکانی دیکەی پێ جودا بکرێتەوە، ئەم جودابوونەوەیەش بە ناوەکەیەوە، هەڵگری شوناس و خەسڵەت و وێنەکانییەتی. لەهەمان کاتیشدا شاعیر ئاماژە بەوەش دەکات ئەو وەکو مرۆڤێك هیچ پرس و ڕا پێکردنێك و ڕۆڵێکی نییە لە هەڵبـژاردنی ئـەو نـاوەی کـە دواتر دەبێتە تەنیا ناسنامە و خاڵی جیاکەرەوە، بگرە ئەم ناوە کەسـانێکی دیکـە کـە ڕەنگـە زیاتر خانەوادەکەی بن لێی دەنێن و ئیتر ئەو ساتەی کـە لـەدایك دەبێـت، شـاعیر دەسـت بـە گێڕانەوەی ڕووداو و یادەوەرییەکانی دەکات، ئەو ساتانەی کە شاعیر خۆی هەستی پێنکردوو و ئاگای لێ نەبووە، بەڵام دواتر هەستی پێکردووە و بینیویەتی کە منداڵ لە کـاتی هاتنـە سـەر دنیادا یەکڕاست قورئانی پیرۆزی لەبن سەری دادەنێن و دەڵێت:

**((ڤیژەی یەکەمین کتێب**
**لەناو چاڵە بەفرەکان گوێی زرینگاندمەوە)) ( زێوان، ل١٨)**

شاعیر دەمی قسەکردنی لە تەمەنی منداڵی خۆی دەکات و باسی ئەو سات و کاتانـەمان بۆدەکات کە چۆتە قوتابخانە و لەگەڵ هاوڕێیەکانیدا بەکۆڵانەکاندا گەڕاون و یاری تۆپی پـێ و یارییەکانی دیکەیان کردووە و دەڵێت:

**((کۆلآنەکان دەیگەیاندمە قوتابخانە و گۆڕەپانی ڕووخۆشی تۆپی پێ**
**پاشان دووکانە پڕ نهێنییە ڕەنگاوڕەنگەکانی گوندی گەنجینەی منداڵییم**
**چاوی خەون جۆگەی هاوێشت)) (زێوان، ل١٨)**

یان دەڵێت:

**((وەك یەکەم ڕۆژی چوونە قوتابخانە**
**لافاو لەو جۆگەیە نیشتەوە)) ( زێوان، ل١٩)**

یان دەڵێت:

**((دەگەڕێینەوە گۆڕەپانی پڕ بڕیاری یاری باسکە و دووگۆڵی**
**کە بە زۆر و بەکەم نایبینینەوە)) ( زێوان، ل٢٧)**

یان دەڵێت:

**((منداڵیم لە ڕاوە ماسی و کۆلارە هەڵدان و هێلکە شکاندن داماڵدرا)) (زێوان، ل٢٨)**

ئەو ساتانە لەلای شاعیر گەنجینەیەکە و هەموو دەم لەیادی ماوەتەوە و دەگەڕێتەوە سەری بۆ ئەوەی خەونەکانی لەسەر بنیات بنێتەوە، هەر بۆیەش هەمیشە زاراوەی ( گوندی گەنجینەی منداڵی) لەبری (منداڵی) وەکو زاراوەیەکی ڕووت بەکاردەهێنێت، لەهەمان کاتیشدا نوستالیژیایەکە، کە دووبارەبوونەوەی بۆ نییە و هەرگیز جارێکی دیکە شاعیر ناگەڕێتەوە ئەم قۆناخە و ئەم تەمەنە نابینێتەوە. خەونیش هەمیشە لەلای ئەو واتای ئاواتی گەیاندووە، دیارە مرۆڤ بەپێی قۆناخەکانی تەمەنی ئاواتی خۆی هەیە و هەوڵی دەدات جێبەجێی بکات و ئەگەر جێبەجێش نەکرێت وەکو خەونێك هەر لە خەیاڵدانی دەمێنێتەوە و لەپێشچاوی ون نابێت، بۆیە شاعیر لێرەدا خەون وەکو دەلالەتێك لەبری ئاوات بەکاردەهێنێت و ئەمەش واتای ئەوە دەگەیەنێت کە ئاواتەکانی شاعیر جێبەجێ نەبوون و نین.

پاشان شاعیر ئاماژە بە داپیرەی دەدات و حیکایەتەکانی ئەو کە مایەی تێڕامان و بیرکردنەوە بوونە سەبارەت بە شاعیر و هەمیشە تام و چێژ و لەزەتی لێبینیوون و بەهۆیەوە گەشتی بەرەو گەلێك ئاقار وکیشوەری دنیادا کردووە. لەلایەن شاعیرەوە ئەگەر منداڵی سێ بەشی ژیانی پێکبهێنێت، ئەوا حیکایەتەکانی داپیرەی بەتەنیا بەشێکی بۆخۆی داگیرکردووە:

**((ئەم دنیایە**
**سێ بەشی ئاوە**

**بەشێکی زەوی**
**منیش سێ بەشم گوندی گەنجینەی منداڵی**
**بەشەکەی دیکە حەکایەتی پاڵەوانەکانی دەم ئاگردانی داپیرە)) ( زێوان، ل ٣٧)**

ئەم بەشە گرینگەی ژیانی شاعیر کە بریتییە لە حیکایەتەکانی داپیرە، لەلایەن شاعیرەوە هەقیقەتە، هەقیقەتێکی یەقین کە شاعیر بەیەکەم قوتابخانە و یەکەمین پۆلی خوێندن لەقەڵەم داوە:

**((ئەی هەقیقەت**
**ڕوونتر لە حەکایەتەکانی داپیرە و شکۆدارکردنی**
**تەختەڕەشی یەکەمین پۆلی قوتابخانەی گوندی گەنجینەی منداڵیم)) (زێوان،ل٥٦)**

شاعیر لەدرێژەی گێڕانەوەی چیرۆکی ژیانی خۆی لەزۆر جێگە باسی مردنی باوکی دەکات و هەر زووش ئەومان بۆ باس دەکات، کە باوکی کۆچی دوایی کردووە و دیارە ئەمەش خەم و خەفەتێکی زۆری بۆ شاعیر بەجێهێشتووە و دەڵێت:

**((ئاوێنە کە ناواخنی چاوە نەیگەیاندمەوە وێنەکانی**
**بە منداڵی لەسەر کێلی باوکم کێشام))**
**((دەریای ترسناك  ئەو کەڵەکەی لەناوت بەهاوار و خورپەیە منداڵیمە**
**سەوڵەکانی دەستی باوکمن**
**ئەو دەستانەی جاران جغارەیان دەپێچایەوە**
**فانۆسیان پێدەکرد**
**تاژی دەکردە دۆستی بە وەفای ئەسپ)) (زێوان، ل ٢٤)**

شاعیر لە باسکردنی باوکیدا هەمیشە جێگەیەکی شکۆداری بۆ بەجێهێشتووە و بەکەسێکی باش و ماندوو وەسفی دەکات و دەڵێت:

**((باوکم پیاوێکی زۆر باش بوو**
**لەناو دڵی تاوێرە بەرد**
**ماڵێکی ساکاری ڕازاندبووەوە**
**ڕابەرایەتی لەناو دەکرد**
**خودای لەگەڵ))  ( زێوان، ل ٨٥)**

پاشان شاعیر باسی دایکی دەکات  و ئـەوە ڕوون دەکاتـەوە کـە هـەواڵی کۆچـی دوایـی باوکی، لەزاری دایکی خۆی بیستووە:

**((دەنگێك لەهەستی جەربەزەیی شیری دایکمەوە**

**ئەو گۆڕە گۆڕی باوکتە))   ( زێوان، ل ٣٩)**

بۆیە هەمیشـە هـۆگری دایکـی دەبێـت و لـە کـەوتن و شکستەکانیشـەوە ئـەوا دایکـی بەهاوارییەوە چووە و یارمەتی داوە:

**(( کە دەکەوتم دایکم بە گۆڕی تەمەنکشاوێکی دادەدام**

**خۆڵی ناو پیاڵەی دەنواوە**

**گوێم لە گۆرانی ڕوون دەبوو))  ( زێوان، ل ٥٨)**

هەموو مرۆڤێـك لەژیانـدا خۆزگـەی ئـەوە دەخوازێـت بگەڕێتـەوە تەمـەنی منـداڵی. هەرچەندە شاعیر لە تەمەنی منداڵیشدا هەموو ئاواتەکانی بەدی نەهاتووە و هێشتا حـەز بـە کەرەستەو کەلوپەلی منداڵانەش دەکات. ئەوەتا شاعیر دان بەمە دادەنێت، کە تەمەنی منداڵی ئەو زوو لە تەمەنی ئاسایی خۆی تەواوکردووە، ئەگینا بیرەوەرییەکان زۆرتر دەبوون:

**((نەیانهێشت منداڵیم تێر خەو بێت**

**بە بەشێك لە بیرەوەرییەکانی بنازێ))  (زێوان، ل ٢٠)**

بۆیە شاعیر تەمەنی منداڵی خۆی بە ئەفسانە و خەیاڵێکی بەهێز وەسف کردووە کە تا مردن لە دنیادا دەیباتە دەرەوە بیروهۆشی لەلایەتی:

**((لە نێوان لەدایکبوون مردندا**

**گوندی گەنجینەی منداڵیم**

**یادەوەرییەکی جوان و ئەفسانەیەکی بەهێزە)) ( زێوان، ل ٧٦)**

لەپاشـاندا شـاعیر  ئـەو کارەسـات و ماڵوێرانییـەی کەدووچـاری  گوندەکـەیان بـووە دەگێڕێتەوە و ڕووداوی کاولکردنی گوندەکەیان لەساڵانی شەستەکانەوە کەچۆن لەلایەن حەرەس قەومییـەوە وێـران کـرا بـاس دەکـات، سـەرەتا شـاعیر دیمـەنی ڕەنگینـی گوندەکـەمان بـۆ وێنەدەکێشێ:

**(( گوندی گەنجینەی منداڵیم حەوش و بانێکی خانەدانە**

**جۆگە لەناویدا سێبووری دەداتە**

**ئەو کەنارانەی پێی ڕاوچییەکان ڕێزیان گرتووە**
**کەناریش گیا دەیکاتە سەیرانگای ستایش**
**قومری دێنە ناوی باڵەکانیان ئاوچۆڕ دەکەن))  ( زێوان، ل ٢٤)**

ئینجا شاعیر باسی ئەو ئێوارەیەمان بۆ دەکات کە هێرشی حەرەس قەومییەکان کە بەچەتە ناویان دەهێنێت بۆ سەر گوندەکەیان دەست پێدەکات و وێرانی دەکەن و خەڵکەکەشی ئاوارە و پەراگەندە دەکەن و لەزێدی باب و باپیرانیان دەریان دەپەڕێنن و خاکەکەشی داگیر دەکەن:

**((لەو ئێوارەیەی کێوە بەرزەکان خۆیان بە**
**شۆڕشگێڕ و**
**مامز و**
**قورینگ و**
**شمشاڵژەن ئارایش کردبوو**
**کراسی خاکمان کردەوە**
**قۆپچەکانی ئێسکبوون**
**دەنگێك لەهەستی جەربەزەیی شیری دایکمەوە**
**ئەو گۆڕە گۆڕی باوکتە**
**ئێسکێك چاوی تامەزرۆیی ڕژایە سیمای ڕوونم**
**بەکامی دڵ پەیامی گەیاند**
**گوندی گەنجینەی منداڵیت**
**لە فەرموودەی بکوژی چەتان**
**هێدی هێندی دەبێتە کاروانێکی درێژ)) ( زێوان، ل ٣٩)**

ئەو ڕۆژانە بەلای شاعیرەوە ڕۆژانێکی ئاسایی نین، چونکە کەس بەهانای کەسەوە نایەت و هەر کەس خەریکی خۆدەرباز کردنە لەو گورگانەی کە بە ئاقاری ئەو گوندەدا پەرتبوونە و تەنانەت کۆترەکانیش ناوێرن لە حەوشەی ماڵەکاندا بنیشنەوە و دەنکە دانێك هەڵگرنەوە:

**(( ڕۆژانێکە کەسێ دەنگێك**

**لە دەرگای کەسێکی دیکە هەڵناستێنیٚ**
**تیشك نەنیشتووەتە لەشی ڕێبوارە خەواڵووەکان**
**کۆتر نەهاتووەتە حەوشە دەنکە دان هەڵگرێتەوە**
**گورگ پەرتن**
**کەوڵی کارمامز ئاگری گردبوونەوەیانە)) ( زێوان، ل ٤٠)**

لەئەنجامی وێرانکردنی گوندەکەیان خانەوادەی شاعیر ڕوو لەشاری هەولێر دەکەن و لەنێوان ئارەزووی گەڕاندنەوە بۆ سەر زێدی خۆیان و بیٚ هیوایی لە ڕووداوەکـانی ڕۆژگاریشـدا، شاعیر بڕوای بەوە نییە کە بگەڕێنەوە، بۆیە لەگەڵ ئەو کۆچکردنەیان بۆ شار، شـاعیر بـیر لـە پیربوونی خۆی لەشاردا دەکاتەوە، واتە لەلای ئەو هیوای گەڕانەوەیان بـۆ گوندەکـەیان تـا پـیر بوون و مردن نامنێنێت:

**((لە شاری جۆشخواردووی سەر زەمین**
**خانوویەکی ساکارت لە دەرختی بەردار بۆ دروست دەکەم**
**تێیدا پیر بە**
**باخەکەشی بەخاوەن کە**
**ئەی خاوەن باخ)) ( زێوان، ل ٤١-٤٢)**

ئینجا شاعیر ژیانی تازەی خۆی لـە شـاری (هـەولێر)دا بەسـەر دەبـات و ئـاواش باسـی کۆچکردنیان بۆ شار و گەرەکەکانی ئەو شارەمان بۆ دەکات:

**((ئەو چڵە ڕەیحانە بەژن باریکانە لەدەمی نەرمی دێراو**
**بای وادە بۆنیان هەڵدەگریٚ بۆ ناو شاری ڕازاوە بە باخچەی گشتیی))(زێوان، ل٤٧)**
**((لە بۆنی منارەی چۆڵی**
**پەراسووی زەوی چەند گەڕەکێك دابەش دەکات)) ( زێوان، ل ٤٤)**
**((بوومەلەرزە یاریگەی منداڵیمی کردە بازگەی گەورەی شار)) ( زێوان، ل ٦١)**

ئیدی ژیانی شاعیر لە شارەوە دەست پێدەکات و هەر لەوێش پێڕادەگـات و گـەورە دەبێت و پیٚ دەنێتە قۆناخی گەنجێتییەوە، لێرە بەدواوە شاعیر یادەوەرییەکانی گەنجێتی خۆیان بۆ دەگێڕێتەوە، گرینگترین و سەرنجراکێشـترین ڕووداو کـە دواتـر ژیـانی شـاعیر دەگۆڕێـت و کاریگەریی ئەو ڕووداوە وەکو تارماییەك بەسـەرییەوە دەبێـت، ڕووداوی خۆشەویسـتی لەگـەڵ

ئافرەتێـك بـەناوی (نواڵە)یـە. شـاعیر ئـاوا گەشـتی لەگـەڵ نواڵـە و یەکترناسـینیان بۆمـان دەگێڕێتەوە:

**((نواڵە بۆ هەمیشەیی دەمکاتە دۆستی بێهوودەیی**

**سبەینەی ٣١ی ٣ی ١٩٨٣ لەدەرختی شانازیم خوارد)) ( زێوان، ل ٤٥)**

شاعیر ئەو ڕێکەوتەی بەرۆژ و مانگ لەیادە، کە بۆ یەکەمجار نواڵەی ناسی و پێوەندییەکی خۆشەویستی لەنێوانیاندا دروست دەبێت، بەڵام وادیارە ئەم پێوەندییە لە هەڵکشان و داکشاندا بووە، تەنانەت شاعیر لە گەلێك جێگەدا بە دەڕندە باسی دەکات، کە دیارە ئەمەش بۆ خـودی نواڵە دەگەڕێتەوە کە کۆت و بەندی لەبەردەم ئەزموونی خۆشەویستەکەیان دروست کردبێت:

**((لەچیت بدوێم**

**بەردێکت هاوێشتە بەرپێم**

**بەولاشمدا تەلیسم و تۆق و تۆفانە**

**هەموومان قووت دەدات**

**بە نەوییاتیی گردێکیش درێژ دەبمەوە**

**دەمێك ڕاز و دیدار**

**دووپشکێکی گەرمبووی بەرخۆری چلەی هاوینن**

**چۆنیان پێ لەسەر دانێم پێم وەدەدەن)) ( زێوان، ل ٦٩)**

**هەروەها دەڵێت:**

**((بێ ئاخاوتن لەسەر کورسی دروشانەوە دانیشتووە**

**هەموو شتێك لەشێوەی خۆی دروست دەکات**

**نواڵە هێندەی ئاگری شەست و سێ دڕندەی**

**گوندی گەنجینەی منداڵیمی کرد بە پاشماوەی باخچەیەکی سڕ**

**نواڵە هێندەی ئاگری حەفتا و پێنج دڕندەی**

**گوندی گەنجینەی منداڵیمی کرد بە پاشماوەی باخچەیەکی سڕ))(زێوان،ل٧٧)**

ئەم جۆرە باسکردنەی نواڵە لەلایەن شاعیرەوە دیارە هۆکاری دیاری خۆی هەبووە کە شاعیر بە ناڕاستەوخۆیی ئاماژەی بۆ دەکات کە ئەویش درۆکردنی نواڵەیە لەگەڵ شاعیردا:

**((درۆکردنی ئەسپ لەگەڵ ئەو سوارەی**

**بەپشتیەوەیە دەگەنە کانی و مێرگێك)) (زێوان، ل ٨)**

بۆیە ئەو پێوەندییە ڕووەو لێکترازان دەچێت:

**((نواڵە ئێستە کاتژمێرەکەی نووستووە**

**ماوەیەکە پیاسەمان بەتاڵ کردووە**

**ناچینە بینینی پاڵەوانبازی ماسی ناو حەوزی شووشەش)) (زێوان، ل ٣٧)**

دواجار ئەم ڕووداوە خۆشەویستییە بە دەست لەیەك بەردان کۆتایی دێت و شاعیریش کۆتایی خەونەکانی ( ئاواتەکانی) بەگەیشتن بەئەو ڕادەگەیەنێت:

**((نواڵە لەگەڵ ئاسۆ سوور هەڵگەڕا**

**قاچەکانی تا ئەژنۆ شوشت**

**ئاوێنەم دایە بنی ڕووبار دەموچاوی مردنم بینی)) (زێوان، ل ٩٧)**

**((لەبرووسکەیەکەم بۆ گوندی گەنجینەی منداڵیی**

**ئەوەم بۆ مایەوە**

**گەرمایی خەون بەریدام)) (زێوان، ل ٩٥)**

**((چیم بۆ مایەوە**

**من و کیژی مەرگ و یەکترناسین)) (زێوان، ل ١٠٢)**

دەورانی گەنجی شاعیر وەکو ئەزموونێك لەلایەن شاعیرەوە سوودی لێ بینراوە، کە ئەو ئەزموونەش پەند و حیکمەتی پێ بەخشیوە و زانیارییەکانی فرەوانترکردووەتەوە و توانا و وزەیەکی نوێ و تازەی پێ بەخشیوە:

**((گەنجیم باوەشێ بیرەوەری بوو**

**بوو بەپەند حیکمەت)) (زێوان، ل ٩٠)**

لەراستیشدا ڕووداوەکانی سەردەمی منداڵی لە گوند و ڕووداوی خۆشەویستییەکەی لەگەڵ نواڵەدا لەلایەن شاعیر گەلێك بایەخی پێدراوە و سێبەرییان بەسەر سەرتاپای بیرەوەرییەکانیدا داپۆشیوە، هەر بۆیە شاعیر یەکەم تاقیکردنەوەی شیعری خۆی لە باسکردنی دەورانی منداڵیدا تاقیدەکاتەوە و هەروەکو خۆی ئاماژەی پێ دەکات و دەڵێت: ((خەیاڵی

شاعیرییەتیم لەهێنانە پێشەوەی منداڵی تاقیکردووەتەوە)) [1]، هەر بۆیەش ئـەوەتانێ شـاعیر هەردوو ڕووداوی منداڵی و خۆشەویستییەکەی بەخاچێك دادەنێت کە ئەویان پێدا هەڵواسیوە:

**((نواڵە و گوندی گەنجینەی منداڵیم**

**خاچن پێیانەوە داکوتراوم)) ( زێوان، ل ٦٦)**

لەگەڵ ئەوەشدا شـاعیر ئەگـەر بـە هێمـاش بێـت، گـەلێك ڕووداوی سیاسـی بـۆ باسکردووین و ئاماژەیەکی بۆ کردووە. لەمبارەیەوە دەڵێت:( شیعرم نـەکردووە بـە ئـامرازی مەبەستە سیاسییەکان، یان دەربڕی سۆزی سیاسی، بەڵام باوەڕ و بیری سیاسیم ڕاکێشاوەتە ناو مەبەستە شیعرییەکانم)) [2]، لەم چوارچێوەیەدا وەکو ئاماژەدانێك بە ڕووداوی سیاسی باسی لە کودەتایەکانی ساڵانی (١٩٥٨ و ١٩٦٣ و ١٩٦٨) کردووە، کە وڵاتیان بەرەو کارەسات برد:

**((کودەتایەك بەگوێی کوودەتایەکی چرپاند**

**ئارمی وڵات لە چ قوماشێك چاپ بکەین)) ( زێوان، ل ٢١)**

**((کوودەتاچیش یەك ئەوی دی دەکاتە ئەسپی ملکەچ)) ( زێوان، ل ٢٢)**

هەروەها ئاماژەدان بە ڕووداوی هێرشی حەرەس قومییەکان بۆ سەر گوندەکەی (دەربەندی گۆم) لەساڵی (١٩٦٣) دا و کاوڵ کردنی گوندەکەیان و بەستنەوەی ئەو ڕووداوە بە ڕووداوێکـی مەزنی دیکەی پڕ لە کارەسات و وێرانبوون، کە ئـەویش نسـکۆی سـاڵی (١٩٧٥) و کۆتـایی هاتنی شۆڕشی ئەیلوولە، لەمبارەیەوە شاعیر دەڵێت:

**نواڵە هێندەی ئاگری شەست و سێ دڕندەی**

**گوندی گەنجینەی منداڵیمی کرد بە پاشماوەی باخچەیەکی سڕ**

**نواڵە هێندەی ئاگری حەفتا و پێنج دڕندەی**

**گوندی گەنجینەی منداڵیمی کرد بە پاشماوەی باخچەیەکی سڕ)) (زێوان،ل٧٧)**

لێرەدا شاعیر وێرانکردنی گوندەکەیان دەکاتە دەستپێکی گێڕانـەوەی ئـەو کارەسـات و کاولکارییەی، کە لە کوردستان ڕوویاندا و کۆتاییەکەشی لوتکەی کارەساتەکەی نسکۆی ساڵی (١٩٧٥) دەهێنێت و بەیەکەوە گرێیان دەدات.

---

١- سەباح ڕەنجدەر، دوو کتێب لەبارەی شیعرەوە، ل٩٣.

٢- سەباح ڕەنجدەر، زێوان، ل ١٠..

هەروەها لە گێڕانەوەی ڕووداوەکاندا شاعیر سوودی لەگـەڵێك حیکایـەت و ڕووداوگـەلی ئەفسانەیی و ئاینی بینیوە و وەکو جێبەجێکردنێك بۆ کردەی دەقئاوێزان، تێکهەڵکێشـی نـاو ڕووداوەکانی کردووە. بۆ نموونە ڕووداوی ئـاینی ئـادەم وحـەوا و خـواردنی قەدەغـەکراوەکان و دەرکردنیان لەبەهەشت و نیشتەجێبوونیان لەسەر زەوی وەکو سـزایەك کـە بـارێکی نائاسـایی خولقاندووە و شاعیر پرسیاری ئەوە دەکات کە ئەو سزایە کۆتایی دێت و دۆخ ئاسایی دەبێتەوە:

**((ئەریٚ سێو بۆ لە میوەکانی دی جیاکرایەوە**

**قەدەغەش کرا**

**کەی ئاسایی دەبێتەوە کەرتێکی بخۆین))  ( زێوان، ل ٥٥)**

هەروەها سوود وەرگرتن لە ئەفسانەی خدری زیندە:

**((بەختیاری خدری زیندەیە**

**چاوەکانی بنوقێنێت**

**خودا خۆی پیشاندەدات))  (زێوان، ل ٢٣)**

سوود وەرگرتن لە داستان و ئەفسانەی کوردی و مەزراندنیان وەکو هێمایەك لەناو ڕووداو بیرەوەرییەکاندا، وەکو ئاماژە دان بە داستانی شیرین و فەرهاد:

**((پیرێژنێك گرەوی لەگەڵ چیایە**

**دەمی کوڵینگ بپەڕێنیٚ**

**فەرهاد پەیمان شکێن بکا))  ( زێوان، ل ٧٨)**

ئاماژە دان بە چیرۆك و ڕووداوی ئاینی و ژیاننامەی پێغەمبـەران، وەکـو ئامـاژەدان بـە ژیان و ڕووداوی پێغەمبەر (عیسا):

**((مۆسیقا ژەن لە ئاهەنگی لەدایکبوونی تاقانەی مریەم)) (زێوان، ل ٨٤)**

ئەوەی جێگەی ئاماژە پێدانە ئەوەیە، کە ئەم دەقە لێوانلێوە لە نـامۆبوون و ڕەشـبینی و نائومێدی، کەئەمەش ڕەنگدانەوەی ئەو بارودۆخـە بـووە کـە شـاعیر تێیـدا ژیـاوە  هـەر لـە وێرانکردنی گوندەکەیان و ئاوارەبوونیان و بەزۆر نیشتەجێبوونیان لەشار و بارودۆخی سیاسی و هەڵاتن لەسەربازی و خۆحەشاردان و ترس وتۆقاندن، تا دەگاتە ئەو پێوەندییـە خۆشەویسـتییە شکستخواردووەی تەمەنی گەنجێیەتی. شاعیر خۆشی لە پێشەکییەکەیدا ئاماژەی بەمە داوە و دەڵێت: ((من لەناو وڵات و کەسوکار و ماڵەکەی خۆمدا ئەو دەقـەم بەرهـەم هێنـاوە. کەچـی

نامۆبوون تەواو تانوپۆی چنیوە و بە ئەزموونی تاراوگەکراو و نامۆبوون تێدەپەڕیم)) [1]. دیارە نامۆبوون وەکو پرۆسەیەك تەنیا مرۆڤ هەستی پیێ دەکات، بەڵام ئاستی هۆشیارییەکەی ڕادەی نامۆبوونەکەی سنووربەند دەکات، بەو واتایەی، کە ((مرۆڤ بەگوێرەی ڕادەی ئەو هۆشیارییەی، کە هەیەتی نامۆ دەبێت، واتە بەگوێرەی ئاستی تێگەیشتنی مرۆڤەکان بۆ ژیان، چۆنییەتی نامۆییەکەش گۆڕانی بەسەردا دێت. دەتوانین بڕیار لەسەر ئەوە بدەین، کە مرۆڤ تەنها بەگەیشتن بە ئاستی هۆشیاری تووشی تەنگژەی نامۆیی دەبێت جا مرۆڤەکە ڕۆشنبیر بێت یاخۆ نارۆشنبیر، مرۆڤی نارۆشنبیر نەك هەر نامۆ دەبێت، بگرە نامۆبوونەکەیان تا ڕادەیەك قووڵ دەبێتەوە بەشێوەیەکـ کە لە ڕوخساریان ڕەنگ دەداتەوە، چونکە مرۆڤی نارۆشنبیر کاتێك نامۆ دەبێت ئەوا نامۆییەکەی زیاتر بە ڕکوکینە و توندوتیژی دەردەبڕێت، بەپێچەوانەوە ئەوانەی کە مرۆڤی ڕۆشنبیرن لە بوارە جیاجیاکان ناچن دەستەوئەژنۆ دابنیشن، بگرە بەشێوەی جیاجیا گوزارشت لە ناخە نامۆکەیان دەکەن بۆ نموونە دروستکردنی وێنەیەك، یان نووسینی دەقێکی ئەدەبی، یاخود ئامادەکردن و ژەنینی پارچەیەکی مۆسیقا و...هتد)) [2]. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت ئەم هەست بە نامۆبوون و غەریبی و ڕەشبینی و نائومێدی لە ژیان لە لایەن کەسێکی وەکو (سەباح ڕەنجدەر)، بەرەو ئەوە چووە- کە هەم لە دەقێکی ئەدەبی ئەو نامۆبوونە باس بکات، هەمیش ژانرێکی نوێی ئەدەبی تاقی بکاتەوە، کە هەرچەندە خۆشی هەستی بەوە نەکردووە، کە خۆی لە قەرەی ژانرێکی نوێ داوە.

ئەم بارودۆخەش هەستێکی قووڵی لەسەر مەرگ و مردن لای شاعیر دروستکردووە و دەقەکەش ڕەنگڕێژ بووە لە مەرگ و نەمان و بۆنی مردنێکی خەستی لێ دێ و لەتەواوی دێرەکاندا هەست بە مەرگ دەکەین و وشەی مەرگ ومردن ئەو وشانەن کە لەم ڕۆمانە شیعردا زۆر دووبارە بوونەتەوە و لەلایەن شاعیرەوە بەکارهێنراون. تەنانەت کەرەستەکانی مەرگ و مردن زۆر بە زەقی تێکهەڵکێشی شیعرەکە کراوە و خراوەتە بەر زەینی خوێنەر:

**((بەمنداڵی لەسەر کێلی باوکم کێشام )) ( زێوان، ل ٢٤)**

**(( گۆڕەستان ماڵێکە ئازیزەکانی**

---

١- سەباح ڕەنجدەر، زێوان، ل٩.

٢- سەرکەوت سەعدی قادر، نامۆیی لەرۆمانەکانی (سەلاح عومەر) دا، نامەی ماستەر، کۆلێژی پەروەردە ـ بەشە مرۆڤایەتییەکان، زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر ٢٠١٠، ل٣٦.

**بانگدەکاتە ناو خۆی بە مەدالیا ناسراویان دەکات)) (زێوان، ل ٣٤)**
**((گۆڕ داکەوتن**
**کێل نووشتانەوە)) ( زێوان، ل ٥٩)**
**(( بەم زووانە قاوەی تازیەم لە دەستی مێوانان دەگێڕدرێ)) (زێوان، ل ٥٩)**
**((تاتەشۆری مزگەفتی گوندی گەنجینەی منداڵیم تەڕە)) ( زێوان، ل ٦٣)**
**(( بەرازی ئێوە ڕووناکی ئومێد لە کفنمان دەدا)) ( زێوان، ل ٧٣)**
**(( گوێ دەدەمە ڕاز و گلەیی ئێسکان)) ( زێوان، ل ٧٣)**

ئەم وشانەی کە هێڵیان بە ژێردا هاتووە، بەشێکن لە کەرەستە و ڕێوڕەسمەکانی مردن، دیارە ئەمەش فەزای تەواوی دەقەکەی گرتووەتەوە و لە خوێندنەوەیدا هەست بە ترس و دڵەڕاوکێی شاعیر دەکەی لە مەرگ، کە وەکو دێوەزمەیەك لەم دەقەدا ل ەبەرامبەرت قووتکراوەتەوە و باڵی بەسەردا کێشاوە و هەموو شتێك بەرەو خۆی ڕاپێچ دەکات.

بەشێوەیەکی گشتیی شاعیر وەکو هەموو ئەوانەی، کە بیرەوەری خۆیان تۆمار دەکەن و بۆ نەوەکانی دواتر جێی دەهێڵن، ئەویش بیرەوەریی ژیانی تایبەتی خۆی تۆمارکردووە، لێ تۆمارکردنی بیرەوەرییەکان لەلای ئەم شاعیرە تەواو جیاواز کەوتووەتەوە لەگەڵ (شێرکۆ بێکەس)دا لە تۆمارکردنی بیرەوەرییەکانی لە ڕۆمانە شیعری (خاچ و مار و ڕۆژمێری شاعیرێ)، چونکە ڕووداوەکانی ڕۆمانە شیعرەکەی شێرکۆ بێکەس (باس لە ژیانی شاعیر دەکات)[1] واتە لەم ڕۆمانە شیعرەدا تەمەنێکی دوورودرێژ و پڕ لە هەڵکشاو داکشاوی شاعیر خراوەتەڕوو و جەخت لەسەر ماوەیەکی دیاریکراو نەکراوەتەوە، بگرە مەبەستی شاعیر خستنەڕووی تەواوی یادەرەوەییەکانی تەمەنییەتی، کە دیارە لە تەمەنێکی درەنگیشدا نووسراوەتەوە. بەڵام لای (سەباح ڕەنجدەر)دا، ڕۆمانە شیعری (زێوان) تەرخانکراوە بۆ باسکردنی بەشێك لە یادەوەرییەکان و گێڕانەوەی ڕووداوەکانی تەمەنێکی دیاریکراو و ماوەیەکی دیاریکراو، لەتەمەنێکی زووشدا کە گەنجێتییە نووسراوەتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا ئەم دوو دەقەی ڕۆمانە شیعر، بەتاقە دەقی مێژووی ڕۆمانە شیعری کوردی لە قەڵەم دەدرێن، کە بۆ بیۆگرافیای شاعیر تەرخانکراون، هەردوو شاعیر بەهۆی ژانری ڕۆمانە شیعرەوە ڕووداگەلێکی تایبەتی ژیانیان گێڕاوەتەوە.

---

١- ئەردەڵان شوکر سابیر، تەکنیکی گێڕانەوە لە ڕۆمانە شیعرەکانی (شێرکۆ بێکەس)دا، ل٣٢.

## کارەکتەر:

لەبەرئەوەی  شاعیر لەم ڕۆمانە شیعرەدا باسی ژیاننامـەی خـۆی دەکـات لـە سـەردەمی منداڵی و گەنجیـدا، بۆیـە هـەر بەخۆشـی کارەکتـەرە و تـەواوی ڕووداوەکـان لـە دەوری ئـەو دەسووڕێنەوە، بەو واتایەی کەسایەتیی شاعیر کارەکتەرێکی تەوەرییە و ڕەوتی ڕووداوەکانی لە ئەستۆ گرتووە و بەهۆیەوە ڕووداو خەسڵەت و سـیما و ئـەدگارەکانی ئـەو کارەکتـەرەمان بـۆ پیشان دەدات. بۆیە ڕەنگ و ڕووی شاعیر بە تەواوەتی بەسەر ئەم دەقەی ڕۆمانـە شـیعردا زاڵ بووە و هەناسەی شاعیر لە هەموو کون و کەلەبەرێکی دەقەکەدا هەست پێ دەکەین و لە زاری ئەوەوە ڕووداو دەست بەگێڕانەوە دەکەن:

**( یادی ماڵیکردنی ورچ دەبێتە بۆنە و نیشان**
**دیوە تاریکەکانی زەوی چی لێ دەدۆزێتەوە**
**منداڵیی هێشتان ناونەنراوم لەسەر ڕانی**
**ئەو ڕێیانەی دەبنە حەکایەت**
**خۆی دەگێڕێتەوە))      ( زێوان، ل١٧)**

لێرەدا شاعیر وەکو کارەکتەرێك خۆی پێشکەشی خوێنەران دەکات، لەهـەمان کاتیشـدا خوێنەرانیش ئامادە دەکات بۆ ئەو گەشتەی شاعیر بەتەمایە لەگەڵ خۆیـدا بیانبـات و تێیـدا باس لە بەسەرهات و حیکایەتەکانی خۆی و خانەوادەکـەی و ئەزموونـەکانی ژیـانی تایبـەتی خۆی بگێڕێتەوە. کەواتە هەر لەسەرەتاوە خوێنەر لەگەڵ شاعیر وەکو کارەکتەرێکی سـەرەکیی ئەم ڕۆمانە شیعرە ئاشنا دەبێت و پرۆسەی یەکترناسین بـە ئـەنجام دەگەیـەنن. هەرچـەندە ئـەم پرۆسەی یەکتر ناسینە تەنیا ڕواڵەتییە، بەو پێیەی شاعیر کە کارەکتەری سەرەکییە، ڕۆمانـە شیعرەکەی تەرخانکردووە بۆ ئەوەی ژیاننامەکەی لە تەمەنێکی دیاریکراودا بگێڕێتەوە، بۆیـە لە سەرەتادا خوێنەر کە ڕووبەڕووی ئەو یەکترناسینە لەگەڵ شاعیر وەکو کارەکتەری سـەرەکیی دەبێتەوە، دەیان و سەدان پرسیار بەمێشکیدا گوزەر دەکەن، لەوەی کە ئایـا ئـەو حیکایەتانـە چین کە شاعیر بینیویەتی و مەبەستییەتی خوێنەریش بەشداری پێ بکات و بـۆی بگێڕێتـەوە؟ دەبێت ژیانی تایبەتی شاعیر لەو تەمەنە دیاریکراوەدا چیٚ تێیدا ڕوویدابێت؟ تا شاعیر ئەوەندە بەگرینگی زانیبێت و هەوڵ بدات بـە خوێنـەرانی ڕابگەیـەنێ و ئاشـنایان بکـات!! بێگومـان

وەڵامی ئەم پرسیارانە دواتر لەگەڵ خوێندنەوەی ڕەوتی ڕووداوەکاندا یەکە یەکە وەکو مەتەڵێك هەڵدەهێنرێن و خوێنەر وردە وردە ئاشنای ئەزموون و کەسایەتیی شاعیر دەبێت.

ئەوەی تێبینی دەکرێت ئەوەیە کە شاعیر بەسەرهاتی ژیانی لەهەردوو تەمەنی منداڵی و گەنجێتیدا، هەمووی ناسۆر و نەهامەتی و کارەسات بووە و تێیدا شاعیر ئەو هەستە تایبەتییەی خۆی لەمەڕ ئەو ڕووداوە پڕ لە تراژیدیانەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە و هەوڵ دەدات ئەو تاقیکردنەوەیەی، کە بەسەر ئەودا هاتووە، وەکو پەند و حیکمەتێك بەخوێنەرانی بگەیەنێت و تێیدا ئەو گۆڕان و تاقیکردنەوانەی خۆی وەکو ئەزموونێك، کە شیانی ئەوەیان لێ دەکرێت لە ژیانی کەسایەتێکی کەتواری ناو کۆمەڵگەش هەبێت و یان ڕووبدەن بگوازێتەوە، بۆیە گەیاندنی پەیامەکانی ئەو گۆڕانکارییانەی کە شاعیر ویستویەتی بە خوێنەرانی بگەیەنێت یەکێکە لە ئامانجەکانی ئەوەبووە کە پێشوەختە خوێنەران ئاگەداری گۆڕان و ئەنجامەکانی ئەم جۆرە ئەزموونانە بن. هەر بۆیەش شاعیر بە جێناوی یەکەمی تاك (من) ڕاستەوخۆ لەگەڵ خوێنەرانی دەئاخفێت و گفتوگۆ دەکات و ڕووداوەکانی پێشکەش دەکات، ئەمەش بۆ ئەوەی کاریگەریی ڕاستەوخۆ و زیندوو لە دەروونی خوێنەرانی بێنێتەکایەوە و خوێنەر ڕاستەوخۆ بخرێنە ناو چوارچێوە ئەزموون و تاقیکردنەوەکانەوە.

لەم ڕوانگەیەوە دەکرێت بڵێین کە شاعیر وەکو کارەکتەری سەرەکیی ئەم ڕۆمانە شیعرە بەشدارە و کارەکتەرێکە چەسپاو نییە، بگرە کارەکتەرێکە گۆڕاوە، بەو واتایەی کە لەسەرەتای ڕووداوەکانەوە بەشێوەیەك خۆی نمایش دەکات و لەکۆتایی ڕووداوەکانیشدا بەشێوازێکی دیکە خۆی ڕادەگەیەنێت. هەروەها کارەکتەرێکی پەرسێنیشە، کەسایەتیی پەرەسێنیش ((لە ڕووی بنیاتەوە ئاڵۆزە و بەگوێرەی ڕووداوەکان و گۆڕانی بارودۆخە دەروونی و کۆمەڵایەتییەکان، قۆناخ بە قۆناخ گەشە دەکا)) [1] بەو واتایەی بەپێی ڕەوتی ڕووداوەکان گۆڕان بەسەر هەست و نەست و بیروڕاو بۆچوونەکانی لەمەڕ ژیان و مەرگدا دێت و ئەوەی لە سەرەتاوە هاتووەتە ناو ڕووداوەکانەوە، قەت ئەو کەسایەتییە نییە کە لە کۆتایی ڕووداوەکاندا هاتووەتەدەرەوە، لەهەموو ڕوویەکەوە کەسایەتییەکە گۆڕاوە و پەرەی سەندووە و پێشکەوتووە. بۆیە شاعیر لەم ڕۆمانە شیعرەدا کەکارەکتەرێکی سەرەکییە و سەرە داوی گشت ڕووداوەکانی لەدەستە،

---

١- پ.ی. د.نەجم خالید ئەلۆەنی، کارەکتەرسازی لە ڕۆمانی ئێوارەی پەروانەی بەختیار عەلی دا، دەزگەی موزیك و کەلەپووری کوردی، هەولێر ـ کوردستانی عێراق، ٢٠٠٩، ل٧٣.

لەهەمان کاتیشدا هەر خۆی کەوتۆتە ژێر کاریگەریی گشت ڕووداوەکانەوە و بەپێی بەرزی و نزمی ئەم ڕووداوانەش گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە. لەسەرەتاوە کەسایەتییەکی بە ئێمە ناساندووە، کە لەکۆتاییەکەیدا ئەو کەسایەتییە بوونی نەماوە و گۆڕاوە و کەسایەتییەکی دیکەی لێ دروست بووە. لە دێرەشیعرەکانیشدا دەکرێت لە گەلێك شوێن بە ئاشکرا هەست بەو گۆڕانکارییانە بکەین و جێ پەنجەیان لە ڕەوتی ڕووداوەکاندا دیاری بکەین:

**((گەنجیم باوەشێ بیرەوەری بوو**

**بوو بە پەند و حیکمەت)) ( زێوان، ل ٩٠)**

**(( خەونم گۆڕا**

**گیای نەمریم بەرەواژی بینی)) ( زێوان، ل ٩٣)**

لە راستیدا کارەکتەر کۆمەڵێك مەودا و ڕەهەندی هەیە، کە بەهۆیەوە خەسڵەت و سیماکانی لەناو دەقدا دیاری دەکرێن، لەوانە:

١ــ لایەنی سیاسی کە ڕاوبۆچوونی سیاسی کارەکتەر دەگرێتەوە لەمەڕ ڕووداوە سیاسییەکان و ئایدیۆلۆژی کارەکتەر.

٢ـ لایەنی دەروونی، کە پێکهاتەی دەروونی شاعیر و مەیل و ئارەزوو و توانستە و جۆری کارکردنی لەناو کۆمەڵگەکەی دەگرێتەوە.

٣ـ لایەنی کۆمەڵایەتیی، تیشك خستنە سەر پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی کارەکتەر و پێگەی لەناو کۆمەڵگە و پێوەندیی بەخێزان و دەروبەرەکەی باس دەکات.

٤ـ لایەنی جەستەیی، پێکهاتەی جەستەیی کارەکتەر شی دەکاتەوە ((ئەویش پێوەستە بە هۆکارە خۆڕسك و سروشتییەکانەوە تا دەگات بە پەروەردە و باری ئابووری و...هتد)) [1].

لەم ڕوانگەیەوە کارەکتەری سەرەکیی ئەم ڕۆمانە شیعرە، کە شاعیر خۆیەتی ئاماژەی بە ڕووداوگەلێکی سیاسی و کارەسات دەکات، کە بریتییە لە وێرانکردنی گوندەکەیان و هاتنیان بۆ شار، ئەمەش بیروڕای سیاسی و ئایدیۆلۆژی شاعیرمان بۆ ڕوون دەکاتەوە، لەهەمان کاتیشدا ڕەهەندی کۆمەڵایەتیش باس دەکات، بە تێکچوونی شیرازەی کۆمەڵایەتیی گوند و ئاوارەبوونیان، کە ئەمەش کاریگەریی لەسەر لایەنی دەروونی و جەستەیی داناوە، بەتایبەتیش شاعیر خۆی لەکات و ساتی نووسینی ئەم دەقەدا لە حەشارگەیەکەدا خۆی شاردووەتەوە و

١- یاسین قادر بەرزنجی، هونەری دراما، چاپخانەی کەمال، سلێمانی ـ کوردستانی عێراق، ٢٠٠٩، ل٢٦.

هەڵاتووی سەربازی بووە، بۆیە هەستی نامۆبوون و ترس و گومان لە مەرگ و مردن لەناو ئـەم دەقدا گەلێك بەهێزە، هەروەکو شاعیر خۆشی باس لەم لایەنەوە دەکات و دەڵێت: ((رێـك ئـەو چوار ساڵەی بەو شیعرەوە خەریك بووم، هەڵاتووی سەربازی بووم. ژیانم لە ناو خانوویەکی ڕووە و هەتاوی دوو ژووری، کە بنمیچەکەی دارەڕێ و قامیشـەبەند بـوو، بەسـەر دەبـرد)) [1]. لـە بارودۆخێکی واشدا بێگومان هەسـت و نەسـتەکان لـەبارێکی تایبەتیـدا دەبـن و لایەنـەکانی کارەکتەریش بەپێی ئەو بارودۆخە گۆڕانکارییان بەسەردا دێت.

لەگەڵ ئەوەشدا شاعیر بۆ ئەوەی تەنیا خۆی ڕووداوەکان نەگێڕێتەوە، کارەکتەرێکی دیکەی لە گێڕانەوەی ڕەوتی ڕووداوەکاندا بەشداری پێکردووە، کە ئەویش (نواڵە)یـە، هـەر زووش لـە بەشی یەکەمدا ئەو کارەکتەرە دەهێنێتە ناو چەقی ڕووداوەکانەوە و بە خوێنەری دەناسێنێت:

**((نواڵە ئەی خانەدان**

**سێبەر و هێشووی دەرختی من**

**دەتوانی پرچی بڵاوت**

**لە ناوەندی سەرت کۆکەیتەوە گەشتم لەناوی تەواو دەبێ)) ( زێوان، ل ٢٣)**

ڕۆڵی سەرەکیی ئەم کارەکتەرەش لە گێڕانەوەی ڕووداوەکانی تاقی گەنجیدایە، بەشێوەیەك کە ڕووداوی سەرەکیی قۆناخی گەنجی شاعیر پێکدەهێنێت، هەر بۆیەش شاعیر بەوردی گەیشـتن و یەکترناسینی لەگەڵ نواڵە بۆ خوێنەران باس دەکات، تەنانەت ڕۆژ و ساڵی یەکەمی یەکتر ناسین و دیداریان دەخاتە بەر دەمی خوێنەر:

**(( نواڵە بۆ هەمیشەیی دەمکاتە دۆستی بێهوودەیی**

**سبەینەی ٣١ی ٣ی ١٩٨٣ لە دەرختی شانازیم خوارد)) ( زێوان، ل ٤٥)**

دەتوانین بڵێین کەسایەتیی نواڵە کاریگەرییەکی زۆری لەسەر خودی کارەکتەری سەرەکیی، کە شاعیرە هەیە و لایەنەکانی ئەو کارەکتەرەی کۆنترۆڵ کردووە، بەشێوەیەك کـە شـاعیر لـە تەواوی دەقەکدا ئاماژە بە هەڵسوکەوت و گوفتار و ڕەفتـاری ئـەو دەکـات و لـەژێر سـێبەری ئەودایە، بەتایبەتیش کە تەواوی ڕەوتی ڕووداوەکانی قۆناخی گەنجێتی شاعیر کەوتووەتـە ژێـر کاریگەریی ئەو کەسایەتییەوە و تێیدا هەم ڕووداو و هەمیش کارەکتەر بـەڕێوە دەبـات. لـەم ڕوانگەیەوە دەکرێت بڵێین، کە (نواڵە)ش کارەکتەرێکی سەرەکییە و لەتەك شاعیردا بەشێك لە

١- سەباح ڕەنجدەر، زێوان، ل ٧.

گێڕانەوەی ڕووداوەکانی لە ئەستۆ گرتووە و پێگە و قەبارەیەکی لەناو گۆڕەپانی دەقەکەی بۆ خۆی مسۆگەر کردووە. بەهەمان شێوەی شاعیریش، کارەکتەری نواڵەش، کارەکتەرێکی چەسپاو نییە و ئەویش بەپێی گۆڕانکارییەکان، گۆڕانی بەسەردا دێت و خەسڵەت و سیمای ئەو کەسایەتییەی کە لە یەکەم دیداردا شاعیر بۆمانی دەگێڕێتەوە زۆر جیاوازە لە خەسڵەت و سیمای ئەو کەسایەتییەی نواڵە، کە لەکۆتایی دەقدا بەرچاومان دەکەوێت. لەهەمان کاتیشدا کەسایەتییەکی پەرەسێنەو بەپێی ڕەوتی ڕووداوەکان گۆڕانی بەسەرداهاتووە و پێشکەوتووە، بەڵام ئەو گۆڕان و پێشکەوتنە لە لایەن شاعیرەوە بەرەو باشە چووە و بۆتە هۆکاری پێداچوونەوەی بە کاروباری ژیانی تایبەتی خۆی و سەرلەنوێ پلاندان بۆ ژیانی داهاتوو، بەڵام لای کارەکتەری نواڵە ئەو گۆڕان و پێشکەوتنە لایەنێکی نەگەتیفی وەرگرتووە و لەئەنجامی بەبێ بەڵێنییەوە ئاراستەیەکی دیکەی وەرگرتووە، کە شاعیر لە داوای دابڕانی لێی و کۆتایی پرۆسەی خۆشەویستییەکەی بۆمانی نەگێڕاوەتەوە و ئەنجامەکەی نازانین بەچی گەیشتووە.

ئەوەی جێگەی تێبینییە ئەوەیە، کە شاعیر ڕاستەوخۆ ناوی ئەو کارەکتەرەی هێناوە، کەناوێکی تایبەتییە. ناوی تایبەتیش لەلایەکەوە ناسنامەیەك بۆ خاوەنەکەی دروست دەکات و لەلایەکی دیکەشەوە سنوورێکی دیاریش دەکێشێت بەدەوری ئەو کەسایەتییەوە، بەو پێیەی کە ناوی تایبەتی هەڵگری سیما و حەزو ئارەزووەکانی کەسایەتییەکە و ئەو سیما و خەسڵەت و حەزو ئارەزووانەش تایبەتن بەخودی خۆیەوە و نیشانەن بۆ ئەو. هەرچەندە ناشزانرێت کە نواڵە ناوی ڕاستەقینەی ئەو کەسەیە، یاخود نازناوێکەوە شاعیر لەخەیاڵی خۆیەوە دایهێناوە.

لەم ڕۆمانە شیعرەدا چەند کارەکتەرێکی لاوەکی بوونیان هەیە، بوونی هەندێکیان پێوەستە بەوەی، کە لە ڕووی خێزانییەوە پلەیەکی نێزیکیان لە ژیانی شاعیردا هەیە ئەوانیش (دایك و باوك)ی شاعیرن، کە شاعیر هەر بە دایك و باوك ناویان دەهێنێت و هیچ ناوی تایبەتی خۆیان ناهێنێت، یان نازناوێکیان بۆ دانانێت. لەگەڵ ئەوەشدا شاعیر ڕاستەوخۆ کەوتووەتە ژێر کاریگەریی ئەو دوو کارەکتەرەی، کە بەخێویان کردووە، بەتایبەتیش باوکی، کە لە دەقەکەدا شاعیر زیاتر لە دایکی ڕۆڵی پێداوە و باسی دەکات و هۆگری بووە و هەمیشە لە یادێتی و باسی دەکات:

**((باوکم پیاوێکی زۆر باش بوو**
**لەناو دڵی تاوێرە بەرد**

**ماڵێکی ساکاری ڕازاندبووەوە**
**ڕابەرایەتی لەناو دەکرد**
**خودای لەگەڵ))  ( زێوان، ل ٨٥)**

ئەو دوو کارەکتەرە (دایك و باوك) زیاتر لە دەورانی منداڵی شاعیر دەخرێنە بەر باس و دەبنە تەوەری سەرەکیی ڕووداوەکانی منداڵی، چونکە لە دەورانی گەنجیدا (نواڵە) وەکو کارەکتەرێك تەوەری ڕووداوەکان پێکدەهێنێت. لەگەڵ ئەوەشدا شاعیر لەبەرئەوەی زیاتر لەژێر کاریگەرییەکانی کارەکتەری نواڵەدایە، بۆیە هەر لە بەشی یەکەمدا لەگەڵ باسکردنی دەورانی منداڵی و دایك و باوکیدا، یەکڕاست دەچێتەوە لای نواڵە ناوی دەهێنێت و بەخوێنەرانی دەناسێنێت.

هەروەها شاعیرانی وەکو (نالی و مەولەوی و حاجی قادری کۆیی)یش لەناو دەقەکەدا دەردەکەون، شاعیر هەمیشە دەیەوێت چ لە ڕووی شوێنەوە، کە گوندە، چ لە ڕووی پێوەندیی خۆشەویستی ئەو شاعیرانەوە بۆ نموونە نالی و حەبیبەوە خۆی لەگەڵیاندا بەراورد بکات:

**((نالی ئێسکەکانی خۆی بە خاك و خۆڵ بەخشی**
**تا ببێتەوە خۆڵ**
**بەسەر برینی منداڵییدا بکرێ**
**ژانی بشکێت**
**حاجی قادری کۆیی ئێسکەکانی خۆی بە گۆڕ قەرەج بەخشی**
**تا ببێتەوە خۆڵ**
**بەسەر برینی منداڵییدا بکرێ**
**ژانی بشکێت**
**مەولەوی ئێسکەکانی خۆی بەسەرشاتە بەخشی**
**تا ببێتەوە خۆڵ**
**بەسەر برینی منداڵییدا بکرێ**
**ژانی بشکێت**
**منیش ئێسکەکانی خۆم بەدەربەندی گۆم بەخشی**
**تا ببێتەوە خۆڵ**

**بەسەر برینی منداڵیمیدا بکەم))  ( زێوان، ل ٧٣-٧٤)**

ناوهێنانی ئەم شاعیرانەش لەناو دەقدا، بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، کە شـاعیر کەوتووەتـە ژێـر کاریگەریی ژیان و بەرهەمی ئەم شاعیرانە و پێیانەوە سەرسـام بـووە، بـەڵام پێدەچێت نـالی شاعیر زیاتر جێگەی بایەخ پێدانی شاعیر و سەرسامبوونی بووبێت، چونکە لە گـەلێك شـوێن وەکو کارەکتەرێکی لاوەکی ناوی دەهێنێت:

**(نالی دەموچاوی لەکاتی بیرکردنەوە لە شارەزوور تێیدا دەگەشێتەوە) (زێوان،ل٢٢)**

**((حەوزی تەکیەی نالی ئاوی کەم کردووە)) ( زێوان، ل ٥٣)**

**((نزیك ماڵی نالی دەوەستم**

**ئەو دیمەنانە دەبینم کە چاوم داوایان دەکات**

**بەسەر پەیژەی بەفر گرتوو دەگەمە دەرگاکەیان**

**ناخزێم و بەرنابمەوە**

**پۆرترێتی حەبیبەم دەداتێ بەدیاری بۆ نواڵەی ببەم)) ( زێوان، ل ٨٨-٨٩)**

لەگەڵ ئەوەشدا کۆمەڵێك کارەکتەری لاوەکی سـادە لـەناو ئـەم دەقـەدا دەکەوێتـە پـێش چاومان کە کارێکی ئەوتۆیان لەسەر ڕەوتی ڕووداوەکان و ژیـانی شـاعیردا نییـە، هەنـدێکیان تەنیا وەکو هێمایەك بە مەبەستێك ئاماژەیان بۆ کراوە و ناویان هاتووە، وەکو (ئـادەم، حـەوا، خدری زیندە، پیرەمێرد، پیرەژن، مام زۆراب، بابەنۆئیل، فەرهاد و...هتد). ئەمانە زیاتر لـە چوارچێوەی ڕووداوەکاندا و لە ڕێگەی وەسفکردن و لێکچوواندنەوە هاتوونەتە ناو دەقەکـەوە و وەکو ئەکتەرێك  کە ڕووداوەکان بگێڕێنەوە، دەرنەکەوتوون.

## شوێن:

شوێن لەم ڕۆمانە شیعرەدا کاریگەرییـەکی زۆری بەسـەر ڕووداوەکانـدا هەیـە، هەمیشـە سێبەرێکە بەسەر ئەو حیکایەت و بەسەرهاتانەی، کە شاعیر بۆ ئێمەی دەگێڕێتەوە، هەر لەبەر ئەمەشە خوێنەر لە ئەنجامی خوێندنەوەی دەقەکە هەست بە قەوارەیەکی گەورەی شوێن دەکات لە گۆڕەپانی دەقەکەدا، ڕووداوەکانیش بەشێوەیەك پێوەسـتن بـە شـوێنەوە، کـە ناکرێـت لێـی دادەبڕێـت و جـودا بکرێتـەوە، چـونکە شـاعیر بەشـێك لـەو ڕووداوانـەی لـەبارەی شـوێنی

نیشتەجێبوونی خۆیەوە باسکردووە و پێوەندییی ڕاستەوخۆیان بە ئـەو شـوێنەوە هەیـە، بۆیـە ڕووداو تییدا ڕوویەکی زیندووی شوێن لەخۆ دەگرێت.

لەبەرئەوەی دەقی ئەم ڕۆمانە شیعرە باس لە ژیاننامەی شـاعیر دەکـات و ڕووداوگـەلێکی کەتواری دەگێڕیتەوە کە بەسـەر خـودی شـاعیر و میللەتەکەیـدا هـاتوو، هـەر بۆیـەش ئـەو شوێنانەی، کە شاعیر باسی لێوە کـردووەن شـوێنی کـەتوارین و بـوونێکی کـەتواریان لەسـەر زەویدا هەیە و تا ئێستەش ماون و لە ڕێگەی ئەم دەقە شیعرییەوە گۆڕانکاری و مێژووی ئـەو شوێنانەمان بۆ دەگێڕدرێتـەوە و بـاس دەکرێـت. بۆیـە گێڕانـەوەی حیکایـەتی ئـەو شـوێنانە ((هەستەکانی ناوەوەی خوێنەر دەورووژێنن، وەك چۆن بۆ نووسەر دەبنە کەرەسـتەی هونـەری، ئاواش بۆ خوێنەر فەزایەکی سەرنجڕاکێشن)) [1] و تێیدا چوارچێوەیەك بۆ ڕووداو و کارەکتـەر و کات و تەکنیکەکانی دیکە دروست دەکات و خوێنەر لەبـەردەم دیمـەنێکی سـینەمایی یـاخود وێنەیەك دادەنێت، بۆ ئەوەی زیاتر بچێتە قووڵایی بابەتی ڕووداوەکەوە.

هەروەها لەبەرئەوەی شاعیریش خەڵکی شـاری هـەولێرە، بۆیـە شـوێنەکان لـەو شـارەو گوندەکانی دەروبەری دەبنە گۆڕەپانی ڕووداوەکانی ئەم ڕۆمانە شیعرە. بەشـێوەیەکی گشـتیش ئێمە لەم ڕۆمانە شیعرەدا، دەتوانین دوو شوێنی سەرەکیی دەستنیشان بکەین، کە ڕووداوەکانی تێدا گوزەر دەکەن. ئەم دوو شوێنە پێوەسـتە بـە ژیـانی خـودی شـاعیرەوە، بـەو پێیـەی کـە ڕووداوەکان لەگەڵ لەدایکبوونی شاعیر و تەمەنی منداڵی و گەنجیـدا دروسـت دەبـن و بـەپێی ژیانی شاعیریش گەشەدەکەن و شوێنەکان دەگۆڕێن. لەم چوارچێوەیەدا ئەم دوو شوێنە پێوەستن بە هەردوو قۆناخی منداڵی و گەنجێتییەوە، واتە ئەم دوو تەمەنەی شاعیر لە دوو شوێنی جیادا ڕووداوەکانی ڕوویانداوە:

١ـ تەمەنی منـداڵی: شـوێن لـەم قۆناخـەدا گوندەکـەی شـاعیرە، کـە زێـدی بـاب و باپیرانییـەتی و لێـی ژیـاون. ئـەو گونـدە تـەواوی ڕووداوەکـانی تەمـەنی منـداڵی شـاعیری لەخۆگرتووە و شاعیر زۆر هۆگرییەتی و هەمیشە بەرەو ئەو گوندە دەگەڕێتەوە. کەواتە شـوێن لەتەمەنی منداڵی شاعیردا ئەگەر چی لە ژمارەیەکی سنوورداری خانوو و بانـەوە پێکهـاتووە، بەڵام فەزایەکی سروشتی گەورەی لـەخۆگرتووە، کـە شـاعیری پێوەسـتی خـۆی کـردووەو ئـەو

١- عەبدولمونەلیب عەبدوڵڵا، شوێنکاتی یەکەم لە دووەم و ئێستای سەگوەر، چاپخانەی ڕەنج، هەولێر ٢٠٠٤، ل ٧٤.

فەزایەش تەواوی یادەوەرییەکانی شاعیری لەخۆگرتووە، لەمبارەیەوە شاعیر دەڵێت: ((هەموو یادەورەییەکانم لە شوێنێکدا خەوتوون، کە چاو بواری نییە کۆیان بکاتەوە و بیانگرێت، مەگەر لە رێگەی خەونبینینەوە بە ئاگایان بهێنمەوە ئاوی چاوی تیشکهاوێژم بدەم، بیانخەمە ناو چالاکییە هەستی و خەونییەکانم))[1]. ئەو شوێنەی کە یادەوەرییەکانی شاعیری تێدا خەوتووە، گوندەکەیەتی، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت، کە شاعیر باوەڕی بەوە هەیە، کە ئەو گوندەی هەمیشە زیندووە و یادەوەرییەکانی تێیدا خەوتوون، هەر جارێك بیەوێت بەرگی زیندووتییان بە بەردا دەکات ئەوا دەیهێنێتە بەرچاوان و یادی دەکاتەوە. لەم چوارچێوەیەدا شاعیر هەر لە سەرەتاوە ئاماژە بە گوندەکەی دەکات و دەڵێت:

**((پاشان دووکانە پڕ نهێنییە ڕەنگاوڕەنگەکانی گوندی گەنجینەی منداڵیم)) (زێوان، ل ١٨)**

لێرەدا تەنیا ئاماژە بە گوند کراوە وەکو شوێنێك، کە ئیدی ڕووداوەکانی تێدا گوزەر دەکەن و هەستی خوێنەر بۆ ئەو شوێنە ڕاکێشراوە کە گوندە، ئەگینا لەسەرەتادا ناوی گوندەکە دیاری ناکات، ئەمەش بۆ ئەوەیە تا خوێنەر زیاتر بکەوێتە ناو فەزایەکی سیحریی و خەیاڵییەوە و لەوێوە دواتر شاعیر خوێنەرەکەی ڕووبەڕووی ناوی گوندەکەی دەکاتەوە:

**((دار شەقەی ئیفلیجیم لە ڕۆژی شەهیدانی دەرەبەندی گۆم دانا))(زێوان، ل٢٦)**

لێرەدا شاعیر ڕاستەوخۆ ناوی گوندەکەی دەهێنێت، کە ئەویش (دەربەندی گۆم)ـە و لە دەشتی هەولێرە، ئەو گوندە بوونێکی کەتواریانەی هەیە و خوێنەر هەستی پێ دەکات، شاعیر کاتێك ناوی گوندەکەی خۆی بۆ یەکەمجار لەم دەقدا دەهێنێت، لەگەڵ ڕۆژی شەهیدانی تایبەت بەو گوندە پێوەستی دەکات، چونکە ئەم گوندە هەمیشە لە کارەسات و وێرانییدا بووە و ژیانێکی پڕ لە تراژیدیای هەبووە، هەر لە ساڵی (١٩٦٣)ـەوە لەلایەن حەرەس قەومییەکانەوە هێرشی دەکرێتە سەر و وێران دەکرێت و خەڵکەکەی ئاوارە و دەربەدەر دەکرێن، ئیدی ئەو گوندە تا ساڵی (١٩٧٠) ژیانی تێدا نامێنێت، بەڵام لە دوای ڕێککەوتننامەی (١١)ی ئاداری ساڵی (١٩٧٠)ـەوە دووبارە خەڵکەکە دەگەڕێنەوە و گوندەکەیان بونیاد دەنێنەوە و ساڵی (١٩٧٥)دا ژیانی تێدا دەگەڕێ، بەڵام لە دوای ئەو ساڵەدا، دووبارە وێران دەکرێتەوە و خەڵکەکەی ئاوارە دەبنەوە و تا ساڵی (٢٠٠٣)، کە ڕژێمی بەعس بە یەکجاری دەڕووخێت، ئینجا دانیشتووانەکەی دەگەڕێنەوە و ئاوەدانی دەکەنەوە. ئەم بارودۆخ و کارەساتە بەتەواوەتی

---

١- سەباح ڕەنجدەر، دوو کتێب لەبارەی شیعرەوە، ل ١٩.

لەم ڕۆمانە شیعرەدا ڕەنگدەداتەوە و شاعیر وەکو مێژوویەك باسی لێوە دەکات و تۆماری دەکات. واتە شوێن لە تەمەنی منداڵیدا ،کە گوندە لەلایەن شاعیرەوە بەدوو لایەنەوە باسی لێوە کراوە، لەلایەکەوە گۆڕەپانی ڕووداوەکانی سەردەمی منداڵییەتی و تێیدا وەکو یادەوەرییەك تەمەنی منداڵی خۆیمان بۆ دەگێڕێتەوە، لەلایەکی دیکەشەوە مێژووی خودی گوندەکەی لەو کارەسات و تراژیدیای کە بەسەری داهاتووە تۆمارکردووە.

**٢ـ تەمەنی گەنجی:** لەم قۆناخەدا شوێنی ڕووداوەکان شاری هەولێرە، ئەمەش پاش ئەوەی، کە شاعیر و خانەوادەکەی دوای وێرانبوونی گوندەکەیان لە شاری هەولێر نیشتەجێ دەبن. لەم قۆناخەشدا شاعیر تەمەنی منداڵی تێپەڕاندووە و چۆنە قۆناخی تەمەنی گەنجێتی و تاکە ڕووداوی ئەم قۆناخەش کە سەرنجی خوێنەر بۆ لای خۆی ڕادەکێشێت، خۆشەویستی شاعیر و نواڵەیە، شوێنی ڕووداوەکانی ئەو خۆشەویستییەش شاری هەولێرە بە گەڕەك و کۆڵان و قەڵاکەیەوە. ئەم گۆڕانکارییە لە شوێن لەلایەن شاعیرەوە کاریگەرییەکی یەکجار گەورەی هەیە و بە بوومەلەرزەی دادەنێت:

**((بوومەلەرزە یاریگەی منداڵیمی کردە بازگەی گەورەی شار)) ( زێوان، ل ٦١)**

ئەو فەزایەی لە گوندا هەبوو، لەلایەن شاعیرەوە شوێنی یاریکردن و هامشۆ و گەڕان و سووڕان بووە، کە بەیاریگەی دەچوێنێ، لەناکاوێکدا و بێ ئەوەی هیچ زەمینەسازییەك و خۆئامادەکردنێکی بۆ کرابێت لەچاوچووقانێکدا گوند بوونی نامێنێ و ئەو یاریگەیە دەبێتە بازگەی گەورەی شار، کە شاعیر و خانەوادەکەی ئاشنای ئەو جۆرە ژیانە نوێیە پڕ لە جەنجاڵییە نەبوونە و هێشتا گەڕەك و کۆڵان و گۆڕەپانەکانی شار بەلای ئەوانەوە نامۆیە. ئەم جۆرە، ژیانی شارە داب و یاسایەکی دیکەی گەڕەکە، کە تەواو جیاوازە لە داب و یاسای گوندەوە، هەر بۆیە شاعیر ئەم گۆڕانکارییە بە بوومەلەرزە دادەنێت. ئەمەش سەلمێنەری ئەوەیە، کە شوێن کاریگەرییەکی تەواوی لەسەر گێڕەرەوە کە خودی شاعیرە هەبووە لە چینینەوەی ڕووداوەکاندا، چونکە ڕووداوەکان بەپێی شوێنەوە ئاڵوگۆڕ دەبن و لە قەفێکەوە بۆ قەفێکی دیکەوە هەنگاو دەهاوێن.

ئەوەی جێگەی تێبینییە ئەوەیە کە شاعیر زیاتر هۆگرو ئاشنای گوندەکەیەتی وەکو شوێنێك لەم ڕۆمانە شیعرەدا و هەمیشە بەشێوەیەکی فانتازی و لەبەرگێکی سیحری و خەیاڵاویدا وێنەی دەکێشێ، ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە هەمیشە مرۆڤ سەردەمی منداڵی

بەهەموو لایەنەکانییەوە لەلای بە سەردەمێکی زێـرین و پـڕ لـە خۆشـی و شـادی دادەنێـت، بەتایبەتیش لایەنی شوێنییەوە، کە هەمیشە مرۆڤەکان لەتەمەنێکی درەنگـدا سـەردانی ئـەو شوێنانە دەکەنەوە کە تەمەنی منداڵییان تێدا بەسەر بردووە و بـەلای ئەوانـەوە ئـەو شـوێنانە پیرۆزییەکی لەرادەبەدەریان هەیە. هەر بۆیەش شاعیر دەستەواژەی (گوندی گەنجینەی منداڵیم) بۆ گێڕانەوەی ڕووداوەکانی ئەو شوێنە دادەنێت و ئەوەندە بوونی گونـد لـەناو دەقەکـەدا خـۆی سەپاندووە، ئەوەندە شار دیار و زەق نەکراوەتەوە، تەنانەت شاعیر هەمیشە حەز بـەوە دەکـات بچـێتەوە گوندەکـەیان، چـونکە بـەلای ئـەوەوە ئـەو گونـدە ئیلـهام و بـەهرەی نووسـەری و شاعیربوونی پێبەخشیوە:

**((دەچمەوە گوندی گەنجینەی منداڵیم**

**خۆڵی ڕووی بەردەکانی**

**هەموو دەستنووسەکانیم دەداتێ**

**دەمکات بە نووسەری بێهاوتا و بێباك)) ( زێوان، ل ٤٧)**

لەگەڵ ئەوەشدا شوێنێکی دیکە لەم ڕۆمانە شیعرەدا هەیە کە بایەخێکی لـە ڕادەبـەدەری هەیە و شوێنێکە شاعیر تێیدا هەستی بە حەسانەوەیەك کردووە و لەوێ دەروونرۆشـن بۆتـەوە. ئەم شوێنە گرینگییەکەی لەوەدایە کەلەلایەکەوە هۆکارێك بووە لە هۆکارەکـانی لـەدایکبوونی ئەم دەقەی ڕۆمانە شیعرەکە و لەلایەکی دیکەشـەوە شـوێنی ڕاسـتەقینەی نووسـینەوەی ئـەو ڕۆمانە شیعرەیە. ئەویش ئەو ژوورەیە کە لەسالآنی هەشتاکاندا شاعیر کە وەکو هەڵاتوویـەکی سەربازی خۆی تێدا حەشارداوە. تارماییەکانی ئەم ژوورە بەسـەر کـەش و هـەوای دەقەکـەوە دیارە و گێڕەرەوە بە ئاشکرا لەناو دەقدا ناوی هێناوە و باسی لێوە کردووە:

**((لە ژووری زێوانی خۆم گۆڕەپانێکی گشتیم چۆڵ و قەرەباڵغ)) (زێوان، ل ٢١)**

**((ژوورەکەشم ئەژدیهایە کلۆری ددانی ئای کلۆری ددان)) ( زێوان، ل ٦٢)**

**((ژووری زیندانیش بۆنی دووکەڵی کزری مێشك گران دەکات)) (زێوان، ل ٦٣)**

**((وام لە ژووریێ گەنجیم کەڕووی هەڵێناوە**

**نینۆکەکانم چووینە**

**بۆمم ناکرێ ئەم دیوارە بوەرێنم)) (زێوان، ل ٨٨)**

**((بەدار و پەروودی ناکۆکی ژوورمدا دەڕوانم)) ( زێوان، ل ٩٦)**

ئەم ژووره بارێکی دەروونی بۆ شاعیر ڕەخساندبوو، کە بتوانێت لەوێوە ژیاننامەی خۆی لە دەقێکی ڕۆمانە شیعردا بئالێنێت و پێشکەشی بکات، هەر بۆیەش لە دەقەکەدا ناوی هاتووە و پێگەی دیارە، شاعیر خۆشی لەمبارەیەوە لە پێشەکییەکەی چاپی دووەمی (زێوان) دا باسی دەکات و دەڵێت: ((ڕێك ئەو چوار ساڵەی بەو شیعرەوە خەریك بووم، هەڵاتووی سەربازی بووم. ژیانم لەناو خانوویەکی ڕووە و هەتاوی دوو ژووری، کە بنمیچەکەی دارەڕێ و قامیشبەند بوو، بەسەر دەبرد. ئەو دارەڕێیە و قامیشبەندەم هەمیشە وەك دارستانێکی سەوزی پڕ بەروبووم و پشت و پەنا خەیاڵ دەکرد و بیرم لە قۆناخی سەوزی دار و قامیشەکان دەکردەوە. حەوشەیەك کە باخچەیەکی دڵگیریم تێیدا دامەزراند بوو، لاولاوە بەسەر دیواری حەوشەدا بەرزببووەوە، نێوانی دیوار و لاولاوەکە دالانێکی دروست کردبوو، بەدڵفرەوانییەوە جێگەمی تێدا دەبووەوە، شوێنێکی هێمن و لەبار و بەهرە بەخش بوو بۆ نووسین و خوێندنەوە)) [1].

هەروەها شاعیر لە هێنانەوە و باسکردنی شاعیرانی وەکو (نالی و مەولەوی و حاجی قادری کۆییدا) نەك هەر کاریگەریی ئەزموونی شیعری ئەوان بەدیاردەخات، بگرە لە ڕووی شوێنەوەش بە وریاییەوە ناوی ئەو گوندانەی هێناوە، کە زێدی ئەو شاعیرانە بوونە، ئەوانیش لە ناو دەقەکانیدا بە شانازییەوە باسیان لە گوندەکانیان کردووە:

**((نالی ئێسکەکانی خۆی بە خاك و خۆڵ بەخشی**
**تا ببێتەوە خۆڵ**
**بەسەر برینی منداڵییدا بکرێ**
**ژانی بشکێت**
**حاجی قادری کۆیی ئێسکەکانی خۆی بە گۆڕ قەرەج بەخشی**
**تا ببێتەوە خۆڵ**
**بەسەر برینی منداڵییدا بکرێ**
**ژانی بشکێت**
**مەولەوی ئێسکەکانی خۆی بەسەرشاتە بەخشی**
**تا ببێتەوە خۆڵ**
**بەسەر برینی منداڵییدا بکرێ**

---

١- سەباح ڕەنجدەر، زێوان، ل ٧.

**ژانی بشکێت**
**منیش ئێسکەکانی خۆم بەدەربەندی گۆم بەخشی**
**تا ببێتەوە خۆڵ**
**بەسەر برینی منداڵیمیدا بکەم))  ( زێوان، ل ٧٣-٧٤)**
**((نالی دەموچاوی لەکاتی بیرکردنەوە لە شارەزوور تێیدا دەگەشێتەوە)) (زێوان، ل ٢٢)**

گوندەکانی وەکو ( گۆڕ قەرەج و سەرشاتە و ناچەی شارەزوو) چۆن بەلای ئەو شاعیرانەوە مایەی بایەخ پێدان و شانازیکردن بوونە، بەهەمان شێوە شاعیریش لەرێگەی باسکردنی گوندەکەی خۆی ( دەربەندی گۆم) دەیەوێت وەکو لێکچوواندنێك لەگەڵ گوندەکانی وان شاعیران، شانازی بە گوندەکەی خۆیەوە بکات و بیانهێنێتە ڕێزی ئەو گوندانەی کە ئەو کەڵە شاعیرانەیان بەرهەم هێناوە.

سەرەڕای ئەمانەش چەندین شوێنی دیکە لەناو ئەم دەقەدا ناوی هاتووە و هەندێکیان بە مەبەستەوە وەکو ئاماژەیەك، ئاماژەیان بۆ کراوە وەکو (گڵکەند، مەچکۆ، وڵات، گۆڕەستان، قوتابخانە، یاریگە، مزگەوت و...هتد).

## کات:

کات لەم ڕۆمانە شیعرەدا لە خاڵی ئێستەوە هەنگاو بەرەو ڕابردوو دەهاوێژێت و خوێنەران لەگەڵ خۆی لە کاتێکی ئێستەییەوە بەرەو کاتێکی ڕابردووی کۆن دەگەڕێنێتەوە. ئەو ڕابردووە چەقی گەورەی ڕووداوەکانەوە و مایەی حەسانەوە ودەروونڕۆشنی شاعیرە و لەهەمان کاتیشدا مایەی سەرنجڕاکێشان و دۆزینەوەی نهێنییەکانی ژیانی شاعیرە لەلایەن خوێنەرانەوە. بۆیە لەم ڕۆمانە شیعرەدا کاتی ڕابردوو قورساییەکی گەورەی هەیە و هەمیشە ڕووداو و کارەکتەر و شوێن لەدەوری ئەو کاتە دەخولێنەوە و پێوەستن پێی و بەبێ ئەو کاتە ڕابردووە و حیکایەتەکانی ئەم ڕۆمانە شیعرە واتایەکیان نامێنێت. ئەم خەسڵەتەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، کە شاعیر بیۆگرافیای خۆی نووسیوەتەوە، بیۆگرافیاش واتای ئەوە دەگەیەنێت شاعیر بەرەو دواوە بگەڕێتەوە و پارچەیەك لەمێژووی ژیانی خۆی بۆ خوێنەران بخاتەڕوو و ئاشکرایان بکات. بەو واتایەی تا ڕووداوەکانی ژیانی شاعیر ڕوویان نەدابێت و بەتەواوەتی کۆتایی نەهاتبن و کاریگەری و کاردانەوەی لەسەر ڕەوتی خودی ژیانی شاعیر دروست نەکردبێت، ئەوا شاعیر

ناتوانێت بگەڕێتەوە سەری و باسیان بکات. بۆیە ئەو ڕووداوانەی کە شاعیر باسیان دەکات، ڕووداوێکن ئیدی لەرووی مێژووییەوە تەواوبوونەو کاتێکی بەسەردا تێپەڕبوونە. ئەم سروشتەی ژینامەش، کاریگەریی لەسەر کاتی ئەم ڕۆمانە شیعرە داناوە و بازنەی کاتی ڕابردووی فراوانتر کردووەتەوە لەچاو کاتەکانی دیکەدا و لەئێستەدا شاعیر تەنیا بەجەستە لەژوورەکەی خۆی ماوەتەوەو بە بیروهۆش بەرەو کاتێکی دیکە گەڕاوەتەوە دواوە کە کاتی ڕابردووە و لەوێ درێژە بەژیانی هزری و مەعریفی خۆی دەدات و دەیەوێت خوێنەرانیش بەشداری ئەم جۆرە ژیانەی بکات. لەهەمان کاتیشدا کاتی داهاتوو، کاتێکی هەست پێکراوە و قورساییەکی دیاریکراوی خۆی هەیە لەم دەقەدا و هەمیشە شاعیر خوێنەرانی خۆی ئامادە دەکات بۆ ئەو ئایندەی کە هێشتا ڕەنگ ورووی وەنەگرتووە و دیار نییە. ئایندە لەم دەقەدا بەقەدەر ڕابردوو کاریگەریی لەسەر ڕەوتی ڕووداوەکاندا هەیە و شاعیر ویستویەتی جیاوازییەك لەنێوان هەر دوو کاتی ڕابردوو و داهاتوودا بکات، بەوەی کە کاتی ڕابردوو کاتێکی پڕ لە جۆش و خرۆش و جوانییە و کاتی ئایندە کاتێکە هێشتا فۆرمەکەی دیارینەکراوە. واتە کاتی ڕابردوو هەموو لایەنەکانی تێدا ڕوون و ئاشکران و ڕووداوەکانی قەف لەدوای قەف پێشکەش بە خوێنەران دەکرێن و شاعیر هەمیشە شەیدای ژیانی ئەم کاتەیەو بەپێچەوانەوە کاتی داهاتوو کاتێکی نادیار و تەم و مژە. بەشێوەکی گشتیی کات وەکو هێلێك لەم دەقەدا بەمشێوەیە خۆی دەنوێنێت:



وەكو لە وێنەكەدا دیارە، شاعیر لەیەككاتدا، لە كاتی ئێستەوە هەنگاوی بەرەو كاتی ڕابردوو و كاتی داهاتووە ناوە، واتە لە كاتی ئێستەوە ویستویەتی كاتی ڕابردوو زیندوو بكاتەوە و گیانی بە بەردا بكات و ئامادەی بكات بۆ كاتی داهاتوو، كە كاتێكی پڕ لە ترس و گومانەو هەمیشە مرۆڤەكان لێی دوودڵن و چارەنووسیان تێیدا بزرە. ئەو كاتی ئێستەیەی كە لەوێوە شاعیر هەنگاوی بەرە گێڕانەوەی ڕووداوەكانی ناوە، برێتییە لە یەك گرێدانی كاتەكانی ڕابردوو بە داهاتووە و زمینەی ئەو لەیەك گرێدانەش كاتی ئێستەیە، كە كاتێكی فیزیكی هەست پێكراوە و چەقی ڕووداوەكانی لەئەستۆ دایە. لێرەدا دەكرێت پارچەكانی دەق بەپێی بەشەكانی كات دیاری بكەین و زیاتر ڕوونیان بكەینەوە:

١ـ كاتی نووسینی دەق: ئەو كاتەیە كە شاعیر تێیدا دەستی بەنووسینی دەقەكەی كردووە، ئەوكاتەش زیاتر كاتێكی ئێستەییە. كاتی نووسینی دەقی ئەم ڕۆمانە شیعرە لەكۆتایی دەقدا دیاری كراوە و لەنێوان سالآنی (١٩٨٤-١٩٨٧)ە، واتە تەنیا كاتێكی دیاریكراو نییە، بگرە كاتی دەستپێكردنی نووسینەوەو كاتی كۆتاییهاتنی دەقەكەی تێدا خراوەتەڕوو. چوار ساڵ، كاتی نووسین و بەرهەمهێنانی ئەم دەقە شیعرییە، هەروەكو شاعیریش لە پێشەكییەكەی چاپی دووەمی زێواندا ئاماژەی بۆ دەكات و دەڵێت: ((لە تەمەنی نۆزدە ساڵیدا یەكەم هەناسەی ئەم دەقە بەسییەكانمدا گەڕا و ڕژایە ئاسۆی هەستەكانمەوە. پێویست بوو هەڵیبگرمەوە لەبیست و دوو ساڵیدا بەرهەم هات و تەواو گەلآڵە بوو)) [1]. ئەو كاتەی نووسین كاریگەرییەكی دەروونی و هزری لەسەر شاعیر دادەنێت و بەپێی ئەو بارودۆخەی كە تێیدا شاعیر گوزەر دەكات، دەقەكە بەرهەم دێت و ڕەنگدانەوەی ئەو بارودۆخەی لەسەر دەبێت. بەم پێیەش ئەم دەقە، لەبارودۆخێكدا بەرهەم هاتووە، كە شاعیر تێیدا لە سووچی ژوورێكدا خۆی حەشارداوە، چونكە هەڵاتووی سەربازی بووە (( ڕێك ئەو چوار ساڵەی بەو شیعرەوە خەریك بووم هەڵاتووی سەربازی بووم)) [2]، ئەمەش كاریگەری و كاردانەوەی دەروونی و هزری لەسەر شاعیر داناوە و بەئاشكرا لە نێو دێڕە شیعرەكانی دەقەكەدا ئاماژەی بۆ كراوە و تەمۆسفیری دەقەكەش هەمان ئەو كەش و هەوایەی هەیە كە خودی شاعیر تێیدا ژیاوە و پڕە لەترس و گومان و چارەنووسێكی نادیار.

---

١- سەباح ڕەنجدەر، زێوان، ل ٦.

٢- هەمان سەرچاوە، ل ٧.

لەم ڕوانگەیەوە کاتی ئێستەی دەق کە کاتی نووسینی دەقەکەیە، لەرێگەی ئاماژەدان بەو ژوورەی کە شاعیر تێیدا ژیاوە ئاماژەی بۆ کراوەو لەناو دەقەکەدا بەرجەستە بووە:

**((لە ژووری زێوانی خۆم گۆڕەپانێکی گشتیم چۆڵ و قەرەباڵغ)) (زێوان، ل ٢١)**

**((ژوورەکەشم ئەژدیهایە کلۆری ددانی ئای کلۆری ددان)) (زێوان، ل ٦٢)**

**(( ژووری زیندانیش بۆنی دووکەڵی کزری مێشك گران دەکات))(زێوان، ل ٦٣)**

**((وام لە ژووری گەنجیم کە ڕووی هەڵێناوە**

**نینۆکەکانم چووینە**

**بۆمم ناکرێ ئەم دیوارە بوەرێنم)) ( زێوان، ل ٨٨)**

لەم دەقانەدا ژووری خۆ حەشاردانی شاعیر ئەگەرچی وەکو شوێنێك کاریگەریی هەیە لەسەر دەروونی نووسەرەکەیەوە، لەهەمان کاتیشدا دەربڕی کاتی نووسینی دەقەکەشە. هەر لەو کاتەش ئیدی ئاراستەکانی کاتی داهاتووش بەدیار دەکەوێت، کە کاتێکی لێڵ و تەمومژ و گوواتاوییە و لە ڕێگەی ئەو هەستەی کە شاعیر لەبارەی مەرگ و مردنەوە دەریدەبڕێت، باسی لێوەکراوە و شاعیر بە گومان و ترسەوە ڕوانیوەتە ئەو کاتە و هەمیشە وەکو تارماییەك بەسەرییەوە بووە:

**((گۆڕەستان ماڵێکە ئازیزەکانی**

**بانگدەکاتە ناو خۆی بە مەدالیا ناسراویان دەکات)) ( زێوان، ل ٣٤)**

**((گۆڕ داکەوتن**

**کێل نووشتانەوە)) ( زێوان، ل ٥٩)**

**((بەم زووانە قاوەی تازیەم لەدەستی مێوانان دەگێڕدرێ)) ( زێوان، ل ٥٩)**

**((تاتەشۆری مزگەفتی گوندی گەنجینەی منداڵیم تەڕە)) ( زێوان، ل ٦٣)**

لێرەدا کاتی ڕابردوو کاتێکە قەوارە و پێگەیەکی دیاری لەناو دەقەکەدا داگیرکردووە وشاعیر لەرێگای چەند بارەکردنەوەی بەکارهێنانی ئاماژەکانی مەرگ و مردن و کەرەستەکانی ئەوانەوە ئەو کاتەی باسکردووە و هێناویەتە بەر زەینی خوێنەر و وێنەی کاتێکی بەرجەستە نەبووی لە هۆشی خوێنەردا کێشاوە، کە هەمیشە بوونێکی دیاری لە ڕەوتی ژیاندا هەیە و ناتوانرێت چاوپۆشی لێبکرێت.

٢ـ كاتی چاپكردنی دەق: ئەم دەقە بۆ یەكەمجار لە ساڵی (١٩٨٨) چاپ و بڵاوكرایەوە، سەبارەت بە چاپكردنی پەڕتووكەكەش، شاعیر دەڵێت: ((حوزەیرانی ١٩٨٨ وەك پەڕتووكێك لە ٨٨ لاپەڕەدا چاپم كرد و هەموو دڵخۆشییەكانم هاتنەدی)) [1].هەروەها لە ساڵی (٢٠٠٩)دا چاپی دووەمی بە پێشەكییەكی شاعیر خۆیەوە بەبۆنەی تێپەڕبوونی بیست ساڵ بەسەر بڵاوكردنەوەی دەقەكە بەناونیشانی (لە ئاهەنگی بیست ساڵەی زێواندا)، چاپ و بڵاوكرایەوە.

٣ـ كاتی ناوەوەی دەق: كاتێكی بەرجەستەكراوە و هەستپێكراوەو بریتییە لە كاتی ڕووداوەكە خۆی، واتە كاتێكە لە سەرەتای ڕووداو دەست پێدەكات و لەكۆتایی ڕووداویش تەواو دەبێت. ئەو كاتە لەم دەقەدا بەسەر دوو لایەنی دیاریكراو لەلایەن خودی شاعیرەوە دابەشكراوە، ئەوانیش بەپێی تەمەنی شاعیر دەستنیشانكراون كە بریتین لە تەمەنی منداڵی كە ڕووداوەكانی تایبەت بەو تەمەنە دیاریكراوە دەستنیشان دەكرێن و باسی لێوەدەكرێن. ئەویش لە سەرەتای لەدایكبوونەوە دەست پێدەكات كە سەرەتای دەستپێكردنی دەقەكەشە:

**((منداڵیی هێشتان ناونەنراوم لەسەر ڕانی**

**ئەو ڕێیانەی دەبنە حەكایەت**

**خۆی دەگێڕێتەوە)) ( زێوان، ل١٧)**

كاتی ڕووداوەكانی ئەمە تەمەنەش بەوە كۆتایی دێت كە گوندەكەیان وێران دەكرێت و شاعیر و خانەوادەكەی ئاوارە دەبن و بەرەو شاری هەولێر دێن:

**(( بوومەلەرزە یاریگەی منداڵیمی كردە بازگەی گەورەی شار)) ( زێوان، ل ٦١)**

ئیدی لەشار تەمەنێكی دیكە و ڕووداێكی دیكە لەژیانی شاعیر دەست پێدەكات، كە ئەمەشیان لایەنەكەی دیكەی دەسنیشانكردنی كاتی ناوەوەی دەقە، كەئەویش كاتی گەنجێتی شاعیرە و تێدا ڕووداوی خۆشەویستییەكەی هەموو سووچێكی ئەو كاتەی داگیركردووە و كە بەیەكتر ناسینی لەگەڵ نواڵە دەستپێدەكات، لەمبارەیەوە شاعیر بەوردی سەرەتای كاتی دەستپێكردنی ئەو ڕووداوە تۆمار دەكات و دەڵێت:

**((نواڵە بۆ هەمیشەیی دەمكاتە دۆستی بێهوودەیی**

**سبەینەی ٣١ی ٣ی ١٩٨٣ لەدەرختی شانازیم خوارد)) ( زێوان، ل ٤٥)**

---

١- هەمان سەرچاوە، ل ١٥.

ئەو چیرۆکەش بە شکستهێنانی ئەو پرۆسەیەو دەست لێـك بـەردان کۆتـایی دێـت کـە پێدەچێت هەر لە تەمەنی گەنجێتی دەبێت:

**((نوالّە لەگەڵ ئاسۆ سوور هەڵگەڕا**

**قاچەکانی تا ئەژنۆ شوشت**

**ئاوێنەم دایە بنی ڕووبار دەموچاوی مردنم بینی)) ( زێوان، ل ٩٧)**

٤ـ کـاتی دەرەوەی دەق: ئـەو کاتانـەن کـە ڕووداوگـەلێك دەگێڕنـەوە ئاراسـتەکەیان لـە ڕابردووەوە بەرەو داهـاتوودا دەبێـت و دەکەونـە دەرەوەی سـنووری کـاتی نـاوەوەی دەق. بـەو واتایەی کە لەکاتی ناوەوەی دەق هەنگاو بەرەو کاتی دەرەوە دەهاوێـژن و ((لـەنێو ئـەو کاتـە دیاریکراوەشدا چەندین کاتی دیکە دەستنیشان دەکرێن و سنووری کاتەکـە فـرەوانتر و مـەودا درێژ دەکەن)) [1] لەوێوە ئەو ڕووداوانەمان بۆ دەگێڕێنەوە. لەم چوارچێوەیەشدا شاعیر ئاماژەی بە ڕووداوگەلێك داوە کە سنووری ڕووداوەکەیان دەکەوێتە دەرەوەی سنووری کاتی ناوەوەی دەق و بۆ کاتێکی مەودا دوور و ڕابردوو دەگەڕێنەوە:

**((بەختیاری خدری زیندەیە**

**چاوەکانی بنوقێنێت**

**خودا خۆی پیشاندەدات)) ( زێوان، ل ٢٣)**

**((پیرێژنێك گرەوی لەگەڵ چیایە**

**دەمی کولێنگ بپەڕێنێ**

**فەرهاد پەیمان شکێن بکا)) ( زێوان، ل ٧٨)**

لێرەدا ئاماژەدانە بە ئەفسانە و داستانی ( خـدری زینـدە و شـیرین و فـەرهاد). ئـەوەی جێگەی تێبینیشە ئەوەیە، کە شـاعیر ڕاسـتەوخۆ تـەواوی ڕووداوەکـەی نەگێڕاوەتـەوە، بگـرە لەهێمایەکی کورتدا ئاماژەی بۆ کردووە، بەو پێیەی کە خوێنەری شارەزا تەواوی ئەو ڕووداوانە دەزانێت.

---

١-عەبدوڵڵا ڕەحمان، تەکنیك لە ڕۆمانی دوانامەی دێوەرەیەك (٢-٢)، گۆڤاری (رامان)، ژمارە(١٤٧)،، خولی سێیەم، ساڵی چواردە، ئابی ٢٠٠٩، ل٧٤.

لەگەڵ ئەوەش لەناو ئەم دەقەدا ڕاستەوخۆ ئاماژە بە گەلێك یەكەی كات دراوە تێیدا بەهۆیانەوە ڕەوتی ڕووداوی پێ دیاریكراوە. ئەو یەكەی كاتانەش بەدەوری خۆیان بەشێك لەو وێنانەیان تەواو كردووە، كە شاعیر ویستوویەتی لەبەردەمی خوێنەراندا بیان نەخشێنێت. لەوانە ئاماژەدان بە یەكەی ڕۆژ و شەو لەبەرێوەچوونی ڕووداوەكاندا، بۆ نموونە:

**((وەك یەكەم ڕۆژی چوونە قوتابخانە)) ( زێوان، ل ١٩)**

**((دوێنێ مەرگ بەرەو لام هات)) ( زێوان، ل ٢٤)**

**((بە ئاسمانی بەیانیانم دەكشێیتەوە)) ( زێوان، ل ٣٠)**

**((ئەو كێوەی شەوان زەردەپەڕی لەپشت دەنوێ)) ( زێوان، ل ٤٧)**

یاخود ئاماژەكردن بۆ وەرزەكانی ساڵ. وەرزەكانی ساڵ وەكو یەكەیەكی كاتی وان و ڕۆڵیان لە بەرەو پێشبردنی ڕەوتی ڕووداودا هەیە، وەكو:

**((زستان**
**فەروە لەسەر تەناف بهێنێتەوە**
**بەهار**
**گوڵەگەنم شیر بەنامۆ بزانێ**
**هاوین**
**بەرزایی سروە دابەش نەكات**
**پایز**
**گەڵای كەوتوو تیخی دوودەم تیژ بكاتەوە)) ( زێوان، ل ٨٣)**

### دایەلۆگ:

دایەلۆگ بەیەكێك لەو تەكنیكە گرینگانە دادەنرێت كە شاعیر بۆ گەیاندنی بیرۆكە وزانیارییەكانی تایبەت بە دەقەكە پەنای بۆ دەبات و بە هۆی ئەوشەوە بەشێك لەو مەعریفەیەی ناو دەقەكە بەرێگەیەك لەو ڕێگەنەی گێڕانەوە بۆ خوێنەر دەگوزارێتەوە. بۆیە دایەلۆگ پێوەندیی بە توخمەكانی گێڕانەوە بەهێزە و چەندین ئەرك و فرمان لە ناو دەقدا جێبەجێ دەكات. لەوانە گەشەسەندن و پێشخستنی ڕووداوەكانە، كە ڕەنگە تەنیا بەهۆی گێڕانەوەی لەلایەن گێڕەرەوە خوێنەر دووچاری جۆرێك لە بێزاری و تەمبەڵی ببێت وبەهۆی

ئەمەشەوە ڕەنگە ئەو خوێنەرانەی کە بە خوێنەری ئاسایی وەسف دەکرێن واز لە خوێندنەوەی دەقەکە بهێنن. بۆیە دایەلۆگ وەکو تەکنیکێك جۆرێك لە زیندوویی و چالاکی بە ڕووداوەکان دەبەخشێت بە شێوازێك پێشکەشی خوێنەری دەکات، کە سەرنجڕاکێش بێت و لێی بێزار نەبێت. لەهەمان کاتیشدا دایەلۆگ پێوەندیی بەکارەکتەریشەوە هەیە و بەهۆی دایەلۆگەوە کارەکتەر بیرو بۆچوونی خۆی بە خوێنەران دەگەیەنێت. بەواتای دایەلۆگ وەکو ئامێرێك وایە بەدەستی شاعیرەوە، چونکە ((دەتوانێت لە ڕێی دایەلۆگی کارەکتەرەکانیەوە گوزراشت لە ئایدیۆلۆجیا و بیروباوەڕی خۆی بکات)) [1] و بیروڕای خۆی لەمەڕ ڕووداوە سیاسی و کۆمەڵایەتیی و سیاسییەکان بخاتەڕوو. هەروەها بەهۆی دایەلۆگەوە توخمەکانی کات و شوێن پێشکەش دەکرێن و دەناسرێن. ئەمە جگە لەوەی جۆرێك لە ڕازاندنەوە وجوانیکارییەك بە خودی دەقەکە و تۆپۆگرافیای دەقەکەش دەبەخشێت. بۆیە دایەلۆگ کاریگەرییەکی بەرچاوی هەیە لە ناو دەقەدا و یەکێکە لەو تەکنیکانەی کە شاعیران پەنای بۆ دەبەن و لەناو دەقدا دایدەمەزرێنن و ڕێچکەی بۆ دیاری دەکەن. یەکێك لەخەسڵەتە هەرە سەرەکییەکانی دایەلۆگ ئەوەیە کە دەبێت لەنێوان دوو کەس یان زیاتر دروست ببێت. بەواتایەی ئەگەر تەنیا کەسێك کەوتە گفتوگۆ لەگەڵ خۆیدا، ئەوا لەقالبی دایەلۆگ دەردەچێت و بەدایەلۆگ لەقەڵەم نادرێت. بۆیە پێویستە لە دایەلۆگدا کەسێك لەبەرامبەردا هەبێت و ڕووی قسەکردنی ئاراستە بکرێت و ئەویش وەڵامی پێویست بداتەوە.

لەم ڕوانگەیەوە و لەدەقی ڕۆمانە شیعری (زێوان)دا، شاعیر زۆر بەکەمی پەنای بۆ بەکارهێنانی ئەم تەکینکە بردووە. ئەمەش لەبەری ئەوەی کە خۆی پاڵەوانی ڕووداوەکەیەو سروشتی دەقەکەش گێڕانەوەی ژیاننامەی خۆیەتی، بەتایبەتیش لەو ڕووداوانەی کە تایبەتن بە قۆناخی منداڵییەوە و زیاتر بەرگێکی گێڕانەوەی وەسف و مەنەلۆگیان لە خۆدا گرتووە و بەلای دایەلۆگدا نەچوونە. ئەو دایەلۆگە کەمەش کە ئێمە لە دەقەکەدا ڕووبەڕووی دەبینەوە زیاتر دەکەوێتە قۆناخی گەنجی شاعیرەوە و تێیدا جۆرێك لە گفتوگۆی نێوان خۆی و نواڵەی خۆشەویستی بەدی دەکرێت:

---

١- د. نەجم خالید نەجمەدین، تەکنیکی دایەلۆگ لەهەندێ نموونەی هاوچەرخی کورتە چیرۆکی کوردیدا، گۆڤاری(زانکۆ)، ژمارە(٢٤)، نیسانی ٢٠٠٥، ل٢٨٨.

**((ئەی خانمی سەوزایی و پەروەردەکەری گوڵی سەوسەن و حاجیلە**
**کەخووس پێڵووت سڕ دەکات**
**هاوارت بەرەو کێیە**
**کێ بەڵێی لە هاوارت دایە)) ( زێوان، ل ٣١)**
**(( نائاسایی گەورەی من لەوەیە**
**گرفتی گۆڕ دەسنیشانکردن لە قیلمقاسێ دامگرێت**
**ئەی نائاسایی تۆ لەچییە))  ( زێوان، ل ٣١)**
**(( کوانێ**
**لەکوێیت**
**چۆن کۆتاییم دەگەیەنیتێ)) ( زێوان، ل ٨٣-٨٤)**

ئەم دایەلۆگانەی سەرەوە، دایەلۆگێکی ناڕاستەوخۆن، کە ئەو دایەلۆگەیە کە شاعیر ڕاستەوخۆ ڕووداوەکان لەزاری کارەکتەر وەردەگرێت و دایاندەڕێژێتەوە. لێرەشدا دەنگی شاعیر، دەنگێکی زاڵە بەسەر کارەکتەرەکانەوە و هەمیشە ئەو سەرەتا و دەستپێکی قسەکردنی لەلایەو خۆشی ئاراستەی کەسی بەرامبەری دەکات. شاعیر لەم جۆرە دایەلۆگەدا ڕووداو لە کاتێکی ڕابردوودا دەهێنێت و لە کاتی ئێستەی دەق دایاندەڕێژێتەوە، بۆیە ((ناوەرۆکی دایەلۆگ پێوەندیی بە ڕابردووەوە دەبێت و هەمیشە لەو زەمەنەوە وەردەگیرێ و لەکاتی ئێستەی گێڕانەوەدا، چیرۆکگێڕ دەیانخاتە ناو دەقەگێڕاوەکەوە. بەمەش هەستی ئێستەیی وەردەگرن و خوێنەر وا دەزانێ کە ئێستە قسەکان دەکرێن و کارەکتەرەکان لە زەمەنی ئێستەدا ئاخاوتن دەکەن)) [1].لەم چوارچێوەیەدا دایەلۆگ لە دەقی ئەم ڕۆمانە شیعرەدا زیاتر ئاراستەی کارێکتەرێك کراوە کە بەتەواوی هەست بە ڕەنگ وڕووی دەکەین، ئەمەش بەهۆی ئەوەی کە شاعیر بەتەواوەتی بۆمانی وەسف کردووە و بە ئێمەی ناساندووە، بەڵام هیچ جۆرە دەنگێکی ئەو نابیستین و لەناو دەقدا تەنیا دەنگی شاعیر زاڵە و زیاتر کەسایەتیی بەرامبەر لەڕێگەی ئەو وێنەیەی کە شاعیر لەهزر و هۆشی خوێنەری کێشاوە بەدیار دەکەوێت، لەمبارەیەوە ( شجاع مسلم العانی) دەڵێت:((دایەلۆگ تەنیا وێنەی کۆمەڵایەتیی و مێژوویی زمان یا قسەکەرمان نیشان نادات، بگرە بۆی هەیە وێنەی ڕوحی قسەکەریشمان نیشان بدات))

---

١- هەمان سەرچاوە، ل ٣٠٨.

[1]، ئەم وێنە ڕۆحییە لەم دایەلۆگاندا زیاتر بەرجەستە دەبن، کە هیچ دەنگ و قسەیەکی کارەکتەری بەرامبەری تێدا نییە و تەنیا لەلایەنی ڕوحییەوە بوونێکی کەتواری وفیزیکی لەناو دەقدا هەیە.

سەرەڕای ئەمانەش ئەم دایەلۆگانە زیاتر لەشێوەی پرسیارێکدان کە شاعیر وەکو گێڕەرەوەیەك ئاراستەی کارەکتەری بەرامبەری کردوون، بەڵام لەناو خودی دایەلۆگەکاندا هەست بە وەڵامێکی ڕاستەوخۆیی ناکرێت، بگرە ئەو وەڵامە لەکۆی گشتیی دەقەکەدا بەدەست خوێنەر دەکەوێت. جیا لەوەی کە هیچ نیشانەیەکی پرسیارکردنیش بۆ ئەو پرسیارانەی کە شاعیر ئاراستەی کارەکتەری بەرامبەری کردووە دانەندراوە، نەك لەم دایەلۆگانەدا، بگرە لەتەواوی دەقەکەدا خاڵبەندی پێڕەوی لێ نەکراوە، کەدیارە ئەمەش بۆ ئەو بیروڕایەی شاعیر دەگەڕێتەوە لەبارەی پێڕەونەکردنی خاڵبەندی لە شیعری کلاسیکی و شیعری میللی کوردیدا، لەمبارەیەوە دەڵێت: (( لەشیعری میللی کوردی و شیعری کلاسیکی خاڵبەندی پێڕەو نەکراوە، پێڕەونەکردنی خاڵبەندی لای من نەزانین نییە، بگرە وەك مەبەست و هونەر گەڕانەوەیە بۆ هەستی سەرەتایی کوردی و ڕەسەنایەتی کەلەپوور)) [2].

لەگەڵ ئەوەشدا شاعیر لەهەندێك لەم دایەلۆگانەدا، کارەکتەری دووەمی تەواو بەشداری پێکردووە، بەشێوەیەك کە بەئاسانی ئاستی قسەکردنی کارەکتەری بەرامبەر لە ئاستی قسەکردنی گێڕەرەوە دیاری دەکەین و جودای دەکەینەوە:

**((ماڵێ**
**هی ئێمە نییە**
**ئەرێ ماڵێ**
**دەموچاوی پڕ ترسی دایك**
**نایناسین نا)) ( زێوان، ل ٣٨)**

---

١- سەنگەر قادر شێخ محەمەد حاجی، بنیاتی گێڕانەوە لەداستانی (مەم وزین)ی ئەحمەدی خانی و ڕۆمانی ( شاری مۆسیقارە سپییەکان)ی بەختیار عەلی دا، دەزگای توێژینەوەو بڵاوکردنەوەی موکریانی، هەولێر ٢٠٠٩، ل ٢١٩-٢٢٠.

٢- سەباح ڕەنجدەر، دوو کتێب لەبارەی شیعرەوە، ل ٢٩.

لەم دایەلۆگدا دەستەواژەکانی (هـی ئێمـە نییـە) و(نایناسـین نـا)، دەنگـی کارەکتـەری بەرامبەر و وەڵامی پرسیارەکانی گێڕەرەوەی داوەتەوە، بەڵام لەبەرئەوەی شاعیر هیچ نیشـانە و کۆدێکی بۆ ناسینەوە و لە یەکتر جیاکردنەوەی لەگەڵ گێڕانەوەکـەدا دیـاری نـەکردووە، بۆیـە تێکەڵی بووە و جۆرێك لە تەمومژ و لێڵی دروست کردووە.

## مەنەلۆگ:

مەنەلۆگیش بە یەکێك لە تەکنیکەکانی گێڕانەوە دادەنرێت و ئامرازێکە لە ئامرازەکـانی بەردەستی شاعیر بۆ گێڕانەوەی ڕووداوەکان. ئەرکی مەنەلۆگیش هەروەکو دایـەلۆگ گەیانـدنی زانیارییەکانە، بەڵام مەنەلۆگ لەکاتێکدا چالاك دەبێـت و خـۆی لـەناو دەقـدا دەسـەپێنێت و شاعیر ناچار دەکات پەنای بۆ ببات، ئەو کاتەیە کە دایەلۆگ نەتوانێت ئەرکەکانی خۆی لـەناو دەقدا جێبەجێ بکات و زانیاریی و مەعریفەی پێویست بە خوێنەران بگەیـەنێت. لـەم کاتـەدا مەنەلۆگ وەکو تەکنیکێکی ئەلتەرناتیڤ دێتە بوون و لەدایك دەبێت، ((مەنەلۆگ لەو کاتـەدا لەدایك دەبێت، کـە دایـەلۆگ نـەتوانێت گوزارشـت لـە زمـان و بـاری دەروونـی ناخەپـەنگ خواردووەکەی کارەکتەر و نووسەرەکە بکات)) [1]. ئەمـەش ئـەوە دەگەیـەنێت کـە دایـەلۆگ کاتێك توانای بەردەوامیدان بەخۆی وەکو تەکنیکی گێڕانەوەنەما، ئەو کـات مەنـەلۆگ دێتـە بوون. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا مەرج نییە دەقێك تەنیا دایەلۆگ بێت، یاخود بەتـەنیا مەنـەلۆگ بێت، بگرە بارودۆخی ئەو شوێن و پارچـانەی کـە لـەناو دەقـدا هـەن، ئـەوان پێویسـتی ئـەو تەکنیکە دیاری دەکەن کە شاعیر بۆ گێڕانەوەی ڕووداوەکان پەنای بۆ دەبـات. بۆیـە لەوانەیـە دەقێك دایەلۆگی زیاتر لە مەنەلۆگ بەکارهێنابێت، بەپێچەوانەشەوە لەوانەیە دەقێکـی دیکـە مەنەلۆگی زیاتر لەیالۆگ بەکارهێنابێت. بەو واتایـەی پێویسـتی بـوونی ئـەو تەکنیکـە لـەو هەڵوێست و دیمەن و وێنەیەدا ،شاعیری ناچار بە بەکارهێنان دەکاتەوە.

مەنەلۆگیش بەهەمان شێوەی دایەلۆگ پێوەستە بە توخمەکانی گێڕانـەوە و یارمەتیـدەری ڕووداو و کارەکتەر و کات و شوێنە و جێ پەنجەی ئەوان زیاتر لەناو دەقدا قووڵ دەکاتەوە. بەڵام زیاتر سەروکاری لەگەڵ کارەکتەر هەیە، ئەمەش بۆ حوکمی کارکردنی سروشتی ئەو تەکنیکـە

---

١- پەروین عەبدوڵڵا، ڕەگەزەکانی دراما لە شیعری لیریکی کوردیدا، دەزگای چاپ و بەخشی سەردەم، سلێمانی ـ کوردستانی عێراق، ٢٠٠٨، ل٨١.

دەگەڕێتەوە، کە قووڵاییی ناخی کارەکتەر دەخاتەڕوو و هەوڵ دەدات ئەو هەست و سۆز و بیرو بۆچوونەی کارەکتەر کە لە ناخیدا پەنگی خواردۆتەوە ئاشکرای بکات و خوێنەریش بەشداری لەو شڵەژانییەی ناوەوەی کارەکتەر بکات. ئەم خاڵەش سیمای جیاکەرەوەیەتی لەگەڵ دایەلۆگدا. دایەلۆگ لایەنی دەرەوەی کارەکتەر لە هەڵسوکەوت و ڕەفتاو گوفتار باس دەکات و تیشکی دەخاتەسەر، واتە ئەو لایەنەی کە لەناو دەقدا خوێنەر بە ئاسانی دەیدۆزێتەوە و لەبەر چاویەتی و هەستی پێدەکات، بەڵام مەنەلۆگ کار لەسەر لایەنی ناوەوەی کارەکتەر دەکات، ئەو لایەنەی کە خوێنەر هەستی پێ ناکات و لێی ون و شاراوەیە و ئەگەر مەنەلۆگ نەبێت وەکو تەکنیکێك، ئەوا ناکرێت قووڵاییی ناخی کارەکتەر پیشانی خوێنەران بدرێت. یەکێکی دیکە لەو خاڵانەی کە زۆر گرینگن لە جیاکردنەوەی مەنەلۆگ لەگەڵ دایەلۆگدا ئەوەیە، کە لەدایەلۆگدا دەبێ دوو کارەکتەر یاخود زیاتر لەناو دەقدا بوونیان هەبێت و ئاراستەکانی ئاخافتن لەیەکدی وەربگرن و وەڵامی یەکدی بدەنەوە. واتە ((لەوێ هەمیشە دوو خود بوونیان هەیە (ئەمەش نزمترین ڕادەیەی سنووری دایەلۆگە)) [1] ئەمە واتای ئەوە دەگەیەنێت، کە مەرجی سەرەکیی دایەلۆگ، بوونی کارەکتەری بەرامبەرە کە قسەکردنی ئاراستە دەکرێت و بەهۆیەوە ڕەوتی ڕووداوە بەرەو پێشەوە دەچێت. واتە دایەلۆگ لەیەك کاتدا کۆکەرەوەی دوو بیروبۆچوون و دوو ڕەهەندی جیاوازە، ڕەنگە زیاتریش بێت بەپێی ژمارەی ئەو کارەکتەرانەی کە بەشداری لە گفتوگۆیەکەدا دەکەن. ئەمەش سیفەتێکی کۆمەڵی بەم تەکنیکە دەبەخشێت و هەمیشە هەست و نەستی کۆ بەسەریدا زاڵ دەبێت. بەپێچەوانەوە لە مەنەلۆگدا دەبێت تەنیا کارەکتەرێك بوونی هەبێت و قسەکردن ئاراستەی خودی خۆی بکات و هەر خۆشی وەڵامدەرەوەیان بێت. واتا تەنیا دەربڕی ئێش و ئازار و موعاناتی تاکە کەسێك بێت و ڕەهەندەکانی ئەو کەسایەتییە شی بکاتەوە. ئەمەش سیفەتێکی تاکایەتی بەسەر ئەو تەکنیکە سەپاندووە و هەست و نەستی تاك بەسەریدا زاڵ بووە.

مەنەلۆگ لە ڕێگەی وێناکردنی ناخی کارەکتەرەوە، تیشك دەخاتە سەر ڕەوتی ڕووداو و ئەو زانیارییانە لەبارەی ڕووداوەکە دەخاتەڕوو کە تەکنیکەکانی دیکەی وەکو دایەلۆگ و وەسف نەیانتوانیوە ئەو قووڵاییانە ئاشکرا بکەن. بۆیە مەنەلۆگ مامەڵەیەکی ڕاستەوخۆ لەگەڵ

---

١- تزفيتان تودورف، المبدأ الحواري، دراسة في فكر ميخائيل باختين، ت: فخري صالح، دار الشؤون الثقافية، الطبعة الأولي، بغداد ـ العراق، ١٩٩٢، ص٣٦.

کارەکتەر دەکات و لەویۆەشەوە کاریگەری خۆی بەسەر ڕووداو و کـات و شـوێن و توخمـەکانی دیکەوە بەجێ دەهێڵێت.

لەم ڕوانگەیەوە مەنەلۆگ لە ڕۆمانە شیعری (زێوان)دا یەکێکە لەو تەکنیکە پڕ بەهایانەی کە شاعیر بە فرەوانی بۆ گێڕانـەوەی ڕووداوەکـان بـەکاریهێناوە و بەتـەواوەتی سـێبەری ئـەو تەکنیکە لەسەر کەش و هەواری دەقەکەدا زاڵ و لەهەموو کوچەو کۆلانێکی دەقەکەدا هەسـت بە بوونی دەکرێت. دیارە ئەمەش بۆ سروشتی کارو بەرهەمەکەی خودی شاعیر دەگەڕێتەوە، کە لەرێگای ئەم ڕۆمانە شیعرەوە بەشێك لـە ژیـانی تایبـەتی خـۆی لـە قۆناخـەکانی منـداڵی و گـەنجێتیمان بـۆ دەگێڕێتـەوە. ئەمـەش پێوەسـتە بـە ئاشـکراکردنی گـەلێك لـەو ڕووداو و یادەوەرییانەی، کە تا ساتی نووسینی ئەم دەقە لەناو ناخی نووسەردا پـەنگی خواردبوویـەوە و بەتەنیا خۆی دەیزانی و لە خوێنەران ون و شاراوە بووە. بـەڵام بـەهۆی ئـەوەی کـە پـەنای بـۆ گێڕانەوەی ژیاننامەی خۆی بردووە و ئیدی بڕیاری شاعیر ئـەوەبووە کـە ئـەو ڕووداوانـە لـەناو ناخی خۆیدا دەربهێنێت و خوێنـەرانیش بەشـداری پـێ بکـات و ئاشـنای وردەکارییـەکانیان بکات. واتە لێرەدا ڕەوشی تایبەتی دەقەکە ئەوەی لەسەر شاعیر فەرز کردووە کە زۆرتر پەنا بۆ بەکارهێنانی ئەو تەکنیکە ببات، چونکە ڕاسـتەوخۆ پێوەسـتە بـە ناخـەوە و ڕووداوەکـان لـە قووڵایی دەروونەوە دەگوازنەوە سەر کەتوار و خوێنەرانی پێ ئاشنا دەکات. لەمبارەیەوە شاعیر لە پێشەکییەکەی چاپی دووەمیدا دان بەو ڕاستییانە دادەنێت و دەڵێت: ((ئەم دەقـە دەقێکـی مۆنۆ درامییە، سروشتێکی زەینی و گیانی هەیە، بەشێوازی مەنەلۆگی ناوەوە بەرهەم هاتووە، پێش ئەوەی لە لاپەرەی دەفتەردا نووسرابێت. لەناخمدا نووسرا بوو. بە پڕتاو هـاوارەوە دەهاتـە دەرەوە. وەك منداڵێك کە سـووری گەشـەی خـۆی تـەواو کردبێـت و بـە ئاسـایی و جەسـتەو گیانێکی تەواوەوە لەدایك بێت)) [1]. ئەم بارە پەنگخواردووەی نـاخی شـاعیر لەبەرهەمەکـەدا تێکەڵی ڕووداوی ئەو یادەوەرییانە بووە کـە شـاعیر بۆمـانی دەگێڕێتـەوەو لەگـەلێك شـوێنی دەقەکەدا ڕاستەوخۆ هەست بەو شڵەژانییەو پەنگخواردوەوەی ناخی شـاعیر دەکـەین لـەرێگای هەڵڕژتنی ناخی خۆی یان دواندن لەگەڵ ئەو ناخەدا:

**(( بیکرم یان نا**
**من و گوندی گەنجینەی منداڵیم**

---

١- سەباح ڕەنجدەر، زێوان، ل ٩-١٠.

**لەویَ دەچینەوە ناو یەك))   ( زێوان، ل ٥٢)**

**(( ئای نایگەمیَ**

**بۆ نایگەمیَ**

**لەبەرچی نایگەمیَ**

**ئەی ئەگەر بیگەمیَ چی ڕوودەدا))  (زێوان، ل ٥٩)**

دیان کۆپلەی دیکەی لەم جۆرە ناخی شڵەژاو پڕ لە هاوار و قیژەی شاعیرمان وەکو تابلۆیەك دێتە بەرچاو، کە لە دووتوێی ئەو تەکنیکەوە خراونەتە ڕوو. بە شێوەیەکی گشتیی تەواوی دێڕەکانی ئەم دەقە لەژێر زەبری سفت وسۆڵی مەنەلۆگدا نووسراونەتەوە و هەمیشە ناخی شاعیر لەگەڵدایە لەخوێندنەوەی ڕووداوەکان و بەسەرکردنەوەی شوێنەکان و بەڕێکردنی کاتەکاندا. بۆیە مەنەلۆگ لەم ڕۆمانە شیعرەدا باڵادەستەو تەواوی گۆڕەپانەکەی داگیرکردووە کە ئەمەش پێوەستە بە خودی ژیاننامە وەکو بوارێك لە بوارە پڕ بایەخەکانی ئەدەبدا و تێیدا شاعیران و نووسەران لەرێگای نووسینەوەی ژیانیاندا پەردە لەسەر ئەو ڕووداو هەست و نەستە نهێنییانە لادەدەن کە پێشتر زانراو نەبوون.

# ئەنجام

لەم لێکۆڵینەوەیەدا چەند ئەنجامێکمان بەدەستهێناون، کە دەکرێ لـەم خالآنـەی خـوارەوە کورتیان بکەینەوە:

١ـ ڕۆمانە شیعر وەکو چەمکێك، لە دوو ژانری سەرەکی پێکهـاتووە، ئـەوانیش (شـیعر و ڕۆمان)ن، کە هەردوو ژانرەکـەی لـە بۆتەیەکـدا کۆکردوونەوتـەوە سـوودی لـە ڕەگـەزەکانیان وەرگرتووەو ژانرێکی سـەربەخۆ و خـاوەن کەسـایەتیی و سـیما و ڕووخسـاری تایبـەتی خـۆی پێکهێناوە.

٢ـ لەرووی دەقەوە سـوودی لـە هونـەرەکانی شـیعری وەکـو ( زمـانی شـیعری، وێنـەی هونەری، ڕیتم و مۆسیقا، کێش و سەروا و...هتد) وەرگرتووە، بەهەمان شێوەش سـوودی لـە تـەکنیك و توخمـەکانی گێڕانـەوە لـە ڕۆمانـدا بینیـوە وەکو(ناونیشـان، دەسـتپێك، ڕووداو، کارەکتەر، کات، شوێن، دایەلۆگ، مەنەلۆگ و...هتد) بینیوە و تێکهەڵکێشی کردوون.

٣ـ سەرهەڵدانی ڕۆمانە شیعر وەکو ژانرێکی ئەدەبی بۆ سەدەی نۆزدەهەم دەگەڕێتەوە کـە لەم سەدەیەدا، سنوورەکانی نێوان بەشەکانی ئەدەب تێکشێندران و پشت لە پرەنسـیپی پـاکی جۆرەکان کرا و ئیدی هەموو بەشەکانی ئەدەبی سوودیان لە خەسڵەت و ڕەگـەزەکانی یەکـدیی وەرگرت بەتایبەتیش هەردوو بەشی سەرەکیی ئەدەب (شـیعر و پەخشـان)، لـە ئـەنجامی ئـەم لێکدانەش کۆمەڵێك ژانری نوێ هاتنەئارا و لەدایکبوون وەکو (پەخشانە شیعر، ڕۆمانە شیعر، چیرۆکە شیعر، مۆبایلە شیعر، پۆستەرە شیعر و...هتد).

٤ـ ژیار و شارستانی و کەلەپووری کوردی بـە بنچـینە و بناخەیـەکی پتـەو بـۆ ڕۆمانـە شیعری کوردی دادەنرێت و دەکرێت ڕەگ و ڕیشـاڵی ڕۆمانـە شـیعر لـە بیروبـاوەڕی ئـاینی و ئەفسانە و چالاکییە کۆمەڵایەتییەکان و ئابووری و ژیاری و دابونـەریت و یـاری کـوردەواری و گۆرانی کوردی لە لاوك و حەیران بەدی بکەین و هەوڵەکانی تێکەڵکردنی شیعر و پەخشان لەو کەلتووره دیار بکەین و بە بناخە و زەمینەسازییەك لە قەڵەمیان بـدەین بـۆ ڕۆمانـە شـیعری کوردی.

٥ـ لەگەڵ نوێکردنەوەی ئەدەبی کوردی، دەرازەو سـنووری ئـەدەبی کـوردی لـە بەرامبـەر ئەدەبەکانی دیکە، بە تایبەتیش ئەدەبی تورکی و عارەبی و ڕۆژئاوایی والآبوو، بەمەش گەلێك ژانری دیکەی وەکو (شانۆ، شیعری شانۆیی، چیرۆك، ڕۆمان، ئۆپـەرێت و...هتـد) هاتنـە نێـو ئەدەبی کوردییـەوە، لـەم سـەردەمەدا کۆمـەڵێك دەق دەبیـنین، کـە بەشـێك لـە تـەکنیك و توخمەکانی گێڕانەوەیان لەخۆدا گرتووەو درێژییەکی بەرچـاویان هەیـە لـە ڕووداودا، کـەدەکرێ وەکو ڕۆمانە شیعرێکی سادەو ساکار و سەرەتا لە ئەدەبی کوردیدا تەماشـایان بکـەین، وەکـو دوو گەشتە هاوینەکەی گۆران (گەشت لە هەورامان)(گەشت لە قەرەداغ)دا.

٦ـ کۆمەڵێك هۆکار بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ و ناڕاسـتەوخۆ کاریگـەرییان لەسـەرهەڵدانی هونەرییانەی ڕۆمانە شیعر لە ئەدەبی کوردیدا بینیـوە لەوانـە گەشـەکردنی هـزری نەتـەوەیی بـەهۆی بـەردەوامی شـۆڕش و ڕاپەڕینـەکان و  کاریگـەریی ئـەدەبیاتی عـارەبی و بێگانـە لەگواستنەوەی ئەزموونەکانـدا و ڕاپـەڕینی سەرتاسـەری کوردسـتان کـە دەروازەیـەکی والآی لەبەردەم ئەدەبی کوردیدا کردەوە و کارەسات و نەهامەتییانەی کەبەسەر میللەتی کورد داهات و بوونە کەرەستەو مادەیەك بۆکاری ئـەدەبی هەمـەجۆر و گەشـەکردن و پەرەسـەندنی ژانـری ڕۆمان  و گەشەکردنی بواری وەرگێـڕان و سـەفەر و گەشـتی شـاعیرو نووسـەران بـۆ دەرەوە و ئاشنابوونیان بە ئەزموونی ئەو وڵاتانەوە و چەندین هۆکاری دیکەش.

٧ـ یەکەم دەقی ڕۆمانە شیعر لە ئەدەبی کوردیدا، دەقی ڕۆمانە شـیعری (زێوان)ــە، کـە لەلایەن (سەباح ڕەنجدەر)ـەوە نووسراوە و بەیەکەم دەقیش دادەنرێـت کـە لەسـاڵی (١٩٨٨)دا بەشێوەی پەڕتووك چاپ و بڵاوکرابێتەوە.

٨ـ  ڕۆمانە شیعر لە ئەدەبی کوردیدا بەشێوەیەکی هونەری لەسەر دەستی (سەباح ڕەنجدەر) لە ئەدەبی کوردیی لە پێش ڕاپەڕین لـەدایك دەبێـت، بـەڵام ئـەم ژانـرە لـە دوای ڕاپەڕینـەوە گەشەسەندن و پەرەسەندنێکی بەردەوام بەخۆیەوە دەبینێت و لەلایەن شاعیرانی وەکـو (جـەمال شارباژێڕی، شێرکۆ بێکەس، مەهاباد قەردەاغی)یەوە چوار دەقی دیکەی ڕۆمانە شیعر چاپ و بڵاودەکرێنەوە.

٩ـ ڕووداو لە ڕۆمانە شیعری (زێوان)دا، بریتییە لە گێڕانەوەی ژیاننامەی خودی شـاعیر و بەسەرکردنەوەی یادەوەرییە تایبەتییەکانی شاعیر. لەمبارەیەوە هەردوو دەقی (زێوان)ی سەباح ڕەنجدەر و (خاچ و مار و ڕۆژمێری شاعیرێ)ی شێرکۆ بێکەس، لـە مێـژووی ڕۆمانـە شـیعری

کوردیدا، تایبەتن بە گێڕانەوەی ژیاننامە، بەڵام (سەباح ڕەنجدەر) تەنیا تیشکی خستووەتە سەر ژیاننامەی خۆی لە هەردوو قۆناخی منداڵی و گەنجێتییەوە، کەچی (شێرکۆ بێکەس)ی شاعیر زۆرینەی قۆناخەکانی تەمەنی خۆی باسکردووە.

١٠ـ لەبەرئەوەی ڕۆمانە شیعری (زێوان) تایبەت بە ژیاننامەی شاعیر، هەر بۆیە خودی شاعیر خۆی کارەکتەری سەرەکییە، بەتایبەتیش لە قۆناخی منداڵیدا، ئەگەر چی لە قۆناخی گەنجێتیدا کارەکتەرێکی دیکەی سەرەکیش بەشدار لە گێڕانەوەی ڕووداوەکان دەکات، کە ئەویش (نواڵە)یە.

١١ـ شوێن کە لەم ڕۆمانە شیعرەدا (گوندی دەربەندی گۆم و شاری هەولێر)ـە، کاریگەرییەکی زۆریان لەسەر خودی شاعیر وەکو کارەکتەرێکی سەرەکیی و ڕەوتی ڕووداوەکانەوە هەیە.بەتایبەتش گوند کە بەتەواوەتی شاعیر گیرۆدەی بووە و هەمیشە لەگەڵ بیرەوەرییەکانی گوندەکەیدا دەژیت.

١٢ـ کات وەکو توخمێکی گێڕانەوە لەناو دەقەکەدا دەستنیشان کراوە و بەئاشکرا پارچەو کۆدەکانی ئاماژەی بۆ کراوە و خراوەتەڕوو.

١٣ـ دایەلۆگ و مەنەلۆگ کە دوو تەکنیکی تایبەتن بەگێڕانەوە، لەلایەن شاعیر بایەخیان پێدراوە، بەڵام مەنەلۆگ بەشێوەیەکی زۆر پانتایی ئەو دەقەی گرتووە و هەست بە سێبەری تەواوی لەسەر ڕووداو و کارەکتەر و کات و شوێن دەکرێت، ئەمەش بۆ خودی سروشتی ڕووداوی دەقەکە دەگەڕێتەوە، کە برێتییە لە گێڕانەوەی ژیاننامەی شاعیر کە دیارە ناخ و دەروون و ڕووداوە تایبەتییەکانی ژیانی دەگرێتەوە و لەمەشدا بۆ گێڕانەوەیان زیاتر بشتی بە مەنەلۆگ بەستووە.

# سەرچاوەکان

**یەکەم: بەزمانی کوردی**

**أ- پەڕتووك:**

ئەحمەد سالار، هونەر و ژیان، چاپی یەکەم، دەزگەی چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی ـ کوردستانی عێراق، ٢٠٠٥.

ئازاد عەبدولواحید، دیوانی شێخ نووری شێخ ساڵح، بەرگی یەکەم، چاپی دووەمی بژارکراو، دەزگەی چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێرـ کوردستانی عێراق ٢٠٠٨.

ئازاد ئەحمەد مەحموود، شەش لێکۆڵینەوەی شیعری، دەزگەی چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر ٢٠٠٨.

ئارام سدیق، ناونیشان لە چیرۆکی کوردیدا، چاپخانەی کارۆ، سلێمانی ٢٠٠٩.

ئارام سدیق، ستاتیکای گێڕانەوە، چاپخانەی یاد، سلێمانی ٢٠٠٩.

باکنر ب. تراوپك، مێژووی ئەدەبیاتی جیهانی، و: حەمە کەریم عارف، چاپی یەکەم، چاپخانەی ڕۆژهەڵات — هەولێر، ٢٠٠٨.

پیتەر هاڵبێرك و دانەرانی تر، تیۆری ئەدەبی و شێوازناسی، ئامادەکردن و وەرگێڕانی: ئەنوەر قادر محەمەد، مەڵبەندی کوردۆلۆجی، سلێمانی ـ کوردستانی عێراق، ٢٠١٠.

پەروین عەبدوڵڵا، ڕەگەزەکانی دراما لەشیعری لیریکی کوردیدا، دەزگەی چاپ و بەخشی سەردەم، سلێمانی ـ کوردستانی عێراق، ٢٠٠٨.

جەمیل سنجاوی، حەیران و چەند بۆچوونێکی تر، چاپخانەی منارە، هەولێر ٢٠١٠.

جەمال شاربازێڕی، ژوانگەی هەژان و ژان، چاپی دووەم، چاپخانەی ڕەنج، سلێمانی ١٩٩٨.

حەننا عەبود، لەبارەی مێژووی ڕۆمانەوە، و: عەبدوڵڵا ڕەحمان، چاپخانەی منارە، هەولێر،٢٠١٠.

حەمە مەنتك، سوریالیزم لە ئەدەبی نوێی کوردیدا،دەزگەی چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر ٢٠١١، ل ١٠٥.

د. حوسێن وەحیدی، سروود و گاتاکانی زەردەشت، و: وریا قانیع، دەزگەی وەرگێڕان، هەولێر ـ کوردستانی عێراق ٢٠٠٦.

د. حوسێن غازی کاك ئەمین گەلاڵەیی، ڕەوتی نوێکردنەوەی شیعری کوردی لە باشووری کوردستان، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر ۲۰۱۰.

ڕازاو ڕەشید سەبری، چیرۆکی منداڵان لە ئەدەبی کوردیدا(۱۹۹۱ ـ ۲۰۰۵)، بڵاوکراوەی ئەکادیمیای کوردی، هەولێر ـ کوردستانی عێراق، ۲۰۱۰.

زاهیر ڕۆژبەیانی، شیعرییەت لە دەرەوەی شیعر، دەزگەی چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر ـ کوردستانی عێراق ۲۰۰۸.

زاهیر ڕۆژبەیانی، کاروباری گێڕانەوە، دەزگەی چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس،هەولێر ـ کوردستانی عێرا، ۲۰۱۱.

زۆزان سادق تروانشی، چیرۆکە شیعرا کوردی، دەزگەها سپیرێز یا چاپ و وەشانێ، دهۆك ـ کوردستانی عێراق ۲۰۰۸.

س. م. پیێترۆڤ، ئەلێکساندەر سێرگێییێفیچ پۆشکین ((ژیان نو بەرهەمی شاکاری))، وەرگێڕانی: محەمەدی مەلا کەریم، چاپخانەی (الحوادث)، بەغدا ۱۹۸۳.

سەڵاح حەسەن پاڵەوان، شیعری کراوە ـ لە ئەزموونی شیعری نوێی کوردیدا،دەزگەی چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر ـ هەرێمی کوردستانی عێراق، ۲۰۱۰.

سابیر ڕەشید، چیرۆکی کوردی، ڕەخنە و لێکۆڵینەوە، چاپخانەی ڕۆشنبیری، هەولێر ۲۰۰۷.

سەباح ڕەنجدەر، زێوان، چاپی دووەم، چاپخانەی یاد، سلێمانی ۲۰۰۹.

سەباح ڕەنجدەر، دوو پەڕتووك لەبارەی شیعرەوە، دەزگەی توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی، هەولێر ۲۰۱۱.

سەنگەر قادر شێخ محەمەد حاجی، بنیاتی گێڕانەوە لەداستانی (مەم وزین)ی ئەحمەدی خانی و ڕۆمانی (شاری مۆسیقارە سپییەکان)ی بەختیار عەلیدا، دەزگەی توێژینەوەو بڵاوکردنەوەی موکریانی، هەولێر ۲۰۰۹.

شەرمین ئیبراهیم عەزیز، پەشێو و تازەکردنەوە لە شیعری کوردیدا، چاپخانەی ڕۆشنبیری، هەولێر ـ کوردستانی عێراق، ۲۰۰٦.

د. شوکریە ڕەسووڵ ئیبراهیم، ئەدەبی فۆلکلوری کوردی، بەشی دووەم، چاپخانەی زانکۆی سەلاحەدین، ۱۹۸٤.

د. شكری عزيز الماضي، تيۆری ئەدەب، و: پ.ی.د.سەردار ئەحمەد گەردی، چاپخانەی ماردین، هەولێر، ٢٠١٠.

شێرزاد هەینی، ٩٥٥ دەقیقە لەگەڵ شێرکۆ بێکەسدا، چاپخانەی تیشك، کوردستان ٢٠٠٨.

شێرکۆ بێکەس، خاچ و مارو ڕۆژمێری شاعیرێ، ڕۆمانە شیعر، چاپی دووەم، چاپەمەنی خاك، سلێمانی ١٩٩٨.

شێرکۆ بێکەس، گۆڕستانی چراکان، ڕۆمانە شیعر، دەزگەی چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی ٢٠٠٤.

عەبدوڵڵا سەڕاج، بەرەو ئاستانەی ڕۆمان و گۆشەنیگاکان، لەبلاوکراوەکانی دەزگەی چاپ و بەخشی سەردەم،٢٠٠٧.

عەبدولموتەلیب عەبدوڵڵا، شوێنکاتی یەکەم لە دووەم و ئێستەی سەگوەڕ، چاپخانەی ڕەنج، هەولێر ٢٠٠٤.

عەبدولڕزاق بیمار، پەخشانی کوردی، دار الحریه للگباعه، بەغدا ١٩٩٨.

د. عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ، لێکۆڵینەوەی ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی، چاپی دووەم چاپخانەی زانکۆی سلێمانی ١٩٧٩.

د. عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ، ئەدەبیاتی نوێی کوردی، چاپخانەی خوێندنی باڵا، هەولێر ١٩٩٠.

عەبدوڵڵا گۆران، دیوانی گۆران، چاپی دووەم، نشر پانید، تاران ١٣٨٥.

غەفوور مەخمووری، هەگبەی مەخمووری (کۆبەرهەم)، بەرگی یەکەم، چاپخانەی منارە، هەولێر ـ ٢٠١٠.

د. فازیل مەجید مەحموود، سروشت لە شیعری گۆراندا، دەزگەی چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، کوردستانی عێراق ٢٠٠٧.

د. فەرهاد پیربال، عەبدولڕەحیم ڕەحمی هەکاری ـ تازەکردنەوەی شیعری کوردی و داهێنانی شانۆنامە لە ئەدەبیاتی کوردیدا، دەزگەها سپیرێز یا چاپ و وەشانێ، دهۆك ـ کوردستانی عێراق، ٢٠٠٢.

د. فوئاد ڕەشید، دەقی ئەدەبی ئەدگار. چێژ. بەها، چاپی یەکەم، چاپخانەی دەزگەی ئاراس، هەولێر ٢٠٠٧.

کەمال غەمبار، بەرەو جیهانی شیعری چەند شاعیرێك، دەزگەی چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر ـ کوردستانی عێرا، ٢٠٠٨.

کامەران موکری (محەمەد ئەحمەد تەها)، ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی، بەشی یەکەم،چاپخانەی زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر ١٩٨٤.

د.موحسین ئەحمەد عومەر، فەرهەنگی زاراوەی ئەدەبی، بەرگی یەکەم، دەزگەی چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر ٢٠٠٥.

د. مارف خەزنەدار، لەبابەت مێژووی ئەدەبی کوردی یەوە، ضاشخانةى (المؤسسة العراقية للدعاية والطباعة))، بةغدا ١٩٨٤.

د.مارف خەزنەدار، مێژووی ئەدەبی کوردی، بەرگی دووەم، دەزگەی چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر ٢٠٠٢.

مەهاباد قەرەداغی، ساڵێك لە دۆزەخ، دەزگەی چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر ـ کوردستانی عێراق، ٢٠٠٥.

مەهاباد قەرەداغی، ئەڤین ئاوی ژیانە، ڕۆمانی شیعری، بەبێ شوێن و ساڵی چاپ.

موحسن عارف ساڵح، چیرۆکا زارۆکان لە دەڤەرا بەهدینان ( ١٩٨٠ـ ٢٠٠٤)، دەزگەی سپیرێز بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە، دهۆك ـ کوردستانی عێراق، ٢٠٠٧.

مەجید مەحموود، شیعر و فەلسەفە، و: فوئاد مەجید میسری، دەزگەی چاپ و پەخشی حەمدی، چاپی دووەم، ٢٠٠٨.

پ.ی. د.نەجم خالید ئەلوەنی، کارەکتەرسازی لەرۆمانی ئێوارەی پەروانەی بەختیار عەلیدا، دەزگەی موزیك و کەلەپووری کوردی، هەولێر ـ کوردستانی عێراق، ٢٠٠٩.

نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد، ئەزموونی خوێندنەوە ـ چەند لاپەڕەیەکی ڕەخنەیی، دەزگەی چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی ٢٠٠٦.

هێمن عومەر خۆشناو، شیعرییەتی دەقی چیرۆکی کوردی، چاپخانەی ڕۆشنبیری، هەولێر ٢٠١٠.

پ.ی. د. هیمداد حوسێن، ئەدەبیاتی فۆلکلۆری کوردیی، چاپخانەی شەهید ئازاد هەورامی، کەرکوك ـ٢٠٠٧.

یاسین قادر بەرزنجی، هونەری دراما، چاپخانەی کەمال، سلێمانی ـ کوردستانی عێراق، ٢٠٠٩.

### ب ـ گۆڤار:

د. پەرێز سابر، تەوەرەکانی ڕەمزی شیعری لە ڕەخنەی ئەدەبی کوردیدا، گۆڤاری(زانکۆ)ی سەلاحەددین، ژمارە(٢٥)، حوەزیرانی ٢٠٠٥.

خالید جووتیار، کورتە سەرەتایەکی حەیران، گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)، ژ (٦٣)، ئەیلول و تشرینی یەکەمی ١٩٧٧.

تارق جامباز، سەرەتای خوڵقان لەدەقەکانی کوردیدا، گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (٦٩)، ساڵی حەوتەم، تشرینی یەکەم و دووەمی ١٩٨٨.

شوکر سلێمان حەمەد، پاڵەوان لە ڕۆمانی ئێستەی کوردیدا، گۆڤاری کاروان، ژمارە (١٧٢) نیسانی ٢٠٠٣.

د. عادل گەرمیانی،چەند وانەیەکی بەراوردی ئەدەبی، گۆڤاری ( ڕامان)، ژمارە (١٧١) ئابی ٢٠١١

.عەلی لفتە سەعید، بنەماکانی پێکهاتەی ڕۆمان لەنێوان تازەگەری و لاساییکردنەوەدا، و: محەمەد کەساس، گۆڤاری ڕامان، خولی دووەم، ساڵی دووەم، ژمارە (٩٩) ئابی ٢٠٠٥.

عەبدوڵڵا ڕەحمان، تەکنیك لەرۆمانی دوانامەی دێوەرەیەك (٢-٢)، گۆڤاری (رامان)، ژمارە(١٤٧)،، خولی سێیەم، ساڵی چواردە، ئابی ٢٠٠٩.

محەمەد ئەحمەد حەسەن(حەمە مەنتك)، بینای ڕووداو لە چیرۆکدا، گۆڤاری ڕامان، خولی سێیەم، ساڵی یازدە، ژمارە ١١٠ کانوونی یەکەمی ٢٠٠٦.

د. نەجم خالید نەجمەدین، تەکنیکی دایەلۆگ لەهەندێ نموونەی هاوچەرخی کورتە چیرۆکی کوردیدا، گۆڤاری(زانکۆ)، ژمارە(٢٤)، نیسانی ٢٠٠٥.

### د ـ نامەی ئەکادیمی:

ئەردەلان شوکر سابیر، تەکنیکی گێڕانەوە لە ڕۆمانە شیعرەکانی (شێرکۆ بێکەس)دا، نامەی ماستەر، زانکۆی سەلاحەدین، کۆلێژی زمان، بەشی زمانی کوردی، هەولێر ٢٠٠٩.

سەرکەوت سەعدی قادر، نامۆیی لەرۆمانەکانی (سەلاّح عومەر) دا، نامەی ماستەر، کۆلێژی پەروەوردە ـ بەشە مرۆڤایەتییەکان، زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر ٢٠١٠.

عەبدولواحید ئیدریس شەریف، سروود و گۆرانی نیشتمانی و بەرەنگاری کوردی لە کرمانجی خواروودا (١٩٣٥-١٩٩١)، نامەی ماستەر، کۆلێجی زمان ـ زانکۆی کۆیە، ٢٠٠٨.

کارزان موحسین قادر، سیما تازەکانی ڕۆمانی کوردی لەنێوان ساڵانی (١٩٩١-٢٠٠٠)، نامەی ماستەر، کۆلێژی زمان ـ زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر ٢٠٠٩.

**دووەم: بەزمانی عەرەبی:**

**أـ پەڕتووك**

احمد عبد المعطى حجازى، القصيدة النثر أو القصيدة الخرساء، الطبعة الأولي، الأمارات ـ دبي،٢٠٠٨.

تودروف كنت واخرون، القصة الرواية المؤلف ـ دراسة في نظرية الانواع الأدبية المماصرة، ترجمة: د.خيرى دومة، دار الشرقيات للنشر و التوزيع، مصر ـ القاهرة، ١٩٩٧.

تزفيتان تودورف، المبدأ الحواري، دراسة في فكر ميخائيل باختين، ت: فخرى صالح، دار الشؤون الثقافية، الطبعة الأولي، بغداد ـ العراق، ١٩٩٢.

جبور عبدالنور، المعجم الأدبى، دار العلم للملايين، بيروت ـ لبنان، ٢٠٠٥.

ج. كوللر، ما النظرية الأدبية، ترجمة: هدى الكيلانى، اتحاد الكتاب العرب، سوريا ـ دمشق، ٢٠٠٩.

رينية ويليك و اوستن وارين، نظرية الأدب، ترجمة: محيي الدين صبحي، المؤسسة العربية للدراسات والنشر، لبنان ـ بيروت، ١٩٨٧.

د. صلاح الفضل، أساليب السرد في الرواية العربية، مركز الأنماء الحضارى، سوريا ـ دمشق، ٢٠٠٩.

د. عبدالمنعم تليمة، مقدمة في نظرية الأدب، دار الثقافة للطباعة والنشر، قاهيرة،١٩٧٦.

د. على الزبيدى، الشعر و المسرح، الشعر و الفنون ـ مختارات من الأبحاث المقدمة لمهرجان المربد الثالث ١٩٧٤، بغداد ـ العراق.

فيليب لوجون، السيرة الذاتية ـ ميثاف و التاريخ الأدبي، ترجمة: عمر حلي، المركز الثقافي العربي، بيروت ـ لبنان، ١٩٩٤.

مارى شيفير، ما الجنس الأدبى، ترجمة: د. غسان السيد، اتحاد الكتاب العرب، سوريا ـ دمشق، ١٩٩٧.

د. محمد مندور، الأدب و فنونة، الطبعة السابعة، شركة نهضة مصر للطباعة والنشر والتوزيع، قاهرة ـ مصر،٢٠٠٩.

محمد علي كندي، الرمز و القناع في الشعر العربي الحديث، دار الكتاب الجديد المتحدة، بيروت ـ لبنان ٢٠٠٣.

د.يوسف وغليسى، أشكالية المصطلح، دار العربية اللعلوم ناشرون، بيروت ـ لبنان، ٢٠٠٨.

**ب ـ گۆڤار:**

د.معـــروف خزنـــدار، الروايـــه الشـــعريه (ليلـــى ومجنـــون) فى الأدب الكـــردى، مجلـــه كليـــه الآداب ( بغداد)، مج ١٨، ع ٢٠.

**ج ـ نامەی ئەکادیمی:**

محمد عبدالحليم غنيم، الفن القصصى عنـد فـاروق خورشـيد، رِسـالة دكتـوراة، جامعـة المنصـورة ـ كليـة الأداب، قسم اللغة العربية، مصر ٢٠٠١.

**سێیەم: بە زمانی ئینگلیزی:**

The penguin dictionary of Literary Terms And Literary Theory،J.A.CUDDON ،p966 .

Verse novel: From wikipedia. The free encyclopedia. www. En. Wikipedia.org.

**چوارەم: لە ئینتەرنێتەوە:**

ابراهيم اليوسف، الجنس الأدبى الثالث، www.Ar.soparo.com

د. أبراهيم استنبولي، نيقولاى فاسيلييفيتش طوطول في القدس، www.arabic. rt.com

احمد اللهيب، الرواية السعودية ادب الأميين ـ الرواية السعودية وفخ الأعلام، .www.alsakher.com

ايمن اللبدى، حتى لايكون ((قصيدة النشر العربية)) مسألة وقت!، .www.allabadi.com

أ.د. بشر ى البستانى، الرواية الشعرية و اشكالية التجنيس، .www.alnked-aliraqi.net

خالد سليمان، عندما تشترط الماساة على اللغة عنفا لكل زمان ـ (مقبرة الفوانيس) للشاعر الكوردى شيركو بيكەس، www.gilgamish.org

د. جميل حمداوي، إشكالـــية الجـنس الأدبـــي، www.dahsha.com

د.جميل حمداوي، قصيدة النثر أو شعر الانكسار، www.ofouq.com

ريم العيساوى، الشعرية في رِواية كريم معتوق ( حدث في اسطنبول)، www.asdaqa.com

ريم العيساوى، مفهوم الشعرية في النص الروائي، www.alexandrie.yoo7.com

سالم سيف الجابر، امير شعراء ورسيا: الكسندر بوشكين، www.alsakher.com .

العربى بنجلون، اشكالية التجنيس الروائي عند باختين، www. Alrewaia.com.

د. عبداللة الفيفي، تداخل الأجناس في بلاغيات النص المعاصر، www.faifi.ws.com

محمد علي يوسفى، السرد يتكلم شعرا، www.nizwe.com

محمد معتصم، الرواية الشعرية، www.alnked-aliraqi.net.

د. مصطفى الضبع، تداخل العالم / تداخل النصوص، www. Alrewaia.com

د. محمود الضبع، تشكلات الشعرية الروائية، www.alrewaia.com

محمد جابر، نصوص بشار عبداللة قراءة تأويلية في نسق الرواية الشعرية، www.pulpit.alwatanvoice.com

د. ماجد حيدر، العالم في عين امرأة ـ اليزابيث باريت براواننغ، www.jozoor.net

مايكل رِوبرت، كبار الروايات الشعرية، www.guardian.co.ukreddit

مروان علي، القومى جان دوست: الرواية الكردية متعثرة بـ((حجر الأيديولوجيا والهم، مقابلة، www.welateme.net.

مقابله مع دكتوره كوپر جابر، www.alarab.com